لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی
ناونیشان: هەولێر ـ فولکەی زەراعە ـ نێو پارکی وەفایی
https://www.facebook.com/mall.wafai
٠٧٥٠٤٨٣٦٦٤٧

---

بەدر شاکر سەیاب

# بەڵێ من شیوعی بووم

فەیسەڵ خەلیل

کردوویە بە کوردی

لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی
ناونیشان: هەولێر - فولکەی زەراعە - نێو پارکی وەفایی
https://www.facebook.com/mali.wafai
٠٧٥٠٤٨٣٦٦٤٧

ناوی کتێب: بەڵێ من شیوعی بووم
نووسەر: بەدر شاکر سەیاب
وەرگێڕ: فەیسەڵ خەلیل
سەرپەرشتیاری چاپ: سۆران عەزیز
نەخشەسازیی ناوەوە و بەرگ: زاری
بابەت: کۆمەڵەوتار
پیتچنین: وەرگێڕ
چاپ: دووەم/ ٢٠٢١
تیراژ: ١٠٠٠ دانە .
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی پەرتووکخانەگشتییەکان ژمارە (٢٢٧)ـی ساڵی ٢٠١٨ـی دراوەتێ.

بەدر شاكر سەیاب

# بەڵێ من شیوعی بووم

## کتێبی ڕەشی شیوعییەت

فەیسەڵ خەلیل
کردوویە بە کوردی

کۆمەڵەوتار
٢٠٢١

## پێڕست

زنجیـرەی وتـارێکە شـاعیری عێراقـی بەدر شـاکر سـەیاب لە رۆژنـامەی حـوڕیەی عێراقـی لە١٩٥٩ نووسـیویەتی و بـاس لەئەزمونی خۆی دەکات لەگەڵ حزبی شیوعی عێراقی.

نووسینەکانی هاوڕێ رائید کە ئابڕووی شوعییەت و شیوعییەکانی بردووە، بۆ ئەو نووسینە هانی نەداوم، بەڵکو ئەو بیرۆکەیە ماوەیەکی زۆرە لەگەڵمدایە، کە دەمەوێت لەبارەی ئەزموونی خۆم لەگەڵ شیوعییەکان بنووسم، چۆن بیروڕای شیوعییەتم هەڵگرت؟ چیم لێ بینی و چیم تێدا بینی؟ دواتر چی وایلێکردم ببمە دوژمنێکی سەرسەختی شوعییەت؟

ئەوەتا من ئەو خەونەم بەدیدەهێنم. دەروونی من لەهەستە مرۆڤایەتییەکاندا کەفو کولی دەدا، خەڵکم خۆشدەویست، هەوڵم دەدا بەدوای هەق و چاکە و دادپەروەری بم، ئەوەی لەڕووداوی منداڵی بیرم بکەوێتەوە ئەوەیە کە سەگێک هەبوو، توتکەی هەبوو، ئەو سەگە ئازاری هەموو ئەو کەسانەی دەدا کە بەلای تێپەڕدەبوو، رۆژێک سلێمان تەقەی لەو سەگە کرد، توتکەکانی بەدوای ئەوە دەحەپین، ئەوانی گریاند، منیش زیاتر لەتووتکە سەگەکان گریام.

لەخێزانێکدا گەورەم بووم، کە بێستانی دارخورمایان هەبوو، جوتیارەکان کاریان تێدا دەکردو دواتریش لەبەروبوومەکەیدا هەقی خۆیان وەردەگرت، لەگەڵ ئەوەی کەسوکاری من لەخاڵکانی دیکە باشتر بوون و سادەتر و دیموکراتیانەتر بوون، کەچی زۆر ستەمم لێیان دەبینی، کە دەرهەق بەجووتیارەکان ئەنجامیان دەدا، لەوانە زەنوبەم بیردەکەوێتەوە، کە هاوسەری جووتیارێک بوو، لەماڵەکەی

ئێمە کارەکەری دەکرد، بەوە رازی بوو دوای رۆژێک لەکاری سەخت، قاپێک برنج وەربگرێت، لەکاتی رۆژانی جەژنیشدا چەند دەقێک جلی کۆنەی بۆ خۆی و منداڵەکانی وەردەگرت، لەژوورێکی ماڵەکەماندا تورەکەی برنج و ئارد و شەکر و چا دادەنرا، زەنوبە کاتێک دەزانێ کە منداڵەکانی برسیانە، جورئەت دەکات و چەنگێک برنج دەدزێت و لەجلەکانی دەشارێتەوە، کەسوکارم هەستی پێدەکەن و ئەو برنجە دەبینن، کە زەنوبە ئامادەی کردووە بۆ ئەوەی لەکاتی رۆیشتندا بیبات. کەسوکارم چی دەکەن؟

چەنگە برنجەکەیان لەناو دەفرێک دانابوو، لەیەکێک لەژوورەکانی ماڵیان جێهێشتبوون، دوای ئەمە داوایان لەزەنوبە کرد، ئەو ژوورە گەسک بدات، زەنوبە برنجەکەی دەبینی و دەشیزانی ئەگەر هاتوو برنجەکە بدزێت کارەکەی ئاشکرا دەبێت، من ئێستاشم لەبیرە، کە ئەو ژنە گەسکی دەدا و دەگریا، هەستی بەشەرمەزاری و نەنگی و ترس و داخ دەکردن، ئەو دیمەنەو چەندین دیمەنی دیکەیش لەمنداڵیمدا کاریگەریان بەسەر دەروونمەوە هەبوو، بۆیە بەشێوەیەک گەورەبووک کە رقم لەستەمە و خەڵکانم خۆشدەوێ، شیوعیەت هات و بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد: کار بۆ هەمووان، دادپەروەری و یەکسانی لەنێوان مرۆڤدا.

کێ ئەمەی ناوێ: کار بۆ هەموومان، خۆراک بۆ هەمووان، لەگەڵ دادپەروەری و یەکسانی؟

لەسەرەتادا هەرئەوەندەمان لەبارەی شیوعییەتەوە دەزانی. سەرەڕای ئەوەی لەمنداڵیمدا چەند لایەنێکم لەمەدا بینی بوو، لەساڵی ١٩٣٠ پێشتر یان کەمێک دواتر بوو، بەگوێرەی ئەوەم بەبیرم دێ، حزبێکمان هەبوو ناوی لەخۆنابوو حزبی نائاییینی، مامی گەورەم یەکێک بوو لەسەرکردەکانی ئەو حزبەو یەکێک بوو لەدامەزرێنەرانی ئەو حزبە،

خۆی و هاوڕێیانی لەژووری مێوانەکانی ماڵەوەمان کۆبوونەوەیان دەکرد، هەر لەو ماڵەشدا باپیرم و منداڵ و نەوەکانی و تەواوی خێزانەکەی دەژیان، بەڕوونی بیرم دێ چەندین وێنە بەدوورەکانی ئەو ژوورە هەڵواسرابوو، لەوانە وێنە ڕێبەری نیشتمانی ئەبوتمن و وێنەی سەعەد زەغلول و مستەفا کەمال ئەتاتورک بوو.

ئەوانەی لەو ژوورەدا هاموشۆی مامیان دەکردن خالم زوەید و هاوڕێ فەهد (یوسف سەلمان یوسف) چەندانی دیکە بوون کە من نەمدەناسین، حزبی نائایینی بڕوای وابوو کە ئاینیەکان هۆکاری نەهامەتین مرۆڤایەتی و دواکەوتنیەتی، بۆیە بڕوایان وابوو بێباوەڕی (ئیلحاد) ڕێگایەکە بۆ ڕزگاربوون و خۆشگوزەرانی ئەو کاتە لەلوبنان گۆڤارێک هەبوو بەناوی (الشمس) کە ئیلحاد بڵاوکردەوەو دژایەتی ئایین و نەتەوەخوازی عەرەبی دەکرد، خاوەنەکەی ئەسبر الغریب بوو، هاتە عێراق لەماڵەکەمان سەردانی مامی کرد، بەکامێراکەشی چەندین وێنەی گرتین، دروشمی ئەو گۆڤارە لەبەرگەکەی کێشرابوو (نەهامەتی ڕۆژهەڵات، ئایننەکانیەتی) نووسەرانی حزبی نائایینی بابەتەکانیان لەو گۆڤارە بڵاوکردەوە، هەر ئەوانیش نوێنەری ئەو گۆڤارەبوون لەعێراق و کەنداو، یەکێک لەئەندامانی ئەو حزبە، جووتیارێک بوو کە کەسێکی نزیکمان بوو ناوی عەبدولەتیف ناصر بوو، ئەو بەمانای وشە هیچ وپووچ بوو، بەمانای وشە زۆر دەبەنگ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا بانگەشەی بۆ زانست و زانیاری دەکرد، داوای لەکەسانی دیکە دەکرد، کە بەناوی "لەتیفینوف" بانگی بکەن، نەوەک عەبدوللەتیف، ئەو عەبدوللەتیف ناصرە، ئەمڕۆ موعتەمەدی حزبی شیوعی عێراقییە لەئەبو خەسیب لەبەسرا، بەڕاستی موعتەمیدێکی چاکە! قسەی لەسەر دەکەم با نۆرەی بێت.

هەروەها بەبیرم دێ هاوڕێیانی نائایینی یەکێتی سۆڤیەتییان خۆشدەویست، گوایە دەوڵەتێکی نائایینین و ستالینشیان

خۆشدەویست، وێنەکەی ستالینم بیرناچێت کە کاتێک پۆلیس بەسەر مۆڵگەی ئەوانی دادا کەوتە دەست جوتیارێک، ساڵانێک دواتر ئەو وێنەیە کەوتە دەستم، شوشەکەم شکاند و بەپێلاو وردوخاشم کرد، وێنەکەشم دڕاند، ئاساییە ئەو ڕووداوانە لەدوای یەکتر بیرم دێتەوە، کە زەمەنی منداڵیمی پێدا تێپەڕیوە.

کۆبوونەوەی هاوڕێیان خاڵی نەبوو لەپێک هەڵدان، بەلقیسیش دانیشتنەکانی ئەوانی دەڕازاندەوە، ئەو ئافرەتێکی جوان و گەنج بوو، باوکی لەلای باپیرەم کاری دەکردو جووتیار بوو، بەلقیس بەشێوەیەکی ناوازە چێژی بەهاوڕێیان دەدا، لەوە دەترسا نەوەک سکی پڕبێت، بێگومان هاوڕێ فەهد بەشی لەچێژوەرگرتن هەبوو لەو جەستە گۆشتنەدا.

ئەوە یەکەم جارم بوو کە لەگەڵ شوعییەت بەریەکەوتین، کاتێک بووم بەپیاو سۆز و ئارەزووم پێگەیشت، چاکە و دادپەروەریم خۆشدەویست بۆ مرۆڤە چاکەکان، سۆزم بۆ هەژار و بەدبەختەکان هەبوو، دۆستی جوتیارەکان بووم، ئەو کاتە ڕووسیا بۆ هەموو جیهان دەرکەوت، لەسەروبەندی جەنگی دووەمی جیهان، کاتێک هاوپەیمانی لەگەڵ هیتلەر کرد، عێراقییەکان هیتلەریان خۆشدەویست، ئەوان نازی نەبوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی بوو ئەوان ڕقیان لەداگیرکەران بوو، بۆیە وامان لێهات پرۆپاگەندە بۆ ڕوسیا و شوعییەت بڵاوبکەینەوە، لەتەک ئەمەشدا پروپاگەندە بۆ نازییەت دەکرا، پێمان وابوو وڵاتانی میحوەر بەسەر هاوپەیمانان سەردەکەوێت و ڕوسیاش لەگەڵ ئەودا سەردەکەوێت، بۆیە شوعییەت لەعێراق بڵاودەبێتەوە، موژدە بۆ هەژاران، موژدە بۆ جووتیارە برسییەکان.

هەرکاتێک گوێیان لەوەبووایە، کە ئێمە بانگەشە بۆ شیوعیەت دەکەین پرسیاریان دەکرد و دەیانگوت: بەڵام مامە دەگوترێت روسەکان ئایینیان نییە، موحەرراماتیان نییە، حەلالە بۆ شیوعی لەگەڵ دایک و خوشکی بخەوێت؟ ئێمەش وەڵامی ئەوەمان دەدایەوە، بەوەی کە ئەو قسانە درۆ و دەلەسەی ژەهراوییین و داگیرکەران بڵاوی دەکەنەوە.

مامە بچووکەکەم برادەرێکی هەبوو کە زۆرجار لەگوند سەردانی ئەو مامەی دەکردم، بەرەچەلەک ئێرانی بوو، ئەو حەزی لەئەدەبی جوبران خەلیل جوبران و مەی زیادە بوو، قسەی لەبارەی دیموکراتی و شوعیەت و دەوڵەتی زەحمەتکێشان دەکردن، قسەکانی نەرم بوون لەشێوەی: خەڵک لەیەکێتی سۆڤیەت کامەرانن و یەکسانن، زانست و رۆشنبیری و هونەر تێیدا پێشکەوتووە، ئەخلاقیان بەرزە. ئا لەمجۆرە قسانە، قسەی ئەحمەد عەلوان بوو کە دواتر لەزیندانی کوت کوژرا، هەموو ئەو قسانەمان وەردەگرت، کە دەیگوت، رۆژێکیان لەئەحمەد گوێبیستی ئەوەبین کە حزبی شیوعی عێراقی هەیە بەنهێنی کاردەکات و قسەی لەبارەی رێبەرە مەزنەکەی کرد کە فەهد بوو، کە ئەو نایناسی و ناشزانێ ناوی چییە.

رۆژێکی هەینی بوو، بانگی ماڵەکەی خۆی کردین و فۆرمی ئینتمابوونی حزبی شوعی پێداین و فۆرمێک بۆ عەبدولمەجیدی مامم، یەکێکی دیکە بۆ عەبدولدایم ناصر و دانەیەکیش بۆ من، ناوی خوازراومان دانا و فۆرمەکانمان پڕکردەوەو دامانەوە ئەحمەد.

ئیتر من تەبنها شیوعی نەبووم، بەڵکو بوومە ئەندامی حزبی شیوعی عێراقی.

ئەلقەی رابردوو ئێمەی گەیاندە ئەو رۆژەی کە تێیدا بووم بەئەندامی حزبی شیوعی عێراقی، لەگەڵ خۆمدا قسەم لەسەر ئەوە دەکرد، کە ئەمڕۆ ئەوە بگێڕمەوە، کە چۆن ئەو حزبەم بەجێهێشت و لەبەرچی بەجێمهێشت و بۆچی بوومە دوژمنی، بۆ ئەوەی بتوانرێت لەلای خوێنەر وێنەیەکی روون دروست بێت لەسەر ئەو هۆکارانەی کە پاڵی نام ببمە شیوعی و لەسەر ئەو هۆکارانەش کە وایکرد لەشیوعی بکشێمەوە.

لەبەیانی رۆژێکی تشرینیدا لەساڵی ۱۹۵۲ خۆپیشاندانێکی جەماوەری ئەنجام درا، لەئەنجامدا بنکەی پۆلیسی باب الشیخ سوتێنرا و چەند کەسێکیش کوژرا، من رۆڵێکی دیارم لەو خۆپیشاندانانە هەبوو، کاتێک بڕیاری دەستگیرکردنم بۆ دەرچوو، بۆم دەرکەوت کە سەلامەتترین رێگا، هەلاتنە. هەروابوو، خۆم لەجلێکی عەرەبان شاردەوەو بەرەو بەسرا هەلاتم، لەوێش لەڕێگای سنوورەوە چوومە ئێران، دوای دوومانگ ئێرانم جێهێشت و بەکەشتیەکی چارۆگەدار بەرەو کوێت چووم، لەوێ لەگەڵ گروپێکی شیوعی عێراقی چەند مانگێک مامەوە (لەئەلقەیەکی دیکە باسی ئەو گروپە دەکەم) دوای چەند مانگێک کارکردن و مانەوە لەکوێت گەڕامەوە عێراق، نزیکەی شەست دیناریشم لەگەڵ خۆم هێنایەوە، بینیم بارودۆخی عێراق نەگۆڕاوە،

ئەگەر لەعێراق بمێنمەوە، دەبێت هەردەم لەترسی ئەوەدا بم کە دەستگیرم دەکەن، بێکاریش دەمێنمەوە، بۆیە بیرم لەوە کردەوە، کە چاکترە سەفەر بکەم بۆ فیستڤاڵی لاوان، کە وابزانم لەبوخارست بوو، هەر لەبەر ئەوەش نامەیەکی راسپاردەم لەحزبی شیوعییەوە بۆ حزبی تودەی ئێرانی وەرگرت.

لەئێران لەخورەمشەهر وەک ئێرانییەکان ناوی دەبەن، نامەکەی حزبم گەیاندە موسا بیمان، موسا بیمان ئەو عێراقییە بوو، کە رەگەزنامە عێراقییەکەی لێوەرگیرابۆوەو رەوانەی ولاتەکەی خۆی کرابۆوە، ناویشی موسا ئەسەد بوو، ئێستا ئەو مولحەقی رۆژنامەوانییە لەباڵوێزخانەی عێراق لەبەیروت، موساش نامەکەی حزبی بۆ سەرچاوە بەرزەکانی حزبی تودە نارد، بڕیاریشی دا کە من بچمە تاران و پەیوەندی بەمەڵبەندی تودە بکەم. سەفەرم کرد و پەیوەندیم بەحزبی تودەوە کردو ئەوانیش بەجوانی پێشوازیان لێکردم و داوایان کرد دوو وێنەی شەمسیان بدەمێ، بۆ ئەوەی بتوانن پەساپۆرتێکی ئێرانیم بۆ دابین بکەن.

چەند رۆژێک تێنەپەڕی بوو، کاتێک رۆژنامەی شەهباز دەرچوو، کە رۆژنامەیەکی ئاشکرای حزبی تودە بوو، ئەو رۆژنامەیە حکومەتی ئێرانی و دکتۆر موسەدەقی ئاگادار دەکردەوە، لەوەی کە پیلانێکی خراپی ئەمریکا بۆ خستنی رژێم لەئارادایە، رۆژنامەکە خاڵی لەسەر پیتەکان دانابوو، ناوی کۆدەتاچییەکانی هێنابوو، وردەکاری پیلانەکەی باسکردبوو، کە چۆن دێنەلای موسەدەق و لەفلانە سەعات و لەفلانە رۆژ، وەها و وەهای پێدەڵێن، داواشیان لەموسەدەق کرد، کە ئەو کۆدەتاچییانە دەستگیر بکات.

سەرۆک وەزیرانی ئێران بەو چیرۆکەی باوەڕکردبوو، کۆدەتاچییەکانیش وەک ئەوە هەڵسوکەوتیان کرد، کە رۆژنامەی

شەهباز پێشبینی کردبوو، موسەدەق دەستگیری کردن و کۆدەتاکە پوچەڵ بوو، شا هەڵات، لەعەسری هەمان رۆژدا خەڵک بۆ خۆپیشاندان هاتنە دەرەوە، کە نزیکەی دوو ملیۆن کەس دەبوو، حزبی تودە ئەو خۆپیشاندانانەی رێکخستبوو، من لەو خۆپیشاندانانە بەشداربووم، خۆشیەکی گەورە دایگرتبووم، چونکە میللەتێکی خاوەن مێژوو و حزبێکی دۆست سەرکەوتووە. سەرکەوتنی ئەوانیش سەرکەوتنە بۆ بزووتنەوەی نیشتمانخوازان و بەتایبەتی بۆ بزووتنەوەی شوعییەت، لەهەموو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا خۆپیشاندەران چەپڵەیان لێدەدا و دروشمیان بەشێوەی ئاوازدار دەگوت، وەک برا شیوعییەکانیان لەعێراق، کە چۆن بە ئاوازەوە دەیانگوت "هیچ کۆدەتایەک نابێت، گوریس ئامادەیە."

خۆپیشاندەرە ئێرانییەکانیش بەفارسی دەیانگوت "شا لەبەر دەستە بەهێزەکان رایکرد". یان دەیانگوت "بژی میللەت، بۆ شا نەنگی و نەفرەت"، بەڵام ئایا بەسەر کۆدەتاکە زاڵ بوون؟ رۆژی دواتر لەلایەن رۆژنامەی شەهبازەوە وەڵامی ئەو پرسیارە درایەوە کاتێک بەیانییەک ئاشکرای کرد، کە کۆدەتا پیسەکە بەدوو هەنگاو ئەنجام دەدرێت، ئەگەر یەکەم سەرنەکەوت، ئەوا کۆدەتاچییەکان دووەمیان ئەنجام دەدەن، موسەدەقیشی لەوەی دووەم ئاگادارکردەوە. هەندێک ناویشی پێدابوو بۆ ئەوەی دەستگیریان بکات، بەڵام ئەو کەسانەی کە رۆژنامەکە ناوی هێنابوون و داوای کردبوو دەستگیریان بکات، لەدڵسۆزترین لایەنگرەکانی موسەدەق بوون و ئەوپشتی پێ دەبەستن، ئەو پیاوە بیری لەوەکردەوە، کە ئەگەر ئەو پیاوانە بگرێت، ئەوا سەرەتایەک دەبێت بۆ رێگاکردنەوە لەبەردەم شیوعییەکان، ئەگەر شیوعییەکانیش دەسەڵات بەدەستەوە بگرن، ئەوا لەسێدارەی دەدەن، بەڵام ئەگەر ئەو کۆدەتایەی رەجعییەکان راست بێت، ئەوا رەجعییەکان ئەگەر سەرکەوتن بەشی ئەو تەنها چەند ساڵێک زیندانی

دەبێت، بۆیە بەمشێوەیە لەژێر پێخەفەکەی خەوت، لەچاوەڕوانی ئەوەی قەدەر چی بۆ دەهێنێت.

بەپێی ئەوەی لەبیرم مابێ، رۆژێک یان دوو رۆژ زیاتربوو، ئێمە و گروپێک لەو شیوعیە عێراقییانەی هەڵاتبووینە ئێران، لەشەمران دەگەڕاینەوە تاران، شەمران شارێکە یان راست گوندێکی چیاییە بەهاوینەهەوارێکی پایتەختی ئێران دادەنرێت، کات دەیەی شەو بوو لەڕێگا جموجۆڵێکی ترسناکمان بینی، سێ لۆری پڕبوون لەسەرباز، لۆرییەکیش پڕ بوون لەپیاوی نەقوڵا، ئەو چوار ئۆتۆمبێلە لایان دەدایە لایەکی رێگاکە، گومانێک لەنێوان ئێمەدا دروست بوو، ئایا ئەو ئەوکۆدەتاچییانە کە رۆژنامەی شەهباز باسی کردوون، یان سەربازەکانی موسەدەقن؟

بەیانی لەگەڵ دەنگەدەنگ و هاوار و تەقە بەئاگاهاتینەوە، بینیمان سەربازەکان لەسێ لۆرییەکە دادەبەزن و لەگەڵ ئەوانیش پیاوە نەقوڵاییەکان بەچەقۆیەکانیانەوە لەلۆری چوارەم دابەزین، لەوەیان دەدا و شەقیان لەمە هەڵدەدا، ئەو دوکان یان ئەویتریان دەسوتاند، کەسانێک بەمەیان گوت ئەمە کۆدەتای رەجعییەکانە لەدژی موسەدەق، ئەو میللەتە زۆر سەیرە! ئەوانە بەسەدان هەزار کەس دوو رۆژ لەمەوبەر تارانیان هەژاند، ئەی ئەمڕۆ لەکوێن؟ پەیوەندیم بەحزبی تودەوە کرد، ئیدانەی ئەو هەڵویستە چەقیوەی ئەوانم کرد، کە وەک تەمەشاکەر لەبەرامبەر کۆدەتایەک وەستاون، تەنها پەنجا یان شەست سەرباز پێی هەڵساوە، تودەییەکان جەختیان لەسەر ئەوەکردەوە، کە ئەوان دەتوانن بەیەکجاری زاهدی ورودخاش بکەن، کە هەڵسانەوەی بۆ نەبێت. منیش گوتم: ئەی بۆ ورودخاشی ناکەن؟ پێکەنی و تۆزێک بێ دەنگ بوو، دواتر بەزمانێکی جددی گوتی "گوێ بگرە، ئەی هاوڕێی عەرەب، ئێمە سنورمان لەگەڵ ئیتحادی شورەوییە،

ئەوان وایان بەیەکێتی سۆڤیەت دەگوت. منیش وتم: باشە، من ئەمە دەزانم، بەڵام ئەو کەسەی قسەی لەگەڵم دەکرد، دەستی بەقسەکانی کردەوەو گوتی: ئەگەر ئێمەی شیوعی دەست بەسەر دەسەڵات بگرین، ئایا بڕوات وایە ئەمریکا لەمە بێدەنگ بێت؟. بێگومان نەخێر، جا ئەوان تەدەخول دەکەن، ئەگەر تەدەخولیش بکەن، ئەوا یەکێتی سۆڤیەت زەرەرمەند دەبێت.

خوێن دەکولا، بەهاوارکردن وەلامم دایەوەو دەنگم هەڵچوونی پێوەدیاربوو: بەڵام ئێوە ئێرانین نەوەک سۆڤیەتی، ئەرکی ئێوە ئەوەیە کە بەرگری لەمافی گەلەکەتان بکەن، مەبەستم گەلی ئێرانە، نەوەک بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت و گەلەکەی، ئەی هاوڕێیان یەکێتی سۆڤیەت دەتوانی بەرگری لەخۆی بکات. ئەو هاورێیە ئێرانیەم جارێکی دیکە پێکەنی و بەڵام زوو پێکەنینەکەی نەما و بەویقارەوە چاوەکانی خستەسەرم و گوتی: تۆ وەک شیوعییەک دەبێت ئەوە بزانی کە ئەرکی یەکەمی حزبە شیوعییەکان لەجیهان چییە. لەو بارودۆخەدا ئەرکەکە ئەوەیە داکۆکی لەئاشتی بکات، بەر لەوەی بەرگری لەبەرژەوەندییە نیشتمانییەکان بکرێت، خێر لەمەدا نییە، بەڵکو دەبێت قوربانی بەبەرژەوەندییە نەتەوەیی و نیشتمانییە تەسکەکان بدرێت، لەپێناو ئاشتی و پاراستنی یەکێتی سوڤیەت، ئەو قەڵایەکە بۆ پاراستنی ئاشتی و سۆسیالیزم، ئەگەر ئەو یەکێتیەی سۆڤیەت زیانی پێگەیشت، سەرکەوتنی ئەو بیست ملیۆنەی گەلی ئێران چ سوودی دەبێت؟ ئەی هاوڕێ ئێمە دەزانین چی دەکەین.

یەکەم ئیجرائات کە زاهدی دوای سەرکەوتنی کۆدەتاکەی ئەنجامی دا، قەدەغەکردنی سەفەر بوو، تەنانەت نەدەکرا بۆ ماوەی پێنج رۆژ سەفەر لەگوندێکەوە بۆ گوندێکی دیکە بکەیت، دوای پێنج رۆژەکە هاورێیانی تودە پەیامبەرێکیان ناردە کەعبەکەیان لەمۆسکۆ، ئەو پەیامبەر بارودۆخی وڵاتی بۆ هاورێیانی گەورە شرۆڤەکرد، وەلامی

هاوڕێیانی گەورە ئەوەبوو: ئەگەر ئێوە دەتوانن دەسەڵات لەدەستی زاهیدی دەربهێنن و بەسەری زاڵ بن، ئێمە ئامادەی هەموو هاوکارییەکین.

بەڵام کاتێک هاوڕێی پەیامبەر لەمۆسکۆ گەڕایەوە، زاهیدی بەتەواوی دەسەڵاتی بەسەر ئێرانەوە گرتبوو، بەشێوەیەک هیچ کۆدەتا و شۆرشێکی لەدژ ئەنجام نەدەدرا، بەمشێوەیە بەرژەوەندی گەلی ئێران لەپێناو بەرژەوەندییەکانی دایکی بەسۆز لەناوچوو، تەنها لەبەر ترس لەبەرژەوەنییەکانی ئەو دایکە.

لەگەڵ خۆم پرسیاری ئەوەم دەکرد: کەواتە نەیاران کاتێک بەشیوعیەکان دەڵێن بەکرێگیراو، چونکە بەرژەوەندی وڵاتانی بیانی و گەلەکانیان دەخەنەپێش بەرژەوەندی نیشتمان و گەلی خۆیان. دەڵێم کەواتە ئەوان راست دەکەن؟ بەڵام ئایا من بوومە شیوعی بۆ ئەوەی دەمەوێ بەرگری لەبەرژەوەندی وڵاتانی بیانی و گەلانیان بکەم. من بۆیە بووم بەشیوعی، چونکە گەلەکەم خۆشدەوێ، دراوسێ و ئاسیاوەکانم خۆشدەوێ، وامدەزانی شیوعییەت چاکترین چارەسەرە، تەنانەت بەتاکە چارەسەریشم بۆ کێشەکانمان و کێشەی گەلەکەمان، بۆ کێشەی هاوڕێ جووتیارەکەم لەگوندێکی دوورەدەستدا، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی رۆشنبیران و ملیۆنان خەڵکی شەریف و ناشەریف، بەڵام ئێستا روویەکی دیکەی شوعییەتم بۆ دەرکەوت،ئەویش پاشکۆیەتی و لایەنگرییە. لەوکاتەدا هەڵوێستی هاوڕێیانم لەعێراق بیر کەوتەوە، لەبەرامبەر گەورەترین کێشەی عەرەب کە ئەویش کێشەی فەلەستین بوو لەساڵی ١٩٤٨، کە چۆن رووبەرووی هەستی گەلەکەیان و هەستی سەدان ملیۆن عەرەب بوونەوە، هوتافیان دەکێشاو دەیانگوت: ئێمە برای جولەکەین، بەڵکو راستیەکە ئەوەبوو جولەکە سەرکردایەتی دەکرد، ئەوانیش یەهودا

سدیق و ساسون دەلال و ئیبراهیم یوسف زولیخاو ناجی شەمیل بوون، ئەوانە سەرکردایەتی شیوعی بوون، ئەو کات ئەوان بەرگری عەرەبیان بەشەڕێکی خراپ ناودەبرد، تەنها لەبەر ئەوەی سەربازگەی رۆژهەڵات دانی بەجولەکە نا، من دەتوانم دەیان هەڵوێستم بیربێتەوە کە بەڵگەنە بۆ رقی شیوعی لەقلی و بەهبەهانی و عەرەب و نەتەوەخوازی عەرەبی، ئەمانە هەموو هاوشێوەی ئەو هەڵویستە بوون کە لەئێران بینیم، بەڵام من وەک شیوعییەک کە لەناوەوە پەرۆشبووم و باوەڕبەی تەواوم بەشوعییەت هەبوو، بەخۆم گوت: ئەمە هەڵوێستێکی هەڵەیە، لەوانەیە تەنها تایبەت بێت بەتودە، بێگومان شوعییەکانی عێراق لەو هەڵوێستەی تودە رازی نین.

گەڕامەوە عێراق، کاتێک بەهەر شیوعیەکی عێراقی دەگەیشتم باسی ئەو هەڵوێستەی تودەم بۆدەکردن، بەڵام ئەوان بیانویان پێدەگرتم و دەیانگوت هەڵوێستەکەی تودە دروستە و تودەییەکان لەسەرهەق بوون، چونکە نەیانتوانیوە زیاتر لەو هەڵوێستەیان هەبێت، ئەمیش بۆ بەرگریکردن لەئاشتی، کە هەموو حزبەکانی شیوعی لەدونیا دەیانەوێت بەرگری لەو ئاشتییە بکەن، سەرەڕای ئەمانەش من وەک ئەندام لەحزبی شیوعی مامەوە، دڵی خۆم بەوە دەدایەوە، کە ئەو سەرکردایەتیە دەگۆڕێت و خەڵکانی دیکە دێت رێزی تەواو لەبەرژەوەندییە نەتەوەییەکانیان دەگرن، جگەلەوەی ئەوەی منی بەشیوعییەکان دەبەستەوە تەنها داوێکی باریکبوو، کە بچووکترین هەڵە بیکەن ئەوا ئەو داوەش دەپچرا، هەر بە پەلەش ئەو هەڵەیەیان کرد، کە لەئەلقەی داهاتوو باسی دەکەم.

لەئەلقەی دوێنێدا باسی ئەوەم کرد، کە چۆن لەئێران گەڕامەوەو لەناخمدا زایەڵەی ئەو ئەزمونە تاڵەم هەڵگرتبوو، کە لەوێ لەخیانەتی حزبی تودەم بینیبوو لەبەرامبەر بەرژەوەندییەکانی گەلی ئێران ئەنجامیان دا، تەنها لەبەر ترسێکی گومانکراو کە لەبەرژەوەندی دایکەزەلیلەکە دەکرا، لەزهمنمدا ئەو هەڵوێستەم بەراورد کرد بەهەڵویستی هاوڕێیانی عێراق، کە لەبەرامبەر مەسەلە گەورەکەی عەرەب هەیانە، ئەوا عەرەبن دەبێت داکۆکیان لێ بکەن، کەچی دەچن خزمەتی زایۆنیزم دەکەن و پێیەکانی ئەوان دەلێسنەوە، تەنها لەبەرئەوەی پایتەختە روحییەکەی ئەوان پشتگیری چەتەکانی تەلئەبیبی کردووە، باسی ئەوەشم کرد، کە چۆن شیوعییەکانی عێراق پاساو بۆ هەڵوێستی شیوعییەکانی ئێران دەدۆزنەوەو بەڕاستی دەزانن، هەر بەو بۆنەیەشەوە بیرم کەوتەوە، زاهیدی کاتێک رێکخستنەکانی سوپای ئاشکرا کرد،٧٣٢ ئەفسەری شیوعی دەستگیرکردو لەسێدارەی دا.

گوتیشم سەرەڕای هەموو ئەمانە من وەک شیوعییەک و ئەندامێکی حزبی شیوعی مامەوە، جاران گوزارشتێک لەلای شیوعییەکان هەبوو، ئێستاش لەلایان باوە، لەوکاتە دەیانگوت کە ئەندامێکیان فەسڵ

دەکرد،ئەویش ئەوەبوو "بۆ کوێ دەچی؟" ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە شیوعی یان راستر ئەندامی شیوعی مرۆڤێکی بێ کەسایەتییە، ئەو وەک منداڵێکی بچووکە ناتوانێت بێ دایکی بژی و کارەکانی راپەڕێنێت، وا وێنا دەکەن کە ژیان بێ حزب مەحاڵە، یان مەحاڵ حوکم دەکات، کەچی باوەڕم بەشیوعیەت و حزبەکەی تاڕادەیەکی زۆر لەقی. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد ئەو حزبە یەک هەڵە بکات بۆ ئەوەی لەدژی راپەڕم، هەر زوو ئەو هەڵەیەش هات.

بەهاوکاری چەند برادەرێکی چاک، لەبەڕێوەبەرایەتی بازرگانی دامەزرام، ئەو کات دوو قەسیدەی درێژم هەبوو، کە لەکوێت نوسیبووم، یەکەمیان بەناوی (چەکەکان و منداڵەکان) دووەمیشیان بەناوی (سۆزانییەکی کوێر)، من ئەوپارەیەم نەبوو تا لەناملیکەیەک چاپیان بکەم، بۆیە بەدوای دەزگایەکی چاپ دەگەڕام.

ئەوکات تێبینی ئەوەم کرد، کە هەندێک موتەشاعیری هیچ و پوچ، (نەوەک شاعیر)، نموونەی عەبدولوەهاب بەیاتی و گروپەکەی بەشێوەیەکی سەیر دەرکەوتوون، ئەمەش لەبەر چۆڵبوونی مەیدانەکە، من تا ئەو ماوەیەی لەکوێت و ئێران بووم یەک دێرە شیعرم بڵاو نەکردەوە، بۆیە هاوڕێیانم گلەییان لەو بێدەنگییەم دەکرد، داواشیان دەکرد یەکێک لەکتێبەکانم لەگۆڤاری ئاداب بڵاوبکەمەوە، منیش ئامۆژگارییەکەی ئەوانم وەرگرت و لەگۆڤاری ئاداب قەسیدەیەکم بەناوی "دوارۆژی ستەمکارەکان" بڵاوکردەوە، لەپێشەکی قەسیدەکەدا هاتبوو، کە ئەمە لەسەر زاری شۆڕشگێڕێکی تونسی نووسراوە، کە قسە لەگەڵ یارەکەی دەکات. شیوعییەکان لەو پێشکەشکردنە هەڵچوون، ئەمە ئازاری دەدان کە قەسیدەیەک پێشکەش بە شۆڕشگێڕێکی عەرەبی بکرێت، بۆنی شعوبیەتی نەفرەتلێکراوم لەو هەڵوێستەی شیوعی دەکرد، ئەمەم بەچەندین هەڵوێستی جیاجیا

گرێدا، که ئەوان دوژمنایەتی خۆیان بەئاشکرا لەدژی عەرەب و نەتەوەخوازی عەرەبی دەربڕیوە.

من هەر لەدوای دەزگایەکی چاپ دەگەڕام بۆ ئەوەی دوو قەسیدەکەی "سۆزانی کوێر" و "چەکەکان و منداڵەکان" بڵاوبکەمەوە، بەڵام ئەوان وایان نیشاندا، که ئەوان ترسیان هەیە لەدەسەڵاتی ئەوکات، ئەگەر بێت و چەکەکان و منداڵەکان چاپ بکەن ئەوا تێوەدەگلێن، بەڵام ئامادەییان نیشان دا، سۆزانی کوێر چاپ بکەن، منیش پیشوازیم لەمە کرد، قەسیدەکەم پێدان بۆ ئەوەی بڵاوی بکەنەوە.

وەک ڕێکلامێک بۆ قەسیدەکە، لەبەر نەبوونی قەسیدەیەک که بڵاوبکەمەوە، من بەشێکم لەسۆزانی کوێر لەیەکێک لەڕۆژنامەکان بڵاوکردەوە، بەناوی "سۆزانی عەرەب" که تێیدا هاتووە:

**في موضع الارجاس من**

**جسدي وفي الثدي المذال**

**تجري دماو الفاتحين**

**فولوثوها يارجال**

**من كل جنس للرجال**

دوای بڵاوبوونەوەی ئەو بەشە، هەندێک لەشیوعییەکانی عێراقم بینی، که زۆربەیان بەڕەچەڵەک ئێرانی بوون، دەستخۆشیان لەبەر ئەو قەسیدە نایابە لێکردم، دڵخۆشی خۆیان بەو شکستەی عەرەب و بەنەتەوەی بەعەرەب دەربڕی، چونکە ئەوان لەو پارچە شیعرەدا

ئاراستەیەکی دژایەتییان دەدۆزییەوە، ئەو هەڵوێستە بێزاری کردم، ئەو شعوبیە نەفرەتلێکراوە هەر لەکوشتنی عومەر کوڕی خەتابەوە تا ئێستا دژایەتی عەرەب دەکات، ئەو شیوعیەتە بەڕاستی یەکێکە لە دەماگیریەکی بێزراو. یەکێک لەوان ئێرانی بوو رقی لە عەرەب و عروبەبوو، تەنها لەبەر ئەوەی ئێرانییە، ئەمەیە بیرکردنەوەی رەگەزپەرستی.

نەتەوەیی عەرەبی ئازاد ئەوەیە کە هەست بەوە دەکات، کە ئەو مرۆڤێکە لەیەکێک لەبەشەکانی نیشتمانی عەرەبی گەورە دەژیت و بەزمانی عەرەبی قسەدەکات و هەست بەوە دەکات، کە بەشێکە لەنەتەوەی عەرەبی، ئەو زیاتر لەمە ناڕوانی، نموونە سەیری رەگەزی خۆی ناکات.

کاتێک (سۆزانی عەرەبی) چاپ دەکرا، پەراوێزێکم بۆ نووسی بۆئەوەی رێگە لەشعوبییەکان بگرم تۆڵە لەعەرەب و نەتەوەکەیان نەکەنەوە، ئەوەش لێکدانەوەی ئەو دوو دێرەی سەرەوە بوو، من نووسیم "چەمکی نەتەوایەتی لەلای ئێمە، لەنێوان شعوبیەت و شوڤێنیەت ونبووە". دەبێت وەها بێت نەتەوایەتی گەل و گەلیش نەتەوەیە.دەبێت نەوەکانی محەمەد و عومەر و عەلی و ئەبوزەر و خەواریج و شیعەکانی سەرەتا و موعتەزەلە لەژیانێک بژین وەک مرۆڤ بێت و ئەمە میراتی نەتەوەی عەرەبی بێت، ئایا شەرم نییە بۆ ئێمە عەرەب کە کچەکانمان سۆزانی بێت و لەگەڵ هەموو کەسێک لەڕەگەز و رەنگێک بخەوێت؟

شیوعییەکان بڕیاری رەتکردنەوەیان دا، بەرلەوەی بڵاوبکرێتەوە بڕیاریان دا نەیکرن، بیانوشیان بۆ ئەمە ئەوە بوو، کە دەبووایە بەر لەسۆزانی کوێر من چەکەکان و منداڵەکان بڵاوبکەمەوە، کە ئەوەیان خزمەتی ئاشتی دەکات. دیارە شەڕە سەرەکییەکە لەشەڕی ئاشتییە،

جگە لەمە ئەو شتانەی کە لەسۆزانی کوێر باسی دەکات شتی لاوەکین. قەسیدەکە بڵاوکرایەوە، ناوەندە قەومییەکان بەئاسودەییەکی زۆر و هاندانەوە پێشوازییان لێکرد، بەڵام شیوعییەکان ڕەتیان کردەوە، کاتێکیش ئەو سەرنجەی منیان لەبارەی شعوبییەکان و شعوبیەت خوێندەوە شێت بوون، وایان لێکدایەوە، کە من مەبەستم شیوعییەکانە بەوشەی شعوبییەکان دەرمبڕیوە.

جەماعەتێکی دیکە لەوان منیان بینی، وایان نیشاندا کە ئەوان قسەیەکیان لەسەر سەرنجەکەی من نییە، تەنها ئەوە نەبێت، کە گوتومە "ئایا شەرم نییە بۆ ئێمە عەرەب کە کچەکانمان سۆزانی بێت و لەگەڵ هەموو کەسێک لەڕەگەز و ڕەنگێک بخەوێت". پێیان وابوو ئەمە لەڕووحی ڕەگەزپەرستی هاتووە، دواتر پرسیاریان کرد: زیان لەوە چییە کە جولەکەیەک یان زەنجییەک یان ئێرانییەک لەگەڵ سۆزانییەکی عەرەب بخەوێت؟ منیش بەوە وەڵامم دایەوە، کە من بەزمانی عەرەبی دەنووسم و بۆ خوێنەرانی عەرەبی دەنووسم، لەسەرمە لەژێییە هەستیارەکان بژەنم لەڕوحی عەرەبیدا، من لەو قەسیدەیەدا روونمکردۆتەوە، کە چۆن باوک کچەکەی بەشوو نەدەدا، لەبەرئەوەی فلان لەو ڕەچەڵەکە و داپیرەی لەو ڕەچەڵەکەیە، ئەو دەمارگیریە بۆ ئەو کچە بەستەزمانە گەیشتە کوێ، کەچی ئێستاش چۆن کچەکەی بۆتە کەلوپەل لەلای ئەو کەسانەی کە کچەکەی پێنەدان.

هاوڕێیە شەریفەکان هێشتا قەناعەتیان بەو برە نەهاتبوو، بۆیە لەهەموو شوێنێک هێرشیان دەکردە سەرم، کارەکانیان بەئاستێک گەیشت کە نەمتوانی ئیتر لێیان بێدەنگ بم، کاتێک منیان بەجاسوس تۆمەتبار دەکردو گوایە من موچەیەک لەفەرمانگەی "تەحقیقات جنائی" وەردەگرم، من بەگوێرەی هێرشی ئەوان هێرشم کردەوە سەر ئەوان و هەندێک لەسەرکردەکانیان بەتایبەتی ئەوانەی کە چەندین کاری

نائەخلاقییان کردووە، نموونە (بەهادین نوری) هاوڕێ مادلین میری لاقەکرد، مادلین پەنای بردبووە بەر ماڵی حزب، کەچی سکپڕبوو، کاتێک پۆلیس ئەو تەلەزگەیەی شیوعی گرت، یان هاوڕێیەک ناوی شوێنەکەی ئاشکراکردبوو، کە ئێستا ناوەکەم بەبیر نایەت، مادلین حوکمی زیندانیکردنی بۆ درا، ئەو لەزیندانی ئافرەتان بوو، کاتێک کورپەلەیەکی بوو، ناوی نا سەلام، بژی سەلام و بژی حزبی شیوعی و کوڕەکەی سەلام.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێرشی من بۆ سەر شیوعییەکان لەسنووری قسەکردن مایەوە نەگەیشتە نووسین، دوای ماوەیەک کتێبێکم بڵاوبۆوە کە چەند قەسیدەیەکی هەڵبژێردراو بوو لەئینگلیزییەوە وەرگێڕدرابوو، هی چەندین شاعیر بوو لەنەتەوەی جیاواز و بیروباوەڕی جیاواز، لەوانە هەندێکیان شیوعی بوون، وەک نازم حیکمەت و بابلۆ نیرۆدا و خەڵکانی دیکە، هەبوو راسترەوبوو وەک ت. س ئیلیوت، هەبوو سوسیالیست بوو وەک ستیڤن سپیندەر، سەرەڕای ئەوەی پۆلیسی نوری سەعید منی لەسەر ئەو کتێبە دەستگیرکرد، کەچی شیوعییەکان هەر رازی نەبوون، لەوە توڕەبوون کە من شیعری غەیرە شیوعییەکانم وەرگێڕاوە، بەتایبەتی ئیلیوت و ستیفن سپیندر، کە ماوەیەک ئەندامی حزبی شیوعی بەریتانی بوو، دواتر بووە دوژمنی شیوعیەت و شیوعییەکان، دوای ئەوەی هەندێک نەنگییەکانی ئەوانی ئاشکراکرد، ئەو یەکێکیشە لەبەشداربووانی کتێبی "ئەو خواوەندەی فەشەلی هێنا."

گۆڤاری سەقافەی وەتەنی کە شیوعییەکان لەلوبنان دەریان دەکرد، لەسەر ئەو کتێبەیان بەمشێوەیە نوسیوە، "ئەو کەسەی ئەو کتێبەی چاپ کردووە، ناوی بەدر شاکر سەیابە، کە کتێبەکە چەند قسیدەی شاعیرانی فاشست و نازییەکان نموونەی ئازرا پاوەند و ئەو

جاسوسانە لەخۆیەوە دەگرێت، کە لەئەنتلجنسای سرڤیس کاریان کردووە، نموونەی ستیڤ سپیندەر. هەڵبەتە نەمتوانی لەو تەحەدایە بێڕەوشتیە بێدەنگ بم، وەڵامم دایەوەو گوتم زۆربەی شاعیرانی عێراق واقیعی و مرۆڤدۆستن، لەبارەی کێشەکانی گەل دەنوسن و بەربەرەکانێی ستەم دەکەن، کاتێک دەردەکەون شیوعییەکان چەپڵەیان بۆ لێدەدەن لەخۆیان هەژمار دەکەن، پۆلیسیش راویان دەنێت بەشیوعیان دەزانێ، کەچی لە راستیدا وانییە.

گوتم من شیوعی نیم تا شیوعییەکان بەلادەر و خیانەتکارم بزانن، دواتر داکۆکیم لەو قەسیدانەکردو گوتم "من تەنها لەبەر ئەوە هەڵمبژاردوون، چونکە قەسیدەی باشن، بەچاوپۆشی لەوەی ناسنامەی نووسەرەکانیان چییە". دواتر داکۆکیم لەستیڤن سپیندەر کرد، کە یەکێکە لەهەر شاعیرێکی شیوعی کە خوێندبیمەوە مرۆڤانەتر و قوڵترە، لەنازم حیکمەت و بابلۆ نیرۆدا و هەر شاعیرێکی شیوعی و شعوبی، دواتریش گوتم من خزمەتی میللەتەکەی خۆم دەکەم ئامانجم بەرژەوندییەکانیەتی، چاوەڕوانی رێنماییش ناکەم لەلەندەن و واشنتۆن و مۆسکۆیەوە بێت.

لەوکاتەوە جەنگی راستەقینە لەنێوان من و شیوعییەکان هەڵگیرساوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان تا ئێستا بەمرۆڤێکی شەرمەندم و دیموکراسی و دڵسۆزم دەزانن، هەندێکیش رەواج بەو پڕۆپاگەندەیە دەدەن، کە گوایە من بەعسیم، هەندێکی دیکەیش قسەی وەها بڵاودەکەنەوە، کە من عەرەب نیم، یان گوایە من سوریم. ماوە شتێک بڵێم من دەتوانم دواتر دەزگایەک بۆ چاپکردنی چەکەکان و منداڵەکان بدۆزمەوە، کاتێک ئەو قەسیدەیە بڵاوبووەوە کە بانگەشە بۆ ئاشتی دەکات، دوژمنانی ئاشتی قبوڵیان کرد، وەک دەزانین شوعییەکان قەومییەکان بەدوژمنی ئاشتی دەزانن، بەڵام شیوعییە شوڤێنیەکان کە

لایەنگری ئاشتین بایەخیان پێنەدا، ئەوانەی کە منداڵانیان خۆشدەوێ،
وەک ئەوەی رووداوەکانی کەرکوک سەلماندی.

نیوەڕۆ لەسەرخەویکدا بووم، کاتێک زەنگی ماڵەوە لێیدا، بەپەستی لەخەوهەڵسام بۆ ئەوەی دەرگاکە بکەمەوە، بینیم ئەو کەسەی لەبەردەرگا وەستاوە برادەرێکی کۆنمەو خەڵکی زێدەکەی منە، ئەو کەسە ژیانی سیاسی وەک لایەنگرێکی حزبی نیشتمانی دیموکراتی دەستپێکردو دوای شۆرشیش چووە بەرەی شیوعییەکانەوە، سەرم لەو سەردانە سورما، کە چاوەڕوان نەکراوبوو، کاتێک ئەو برادەرەم دانیشت، پێی ڕاگەیاندم کە خێزانەکەی ڕەوانەی بەسرا کردووە، هەستم بەئاسوودەییەکی مەزن کرد، وا سەردانەکەم لێکدایەوە، کە کەسێک کاتێک ماڵەوەی لەهەر مرۆڤێک خاڵی دەبێت، سەیر نییە بەدوای هاوڕێیەک بگەڕێت بۆ ئەوەی ئەو نیوەڕۆیە درێژ و بێزارکەرەی لەگەڵ بەسەر ببات.

کەچی هێندەی پێنەچوو بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: ئەو نووسینانە چییە؟ چۆن لەخۆت ڕازی دەبی بگەیتە ئەو ئاستە؟ قسەیەکی زۆر لەبارەی ئەو نووسینانە لەنێوانماندا کرا، ئامۆژگاریی کردم کە واز لەو نووسیانە بهێنم، قسەکانی بەو شێوەیە کۆتایی پێهێنا و گوتی: بەتەواوی ویستی خۆت بوویتە شیوعی و بەتەواوی ویستی خۆشت وازت هێنا، ئەوەی لەنێوان تۆ و شیوعییەکان هەبوو کۆتایی پێهات، هەمووومان ئەوە دەزانین، کە بەر لەشۆڕش کۆتایی پێهاتووە، ئەمە چەند مانگێک نییە، بەڵکو ساڵانێکە. جا ماقوڵتر و بەڕێزتر نییە

هەرچییەکت هەیە لەناو دڵتەوە بێت؟، نە بە چاکە و نە بە خراپە ڕووبەڕووی شیوعییەکان نەبیتەوە؟

وەڵامم دایەوەو گوتم: ڕاستە ئەوەی لەنێوان من و شیوعییەکاندا هەیە چەندین ساڵە کۆتایی پێهاتووە، بەڵام بەئاشتی وازیان لە من هێناوە؟ بەجوێن و قسەپێگوتن و درۆ ڕاوم دەنێن، تا کار گەیشتە ئەوەی لەوەزیفەکەم دەر بکرێم، ئەوان نانیان بڕیم، تاکە سەرچاوەکەم کە من و منداڵەکانی پێدەژیا بڕیان، من لەگەڵیان لەجەنگێکدام، ئەمە جەنگێکی شەخسییە، سەرەڕای ئەوەش جەنگی بیروباوەڕە.

من وایدەبینم پێوستە لەسەرم ئەمڕۆ، چیرۆکی فەسڵکردنی خۆم بگێڕمەوە، کە تێیدا شوعییەکان یارییەکی چەپەڵیان کرد، بۆ ئەوەی ئەو برادەرەم بیخوێنێتەوەو دواتریش هاوڵاتیان و بەرپرسان بیخوێننەوە، بەر لەهەموو کەسێکیش، دەبێت زەعیم بیخوێنێتەوە، هیواخوازم ئەو کاتەی تەرخانی کردووە بۆ خزمەت گەل و شەونخونکردن بۆ بەرژەوەندییەکانی گەل دەکات، بەشی خوێندنەوەی ئەو چەند دێڕەش بکات، کە نەوەک تەنها هاوڵاتییەکی ستەملێکراو نووسیویەتی، بەڵکو شاعیرێک دەینوسێت، کە دیارترین شاعیرە لەشاعیرانی عەرەب.

ئێمە پیاوانی ڕژێمی پێشوو بەئەنجامدانی ئەو تاوانە تاوانباردەکەین، کە دەرهەق بەشاعیر مەعروف ڕەصافیان ئەنجام دا، کاتێک شەڕی نانبڕینیان لەگەڵ کرد، لەبەر ئەوەی ڕەصافی دوژمنی مەلیک و عەرشەکەی بوو، ئەوەتا ئەمڕۆ دەرهەق بەشاعیرێک دەکرێت کە لەڕووی شاعیریی و نیشتمانخوازییەوە لەو کەمترنییە، دڵسۆز و دیموکراسییە لەناخەوە، من شەڕی نانم دەکەم لەسەردەمی زەعیمی بێ هاوتا عەبدولکەریم قاسم، لەبەر ئەوەش نییە من دژی کۆمارم، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەی عەبدولکەریم قاسمم زیاتر لەخرۆشۆف و

مارکس و لینین خۆشتردەوێت، عێراقم زیاتر خۆشتدەوێت لەیەکێتی سۆڤیەت، گەلی عەرەبیم زیاتر خۆشدەوێت لەگەلی سۆڤیەت و هەر نەتەوەیەکی دیکە.

دوای ئەوەی خوا عەبدولکەریم قاسمی بۆ ناردین، بۆ ئەوەی رزگارمان بکات، زەعیم، ئازادی بۆ هەمووان رەخساند بەشیوعییەکانیشەوە، شوعییەکان پێشبینی گەڕانەوەیان لێدەکردم وەک ئەو سەدان ترسنۆکەی کە گەڕانەوە ریزەکانیان، ئەوانی کە لەسەردەمی نوری سەعید بەرائەتنامەیان داو شیوعییەتیان فەرامۆشکرد، بەڵام من هیچ بەرائەتنامەیەک و وەستانەوەیەکم لەدژیان نەبووە، تەنانەت تاوانبارە دەسەڵاتدارەکانی پێشوو تا بەرەبەیانی شۆرشی نەمری ١٤ی تەمموز بەتۆمەتی شوعییەتەوە راویان دەنام، لەگەڵ ئەوەشدا لەو هەڵوێستەم پاشگەزنەبوومەوە، کە لە ١٩٥٣وە لەبەرامبەر شوعییەکاندا هەمە، سەرەڕای ئەوەش من هەڵوێستی دوژمنکاریم وەرگرتووە.

لەسەردەمی نوری سەعیددا بەزەییمان بەشیوعییەکان دەهاتەوەو لەگەڵیان هاوڕا دەبووین، خۆمان لەوە دەگرت، کە دژایەتییان بکەین، چونکە دەمانزانی خائین و ستەمکارەکانی رژێمی پێشوو ئەوانیان دەچەوساندەوە، بۆیە کاتێک ئێمە دژی ئەوان بووینایە واتەی ئەوەبوو کە لەریزی نووری سەعید دەوەستین.

کۆدەتاکەی شەواف روویدا، رۆژێک دواتر یەکێک لەشیوعییەکانی ١٤ی تەمووز هاتە لام، کە فەرمانبەرێکی بچووکە لەو فەرمانگەیەی من، بەرێوەبەرایەتی گشتی بازرگانی، ئەو عەریزەیەکی بەدەستەوە بوو داوای لێکردم کە ئیمزای بۆ بکەم، دوای ئەوەی خوێندمەوە، رەتم کردەوە ئیمزای بکەم، ئەو هاوڕێ شیوعییە کە ناوی داود سەلمان بوو، یان سەلمان داود، بەباشی ناوەکەیم بیرنەماوە، پرسیاری

لەبارەی ئەوەوە لێکردم کە چی رێگرە لەوەی عەریزەکە ئیمزا بکەم،
وەڵامێکم دایەوە دیاربوو ئەو بەو وەڵامی من رازی نەبوو، ئەو گوتی
هەر کەسێک ئەو عەریزەیە ئیمزانەکات خائینە. منیش ئەو هەڵوێستە
چەپەڵەی ئەو پیاوە تورەی کردم و پرسیم: تۆ کێی تا حوکمی
خیانەت یان نیشتمانپەروەری بەسەرخەڵک بدەیت؟ بەر لەچواردەی
تەمموز لەکوێ بوویت؟ ئەو رۆژەی کە نیشتمانپەروەری دەیخواست
مرۆڤ سەرو کاری دابنێت و بەرەو زیندان و دەربەدەری و
بێبەشبوون بچێت؟. بەشێوە چەپەڵەکەی هاورێیان وەڵامی دامەوە، کە
(ع.ع) دەیگێرێتەوە، من لێرەدا باسی فەسڵکردنی خۆم ناکەم، بەڵکو
باسی ئەوەی (ع.ع) دەکەم. کە ئەو پارێزەرێک بوو لەبەسرا، ئەو
بەشێوەیەکی رادەبەدەر شزوزی جنسی هەبوو، لەسەرەتادا ئینتمای
بۆ یەکێک لەحزبە نیشتمانییەکان هەبوو، دوای ئەوەی بەمەرامی خۆی
گەیشت، چووە حزبی شەعب کە عەزیز شەریف سەرۆکی بوو، ع.ع
لەوێ هەموو ناپاکییەکانی خۆی بەجێهێنا، دواتر چووە حزبی تەحرور
کە ئەو کات رووەدیارەکەی حزبی شیوعی بوو، ماوەیەکی زۆر لەوێ
مایەوە، ئەوانەی ئینتمایان بۆ ئەو حزبە هەبوو جولەکەبوون، رێژەی
جوانی و ئامادەبوونیش بۆ قوربانیدان لەنێو گەنجانی یەهوود
لەهەموو لایەنێک زیاتر بوو، بۆیە ع ع کرایە رێکخەری کۆمەلێک
گەنجی ئیسرائیل.

رۆژێکیان کۆبوونەوەی رێکخستن دەبێت لەگەڵ حەسقیل و شلۆمۆی
جوان و شۆخ، هێندە نابات کۆبوونەوەی رێکسختن دەبێتە جۆرێکی
دیکە لەکۆبوونەوە، لەو کۆبوونەوەیەدا هاورێی خەباتکار (حەسقیل)
سەری خۆی بەرزدەکاتەوەو سەیری رێکخەرەکەی دەکات و دەڵێ:
مامۆستا، بۆچوونت لەبارەی کۆدەتاکەی حوسنی زەعیم چییە؟ ئایا
موکرِبوونت لەسەر خەبات لەمەزیاتر بینیوە؟ ئائا ئێوەش چەپڵەی
لەمە زیاترتان بینیوە؟ ئەمەیە چەپڵەی هاورێیان.

جا هاوڕێ داود بەو ناپاکییە حەسقیلیە وەڵامی دامەوەو گوتی "رابردوو گرنگ نییە، ئێمە لەئێستادایین، رابردووی تۆ مەزن بوو، بەڵام ئێستای تۆ شتێک نییە، من ئێستا خەباتکارم". منیش جوێنم پێدا و جوێنم بەخەباتکار و شیوعییەکان و حزبی شیوعی دا، ئەویش عەریزەکەی هەڵگرت و بەهاوارکردن رۆیشت "الله اکبر، جوێن بەزەعیم دەدات و ستایشی عەبدولناسر دەکات". ئەو هەواڵە گەیشتەوە مامۆستای بەرتیلخۆری چەپەڵ (ج)، ئەوە ئەو کەسە بوو کە من لەلای بەرێوەبەری گشتی لەفەسڵکردن نەجاتم دا لەسەردەمی رژێمی پێشوودا، کاتێ لێی ئاشکرابوو کە بەرتیلی وەرگرتووە، من ئەو کات بەبەرێوەبەرم گوت "ئەو پیاوە لەسەر نیشتمانییەکان حیساب دەکرێت، ئەگەر بێت و بەتۆمەتی بەرتیل فەسڵی بکەیت ئەوا لایەنگرانی نوری سەعید دەڵێن ئەوانن نیشتمانخواز و دیموکراتیخواز کە دژایەتی نوری سەعید دەکەن، کەچی دز و بەریتلخۆرن.

من گوتم: ئەو هەواڵە گەیشتە ئەو پیاوە رەزیلە، لەڕەزیلیان هیچ میوەیەک بۆ منداڵەکانی ناکرێت تەنها خورما نەبێت، رۆژێکیان دوو منداڵەکەی لێی دەپارێنەوە "بابا مۆز یان سێومان بۆ بکڕن بەخوا بەخورما مردین". ئەویش دەڵێ "من لەگۆڤارێکی سۆڤیەتیم خوێندۆتەوە، کە خورما زۆر ڤیتامینی تێدایە، کە لەمۆز و سێودا نییە، کاتێک خەبەرەکە گەیشتە ئەو پیاوە ئەویش بەدوژمنکاری من و جوێندانی من دەزانێ، دەشزانێ من چ بەسەرهاتێکیان دەزانم، بۆیە ئەمە هەلێک دەزانێ بۆ تۆڵەکردنەوە، ئەو رۆژە بەڕێوەبەری گشتی لەمۆڵەتدا بوو، بۆیە مامۆستا(ج) نووسراوێکی بۆ وەزارەتی بازرگانی کردو تاوانەکانی منی تێدا نووسیبوو، لەنوسراوەکەی هاتبوو، بیرنارەوە پێکەنیوە لەو رۆژەی کە کۆدەتای شەوافی تێدا ئەنجام درا، ئەمەش مانای .. ئایا ئەو دیالکتیک و لۆژیکە دەزانن؟ مانای ئەوەیە کە

ئەو بەو کۆدەتایە چەپەڵە، دڵخۆش بووە، یەکێکیشە لەوانەی سڵناکاتەوە لەجوێندا بەزەعیم.

دوای چەند خولەکێک زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا، ئەوەی قسەی کرد معاونی پۆلیسی عەباخانە بوو، منیش زانیم دەستگیرم دەکات، لەبەر ئەوەی دەشمزانی هیچ تاوانێکم نەکردووە، بۆیە بریارم دا خۆم بچمە لای، ویستم لەژوورەکە دەربچم بۆ ئەوەی مۆڵەت لەجێگری بەرێوەبەری گشتی وەربگرم، سەرم سورما کاتێک فەراشەکە گوتی "بەڕێز بەدر قەدەغەیە لەژوورەکەی خۆت دەربچی، منیش وامزانی ئەمە بۆ ئاگاداربوونە لەبەرژەوەندییەکانی کۆمار، بۆ ئەوەی کاتی فەرمانبەر بەزۆرگوتن و سەردانی فەرمانبەرانی دیکە بەفیرۆ نەدرێت. منیش پرسیم بەفەرمانی کێ؟ وتی بەفەرمانی جەماعەت. منیش هاوارم کرد جەماعەت کێن؟ من سەرۆکی تێبینەرانم کەس لەسەرووی من نییە بەرێوەبەری گشتی نەبێت، من وا دەچمە لای.

ئەوکاتە سەگە سوورەکان هێرشیان کردە سەرم دەیانگوت "لەشوێنی خۆت دانیشە ناپاک" یەکێکیان پاڵی پێوەنام و هەڕەشەی ئەوەی لێکردم کە سەرم دەشکێنێ، دواتر هاوڕێیەکی ژن کە شەریفە هات زۆر جوێنی سوکی پێدەدام کە هەر ژنێکی پاک یان نیمچەپاک لەشەرمان ئارەق دەکات.

پۆلیسێک لەئەمنەوە هات و منی برد بۆ بنکە، یەکێک لەگەڵ ئەو پۆلیسە دابوو، کە کەسێکی قین لەدڵبوو، چونکە شاعیرێکی فاشل بوو، وەک ئەوەی من لەفەشەلی ئەو بەرپرسیار بم، لەوێ دوو کەسم لەگەڵ دابوو، یەکیان هونەرمەند نوری راوی بوو، دووەمیان خەباتکار داود سەلمان بوو، لەبنکەکەدا نوری ناوی خۆی گۆڕی بۆ نوری ئەحمەد مەحمود نەوەک لەدوارۆژ کاتێک بۆوە وێنەگرێکی نەمر، لەسەرم مێژوو لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات. کاتێک مفەوەزەکە لەوانی

پرسی ئایا ئەوە جوێنی بەزەعیم و کۆمار و یەکێک لەبەرپرسەکان داوە؟ ئەوان بەنەخێر وەڵامیان داوە، بەمشێوەیە لەدەستگیرکردن نەجاتم بوو، بەڵام لەوەزیفەکەم دەرکرام.

ڕاگەیاندنێکم بینی کە لەکۆمپانیایەکی نەوتەوەبوو، داوای وەرگێڕیان دەکرد، منیش لەڕێگای بەڕێوەبەرایەتی کاروباری نەوت داوایەکم پێشکەش کرد، ئەو بەڕێوەبەرایەتییە نوسراوێکیان لەگەڵ عەریزەکە بە من دا، بۆ ئەوەی ببەمە کۆمپانیاکە، بەرپرسانی کۆمپانیاکە کاتێکیان بۆ بینینم دیارکرد، ڕۆژێک بەر لەو کاتە سەردانی برادەرانم کرد لەو کۆمپانیایە گوتیان "بەڕێوەبەرایتی نەوت نوسراوەکەی پێشوویان پوچەڵکردۆتەوەو نووسراوێکی دیکەیان ناردووە، بۆچی بەرێوەبەرایەتی نەوت لەو مافە سادەیە بێبەشم دەکەن، کە کارکردنە لەکۆمپانیایەکی بیانی، کەچی ڕێگا بەو ئەفسەرانە دەدەن، کە خانەنیشین کراون و بەتۆمەتی پیلانیگیرانیان لەدژی کۆمار هەیە؟ ئایا من ترسناکتر و تاوانبارتم لەوان؟ ئەی کورەبچووکەکە غەیلان، ئەی کچە بچوکەکەم غەیدا، ئێوە خواتان هەیە، لێناگەڕێن لەبرسان بمرن، ئەگەر دادپەروەری مرۆڤ کەموکوڕی هەبێت، ئەوا دادپەروەری خوا کامڵە، خودا بەندەیەک لەو رزقە بێ بەش ناکات، کە بۆی نووسراوە.

لەئەلقەی یەکەمی ئەو زنجیرە وتارەدا باسی ئەوەم بۆ کردی، کە چۆن بوومە ئەندامی حزبی شیوعی، ئەو ناوە نهێنیەی بۆ خۆم هەڵبژارد جەریر بوو، ئەوکاتەی قوتابی قۆناغی دووەمی خانەی باڵای مامۆستایان بووم، کە ئەوکات خوێندن تێیدا بووە پێنج ساڵ، ساڵی یەکەمیش تێیدا بەساڵی ئامادەکاری ناوبرا، هەموو وانەکانیش بەئینگلیزی بوون لەمێژوو و جوگرافیاوە، تەنها عەرەبی نەبێت.دوای ئەو پشووی هاوین کۆتایی هات و خۆم بۆ سەفەری بەغدا ئامادەدەکرد، بۆ ئەوەی بچمە کۆلیژ، هاوڕێ ئەحمەد عەلوان ناسنامەیەک و راسپاردەیەکی پێدام، ئەحمەد بەرپرسی حزب بوو لەئەبو خەصیب، ئەو بەرەگەز ئێرانی بوو، ماوەیەک لەگەڵ تودەدا کاری کردبوو، دواتر لەزیندانی نوگرە سەلمان کوژرا، نامەکانی هاوڕێ ئەحمەدم گەیاندە حوسێن شەبیبی و شیوعییەکانیش رێکاری خۆیان ئەنجام داو بەئەندامەکانی خۆیان راگەیاند لەخانەی باڵای مامۆستایان کە من لەوانم و شیوعیم.

لەو خانەیەدا جاسم حەمودی منی بینی، کە ئەوکات قوتابی پۆلی چوارەم بوو، بەخێرهاتنی کردم لەوەی کە من بوومە یەکێک لەوان، لەو ساڵەشدا بەرپرسانی ئەوکات هەندێک مافی دیموکراسیانەیان بەقوتابیان بەخشی و مافی پێکهێنانی یەکێتیشیان بەقوتابیان دا، ئێمە لەهەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا چالاکییەکی زۆرمان نواند، هەرچەندە قوتابیانی شیوعی ئەوکاتە ژمارەمان زۆرکەم بوو، کە لەنێوان پەنجا یان شەست تێپەڕی نەدەکرد.

هەموو ژنییەکمان دەژەند بەمەرجێک ئاوازەکەی لەگەڵ ئەوەی ئێمە دەمانەوێت ڕێک بێت، لەنێو قوتابیانی کورد ئەوەمان بڵاودەکردەوە، کە قەومییەکان ڕقیان لەکورد و نەتەوەکەیانە، خۆشمان وا دادەنا کە برای ئەوانین، تەنانەت لەپێش ئەوان جوێنمان بەعەرەب و نەتەوەکەیان دەدا، عەرەبیشمان بەکەمدەزانی و مەزەندەی ئەوەمان دەکرد کە مێژووی عەرەب شتێک نییە جگە لەچەندین کوشتارگە و مەجزەرە، سەرۆکەکانی عەرەبیش چەند دەرەبەگێکی ناپاکن و جەلادیشن.

دەچووینە لای برایانی جولەکەش، بەڵام ئەوان خۆیان شیوعی بوون و پێویستیان بەپڕوپاگەندە نەبوو، جیا لەمەش لەژێی تایفیشمان ژەنی، بانگەشەی ئەوەمان دەکرد کە دەبێت ئەندامانی یەکێتیەکەمان لەلایەنگرانی فڵانە مەزهەب بێت، سەرەڕای ئەمەش هەندێک لەهاوڕێیانی کچمان بەکارهێنا بۆ ئەوەی کاریگەریان بەسەر بەشێکی دیکە بکەن، من خۆم بۆ قوتابیانی ساڵی دووەم کاندید کرد، لەهەڵبژاردنیش سەرکەوتم، ئەمەش لەبەر ئەوە نەبوو کە شیوعی بووم، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە لەلایەن قوتابیانەوە زیرەک و خۆشەویست بووم و برادەری هەموو قوتابییەکان بووم.

یەکێکی دیکە لەناو سەرکەوتووەکان سەلاح خالص بوو، کە خۆی بۆ پۆلی سێیەم کاندید کردبوو، دەبوایە لەنێو خۆماندا سەرۆک و جێگری سەرۆک و سکرتێر هەڵبژێرین، پەیوەندی لەنێوان براوەکان دروست بوو، خالص خۆی بەسەرۆکی یەکێتییەکە دەزانی، ئێمەش بەڵێنمان پێدا کە بۆ ئەمە هەڵیدەبژێرین، بەڵام من و جاسم حەمودی کە بەنوێنەری پۆلی چوارەکان دەرچوو بوو کۆبووینەوەو بڕیارمان دا کە سەلاح خالص بۆ سەرۆکایەتی نابێت، چونکە دەبێت سەرۆک لەئێمەی شیوعی بێت، سەلاحیش ئەوکات ئەندام یان لایەنگری حزبی

نیشتمانی دیموکراسی بوو، بۆیە جاسم پێشنیاری کرد کە من سەرۆک بم، چونکە بەقسەی خۆی من خۆشەویستی زۆرینەم.

بەمشێوەیە من بوومە سەرۆکی یەکێتییەکە، جاسم حەمودیش بوو بەجێگری سەرۆک، بەڵام لەراستیدا، ئەو سەرۆکی راستەقینە بوو، پلەی حزبی لەمن گەورەتر بوو، هەروەها پەیوەندی نێوان ئێمە و حزب لەرێگای ئەوبوو، لەوانەیە تۆ بپرسیت ئەگەر جاسم حەمودی پلەی حزبی لەتۆ گەورەتربێت و ئەو سەرۆکی راستەقینەی ئیتیحاد بێت، ئەی بۆچی بەناویش سەرۆک نەبوو؟

ئەو دەیوست لەسێبەر بمێنێتەوەو من لەبەر رۆشنایی بم، لە کاتی قوربانیش من قۆچی قوربانی بم، چونکە سەرۆکایەتی ئیتیحاد لەهەموو ئەندامەکانی زیاتر ئەرک و بەرپرسیارێتی لەسەرە، زەرەری حزبیش لەفەسڵکردنی موعتەدەکەی زیاترە، نەوەک لەفەسڵکردنی من، کە ئەندامێکی ئاساییم.

ئەوەی ئیعترافەکانی جاسم حەمودی لە(الموسوعە) بخوێنێتەوە، کە لەلایەن دائیرەی تەحقیقاتی جینائی کاتی خۆی چاپ کراوە، دەزانێ حزبی شیوعی چ رۆڵێکی لەمانگرتنی قوتابیان بینیوە لەساڵی ١٩٤٥. لەدوای تەواوکردنی خوێندن هاورێ جاسم دەستگیرکرا، هەموو زانیارییەکی درکاند کە لەلای هەبوو، وەک دەیان هاورێی خەباتکاری دیکە، بۆچی ئیعتراف نەکات؟ بەر لەو مالک سەیف ئیعترافی کرد، کە سکرتێری حزب بوو، یەهودا سدیقی جولەکەو رەفیق چالاکیش بەهەمان شێوە، رەفیق چالاک ئەویش سکرتێری حزب بوو، لەدوای مالک سەیف، ئەوکات مەنشوریەکی بڵاوکردەوەو گوتی "دووپشکەکانی مالیک سەیف ئێستاش لەناو حزبمان هێلانە دەکەن، پێویستە بەسەریاندا زاڵ بین، خیانەتی مالیک سەیفیش دووبارە

نابیتەوە". بەڵام سەرەڕای ئەو پاڵاوانەتیەش خیانەتی کردو وەک پۆلیس لەتەحقیقاتی جینائی کاری دەکرد.

ئەگەر پاساوێک بۆ خیانەتەکەی مالیک سەیف هەبێت، کەلەیەکێک لەئەلقەکانی داهاتوو باسی دەکەم، ئەوەبوو گوایە دەبێت وڵات لەجولەکان رزگار بکات، چونکە ئەوکات بەسەرحزبەوە زاڵبوون و لەسەروبەندی جەنگی فەلەستین کاریان بۆ ئەوەدەکرد، کە لەسوپا بدەن، چونکە بۆ فەلەستین دەجەنگێ، جا ئەگەر ئەمە پاساوبێت بۆ ئیعترافەکانی مالیک سەیف، ئەوا ئیعترافەکانی رەفیق چالاک هیچ پاساوێکی نییە، رەفیق چالاک لەیەکێک لەگەڕەکەکانی جولەکە دەستگیر کرا، وا خۆی نیشاندا بوو کە ئیغاهامە واتە ئیبراهامەو جولەکەیەکی هەژارە، بەڵام دوای ئەوەی دوو حەیزەرانی بەردەکەوێت بەزمانی کوردی هاواردەکات دەڵێ "زانم". بەمانای ئەوەی دەزانی و هەموو شتەکانی کە دەیزانی ئیعترافی کرد. ئەمە پاڵەوانێتی هاوڕێیان و حزبە ئامادەکەیانە لەو مێژووەی کە لەحزبی لادینییەوە دەست پێدەکات و لەکوشتارگەکەی کەرکوک کۆتایی دێت.

وەک نەریتی شوعییەکان لەهەموو کات و شوێنێکدا (بێگومان جگە لەوڵاتانی شیوعی) هەوڵما دەدا پەیوەندی بەقوتابیانەوە بکەین و گیانی یاخیبوون و بێزاربوونیان لەلا دروست بکەین، وایان لێبکەین کە بەکاری خراپ هەڵسن لەسیستەمی خوێندندا، بەهاریکاری هاوڕێیانمان لەقوتابیانی شیوعی لەپۆلە ئامادەکارییەکە سەرکەوتین لەمەدا، قوتابیانمان لەدژی ئەو ساڵەزیادەیە هان دەدا.

ئەمجۆرە قسانەمان بڵاو دەکردەوە: خوێندن لەهەموو کولیژەکان چوار ساڵە جگە لەکۆلیژی پزیشکی، کەچی خانەی مامۆستایانیش چوارساڵ زیاترە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرچووانی ئەوخانەیە مووچەکانیان بەقەد مووچەی کولیژی ماف نابێت، کە تەنها چوار

ساڵ دەخوێنن، لەو پلانەمان سەرکەوتین، قوتابیانی پۆلی ئامادەکاری مانیانگرت و داوایان دەکرد خوێندنەکەیان بۆ بکرێتە چوار ساڵ، لەو بەشە ناوخۆییە سەربەخۆیەش بگوازرێنەوە، بۆ ئەو بەشە ناوخۆیەکەی کە قوتابیانی بەشەکانی دیکەی تێدایە، جگە لەبەشی زمانی ئینگلیزی، کە لەبنەڕەتدا بەوشێوەیە دانراون بۆ ئەوەی فێری ئەو زمانە گرنگە ببن، قوتابیانی مانگرتوو لەباخچە گشتییەکەی مەعرەز کۆدەبوونەوە، یەکێک لەئەندامانی ئیتیحادیش کە شیوعی بوو لەنێویاندا قسەی بۆ دەکردن و هانی دەدان دەست بەداواکانیانەوە بگرن و لەمانگرتنەکە بەردەوام بن.

جاسم حەمودی فەرمانی پێکردم کە من وەک سەرۆکی ئیتیحاد سەردانی ئەو قوتابیانە بکەم لەباخچەکەو وتاریان بۆ بدەم، منیش پێشوازیم لەو بیرۆکەیەکرد، چونکە ئارەزووی بینینی خاتوو(ل)م دەکرد، کە ئەوکات قوتابی پۆلی ئامادەکاری بوو، خۆشم دەویست. منیش چوومە باخچەو قوتابیان بەچەپڵە و هوتافکێشان پێشوازیان لێکردم و چوومە سەر قەنەفەکان وەستام و وتارم بۆ خوێندنەوە، بەڵێنی ئەوەشم پێدان کە ئیتیحاد بەیاننامەیەک دەردەکات و پشتگیری مانگرتنی ئەوان دەکات و داواش لەقوتابیانی دیکە دەکات مانبگرن، ئای کە ئاسودەییەکەم مەزن بوو، کە بینیم ئەو کیژۆڵە خۆشەویستەم بەحەماسەوە چەپڵەم بۆ لێدەدا، ئەو پێشکەوتنخواز بوو، لەوانەیە هەستی بە(پێشکەوتووخوازی) وتارەکەی منیش کردبێت.

ڕۆژی دواتر، من وەک سەرۆکی ئیتیحاد بەیاننامەیەکم دەرکرد، تێیدا پشتگیری قوتابیانی مانگرتووم کرد، داواشم لەقوتابیانی دیکە کرد پشتگیریان بکەن، بارودۆخەکە لەکۆلیژ شڵەژا، جێگری ڕاگر کە دکتۆر عەبدولعەزیز دوری بوو، داوای کرد کۆبوونەوەی لەگەڵ بکەین بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە، لەو کۆبوونەوەیە بەئەنقەست سوکایەتیمان

بەمامۆستا جەلیل کردو بەسوک مامەڵەمان لەگەڵ دەکرد، ئەو هەڵسوکەوتە هیچ و پوچانەی ئێمەی بەلێبوردنێکی بەرزەوە وەرگرت، نەگەیشتینە رێکەوتن، لەڕۆژی دواتر کۆلێژ نیمچە مانگرتن بوو، زەنگی وانە لێیدا، راگر کە دکتۆر خالید هاشمی بوو هاتە دەرەوە بۆئەوەی بارودۆخەکە بەسەر بکاتەوە، بینی یەک لەسێ قوتابیان لێرەو لەوێ و لەمەمەڕەکان و باخچەکان کۆبوونەتەوەو نەچوونەتە وانەکانەوە، بۆیە فەرمانی پێدەکردن کە بچنە وانەکانیانەوە زۆرینە گوێڕایەڵی بوون، کاتێک لەڕێگای خۆی بەلای کچێکەدا تێپەڕی و داوای لێکرد بچێتە وانەکەی، کچەکەی بەگاڵتەوە گوتی "ناوەڵا، دەست بۆ ئاسمان ببە، نزیکترە لەمە". راگریش لەو بێئەدەبییە توڕە بوو، توڕە بوو زلەیەکی لێدا، ئێمە هەڵساینەوەو ئەو قوتابیەمان کردە مەسەلەی کراسەکەی عوسمان و بەمەش سەرکەوتین لەوەی هەموو قوتابیان مانبگرن.

ئەنجومەنی مامۆستایان بڕیاری دا من و جاسم بۆ ماوەی هەفتەیەک لەخانە دووربخرێینەوە، بۆئەوەی بتوانێت لێکۆڵینەوە لەڕووداوەکان بکات، من چوومە یەکێک لەهۆتیلەکان، لەشانۆی رووداوەکان دوورکەوتینەوە تا مانگرتنەکە کۆتایی هات و قوتابیان گەڕانەوە دەرسەکانیان، ماوە ئەوە بڵێم ئێمە لەماوەی ئەو مانگرتنەدا پەیوەندیمان بەگەلێک رۆژنامەوەکرد بۆ ئەوەی پاڵپشتیمان بکەن، بەڵام هەموویان ئەمەیان رەتکردەوە، تەنانەت یەکێک لەخاوەنی رۆژنامە پێشکەوتنخوازەکان پێی راگەیاندین کە ئەوخەمبارە بەبارودۆخەکە، بەڵام خالد هاشمی هاوڕێیەتی و ئەو شانازی بەو برادەرایەتییە دەکات، بۆیە ناتوانێت پشتگیریمان بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا هاوسۆزییەکمان لەڕۆژنامەی الساعە بینی، کە هەموو دەیانگوت رۆژنامەیەکی تایفییە، ویستمان ئەمە بقۆزینەوە بۆیە چووینە لای بەڕێوەبەرانی الساعە، یەکێک لەوان حوسێن مەروەی

خەباتکاربوو، کە ئەوکات کەسێکی تایفی بوو، وام تێگەیاندن کە ئەو مەسەلەیەی ئێمە هەرگیز پەیوەندی بەشیوعیەتەوە نییە، بەڵکو ئەمە ململانێی نێوان سوننە و شیعەیە، ئایا ئەو چەپەڵیەی ئێمە دەبینی، کە گوایە ئێمەی شیوعی دژی جیاکاری ئایینی و دژی رەگەزپەرستین؟ جا هاوڕێ حوسین (ببورن ئەوکات نەببوو بەهاوڕێ) لەمنی پرسی: تۆ شیعی؟ منیش گوتم: بەڵێ. بەڵام ئەوجارە گوتی: بەڵام دەڵێن تۆ شیوعی؟ منیش گوتم: پیتی واویان خستۆتە سەر هەقیقەتەکە.

دوای دوو هەفتە مانەوەم لەهوتێل و خواردنم لەچێشتخانەکان، تا بەتەواوی موفلیس بووم، حزب بەرێگای جاسم حەمودییەوە دینارێکی وەک هاوکاری بۆ ناردم، ئەوکات ئەگەر هەستم بەکەرامەت دەکرد، ئەو هاوکارییە بێمانایەم رەتدەکردەوە، بەڵام هەر بەخشینێکی حزبم بەسەرکەوتن دەزانی لەوەی من وەک شیوعییەک ئەرکی خۆم لەبەرامبەر حزب بەجێگەیاندووە، بەمشێوەیە ساڵێک یان ساڵانێک لەژیانم بەفیڕۆ چوو لەپێناو هاوڕێیانی خەباتکار.

خوێنەری ئازیز لەژمارەی رابردوودا باسی ئەو مانگرتنەم بۆ کردی، کە وەک جێبەجێکردنی فەرمانەکانی حزبی شیوعی لەخانەی باڵای مامۆستایان پێی هەڵساین، چۆن پەنامان بردە بەر هەموو هۆکارێک بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان، پەنامان بردە بەر رەگەزپەرستی و کەمینەکانمان لەدژی عەرەب و نەتەوەکانی دیکە هاندەدا، پەنامان بردە بەتایفەگەری و تەنانەت دەستمان بۆ سێکسیش برد، هاوڕێ قەشەنگەکانمان دەناردە لای قوتابیان بۆ ئەوەی بۆ ریزەکانی ئێمەیان راکێشن، قسەی ئەوەشم بۆ کردی کە ئەنجومەنی مامۆستایان بڕیاری دەرکردنی منیان دا بۆ ماوەی ساڵێک، منیش گەڕامەوە گوندەکەم بۆ ئەوەی ئەم ساڵە بەسەر بەرم.

ئەو چەند مانگەی لەلادێ بەسەرم برد، پڕچالاکترین مانگەکانی من بوو بۆ کاری حزبی، خەباتم بەردەوام بوون بۆ ئەوەی ئەو جوتیار و لادێییە سادەو ساکارانە بهێنمە ریزەکانی حزب.

من و مامم عەبدولحەمید کە موعتەمەدی حزب بوو لەئەبو خەصیب لەگەڵ کەسێکی نزیکمان کە ناوی عبدالدائم بوو، چەند کۆبوونەوەی عەرەقخواردنەوەمان لەگەڵ جوتیارەکان دەبەست، جوتیارەکانیش کە دەیانبینی ئێمە دەچینە کۆخەکەی ئەوان و لەگەڵیان دەخۆینەوەو

لەدڵەوە قسەیان بۆ دەکەین، بەعەقڵی ئەوان ئەمە کارێکی باوەڕپێنەکراو بوو. بۆیە وا وێنایان دەکرد کە ئێمە سادە و دیموکراسین، هەرچەندە کوڕی خێزانێکین کە خاوەن بێستانی خورما و سامانێکی گەورەیە لەلادێ، هەرچەندە لەڕاستیشدا وەهانەبوو.

ئێمە لەگەڵ ئەوان پەنامان بردە بەر فێڵ و هەڵخەڵەتاندن، ماقوڵ نییە بۆ جوتیارێکی سادە بنەماکانی مادەی دیالیکتیکی شرۆڤە بکەین و بڵێین مادەیەی یەکەمی ئەو فەلسەفەیە بریتییە لەڕەتکردنەوەی عەقڵی رەها و مادە بنەڕەتی شتەکانەوە، ئەمەش لەڕاستیدا ئینکارکردنی وجودی خودای پەروەردگارە، بەمەش هەموو ئەو بیروباوەرە روحیە لەجوتیارەکان دادەماڵین کە باوەڕیان پێیە.

بەڵکو گوتمان شیوعیەت، هەوڵدەدا هەموو جیاوازییەکان لەنێوان خەڵک پوچەڵ بکاتەوەو کەسێک نەمێنێت لەکەسێکی دیکە باشتر بێت، هەوڵیش دەدات کە زەوی بەسەر جوتیارەکان دابەش بکات، من کاتێک ئەوە دەگێڕمەوە، سەرم لەو چەپەڵییەی خۆمان سورڕدەمێنێ، چونکە ئەو موڵکدارانەی کە لەبەسرا و ئەبو خەصیب بێستانی خورمایان هەیە لەڕاستیدا ئەوانیش هەژارن و یان لەچاکترین حاڵەتدا داهاتیان مامناوەندە، چەند کەسێک لەوان نەبێت داهاتی ساڵانەیان دەگەیشتە ٦٠٠ دینار. کەواتە ئەو موڵکدارەی ئێمە بەدەرەبەگێکی ناپاک و ستەمکار و خوێنمژمان لەقەڵەم دەدا، داهاتی مانگانەی ٥٠ دینار بوو، کەچی داهاتی فەرمانبەرێکی مامناوەند لەمانگێکدا زۆر لەمە زیاتر بوو، موڵکدارەکانی دیکەش داهاتی ساڵانەیان ئەوەندە هیچ بوو، کە بەشی پێداویستییەکانیانی نەدەکرد .

بەمشێوەیە لەدەروونی جووتیارەکاندا ئەو ژنێیە هەستیارەمان دەژەنی، ئەویش برسیەتی ئەوان بوو بۆ زەوی، ئەو برسیەتیە ترسناکەی کە لەباوک و باپیریانەوە بۆیان جێمابوون لەسەرابە سوورەکەی شیوعیەت، ئامانجەکەی خۆی دۆزییەوە، ئەو دەروازەیە بوو بۆ کردنەوەی خەمەکانیان.

جووتیارەکان دارخورمایان لەو بێستانانە نەڕواندبوو، هیچ کۆششێکیان بۆ ئەوە نەکردبوو، کە کەنارە لیتەییەکانی شەتولعەرەب بکەنە کێڵگەی سەوز، بۆیە ئەوان هیچ مافێکیان لەو بێستانانە نەبوو، بۆیە ماقوڵ نەبوو، ئێمە بەڵێنمان پێدەدان، کە کار بۆ زێدەکردنی بەشەکانیان دەکەین لەبێستانی خورمادا، کەچی ئێمە لەوکارەدا زۆر بەخشندەبووین، دیارە بەخشندەیی بەبەڵێن هیچترین جۆری بەخشندەییە، لەهەموویان زیاتر کەم خەرجیتر و کەم ماندووبونە.

ئەو بەڵێنە سەوزانە لەناو جووتیاران شوێنی خۆی لەهەست و نەستیاندا داگیرکرد، لەبیرمە شەوێک لەمانگەشەوی هاویندا، دانیشتنێکی خواردنەوەمان ئەنجام دا، دانیشتنەکەمان لەپانتاییەک بوو کە بەدارمێو داپۆشرابوو، لەو بێستانەی کە حەمەد کاری تێدا دەکرد، توانیبوومان حەمەد بێنینە ناو ریزەکانی شیوعی، حەمەد زۆر خراپ سەرخۆش بوو، خراپی ئەو عەرەقەی دەمانخواردەوەو گەرمای هاوین دوو هۆکار بوون بۆ ئەم سەرخۆشییە، جا حەمەد دەستی کرد بەهورێنەی خەون و ئاواتەکانی، بەزمانێکی قورسی سەرخۆشانە گوتی "بەڵێ من شیوعیم، دایکم شیوعیە، باوکم شیوعیە. بەڵێ دوێنی چوومە لای محەمەد سەعید. ئەو محەمەد سەعیدە خاوەنی بێستان

بوو. گوتی وەرە لێپێچنەوەم لەگەڵ بکەو وەرە نرخی ئەو خورمایە ببە کە لەبێستانەکەم فرۆشتوومە، منیش پێمگوت: کامە خورما و کامە بێستان؟ گوتی: ئەو بێستانەی وەک جوتیارێک کاری تێدا دەکەیت. منیش پێکەینم و وەڵامم دایەوە: هیچ بێستانێکت نییە، من جووتیارم و بێستانیش بێستانی منە. کاتێک بینیم پەشۆکاوە، من گووللەی سایرم لێدا_ سایر وەک خوێنەران دەزانن جۆرێکە لەخورما- نەمرد، دواتر دەمانچەکەم پڕکرد لەفیشەکی حەلاوی- حەلاوی چاکترین جۆری خورمایە- بەکوژراوی بینیم خەڵک و پۆلیس دەوریان دام و دواتر لە زیندانی ژنان زیندانیان کردم، لەو زیندانەدا رۆژانێکی پڕ چێژم بەسەربرد، ئەوە بێنە پێشچاوی خۆتان حەمەد لەگەڵ سەدان ژنی شۆخ؟

ئەو خەونانەی حەمەد هیچ جیاوازی لەگەڵ خەونی شیوعییەکانی دیکە نەبوو، دزین و بردنی ماڵی خەڵک و کوشتن و هەتککردنی ئابڕووی خەڵک. ئێمەی شیوعی لەماوەی چەند مانگێکدا دێوەزمە سورە ترسانەکەکەمان بینی، کە یەک لەدوای یەک ئەو خەونانەیان بەدی دەهێنان، بینیمان ماڵ و دوکانیان تاڵان دەکرد، بینیمان کوشتیاریان ئەنجام دەدا، بینیمان چەندین بەدڕەوشتیان ئەنجام دا کە قەڵەم نایەوێت باسیان بکات.

پەیوەندیمان لەگەڵ جووتیاران خاڵی نەبوو لەبارگرانی ئەوان، هەرکە دەچووینە لایان داوای ئابوونەمان دەکردو داوای بەخششمان دەکرد بۆ حزب، ئەو جوتیارەی کە بەدرێژایی ساڵ زیاتر لە ١٢ دیناری دەستناکەوێت، ئەستەمە بتوانێت سەد فلس بەو حزبە بدات.

وەک بیرم بێت لەو ساڵە بوو کۆمەڵەی زایۆنیزمی شیوعی دروست بوو، کە ئەو کات ناونرابوو کۆمەڵەی بەرەنگاربوونەوەی زایۆنیزم، ئەمە بۆ برایانی حەسقیلی جەژن و سەرکەوتن بوو، کە بتوانن کۆمەڵەیەک دابنێن خزمەتی مەبەستە زایۆنییەکانیان بکات، بەسراش خاڵی نەبوو لەچالاکی ئەو کۆمەڵەیە، لەبەسرا ژمارەیەکی زۆر جولەکە هەبوو، کە هەلی زێرینی وەهایان دەقۆستەوە.

من وەک شاعیرێکی شیوعی، ئەو رووداوە بێمانایانە کە کرێکارەکان لەمانگرتن ئەنجامیان دەدان، تا ئەو خۆپیشاندانانەی کە شیوعییەکان ئەنجامیان دەدا، هەستی شاعیرێتی شوعییەتمی دەبزواندو چەند قەسیدەیەکی درێژم لەسەر دەنووسی.

کاتێک یەکێک بەراورد لەنێوان ئەو شیعرانە دەکات، کە لەلایەن شاعیرانی گەورەی غەیرە شیوعی نووسراون، لەگەڵ ئەو شیعرانەی لەلایەن هاورێیانی شیوعیەوە نووسراوە، سەری لەو هەستە سوردەمێنێت، کە ئەو خەڵکانە بۆی دابەزیون و مافی ئەوەشیان نییە ناوی شاعیر لەخۆیان بنێن.

من قەسیدەی سوورم دەنوسی و بۆ بەغدا بۆ هاورێیانی گەورەم پۆست دەکرد، بۆئەوەی پارێزەر هەمزە سەلمان لەئاهەنگەکانی کۆمەڵەی زایۆنیزم لەجیاتی من بیانخوێنێتەوە، ئەو قەسیدە بێمانایانە کە من ئێستا گلەیی لەخۆم دەکەم کە نووسیومە، کەچی سەرسامییەکی زۆر و چەپڵەرێزانی بۆ دەکرا.

جولەکەکانی بەسرا و هێزەکانیان کۆبوونەوە، بڕیاریان دا ئاهەنگێک بەناوی کۆمەڵەی جولەکە بکەن، منیش داوەت کرام بۆ ئەوەی بەقەسیدەیەک لەقەسیدەکانم بەشداری لەو ئاهەنگە بکەم، بەرەو بەسرا بەرێکەوتین، لەیەکێک لەقوتابخانە سەرەتاییەکان ئاهەنگەکە ئەنجام درا، کە بەڕێوەبەرەکەی لەهاوڕێیان بوو، یان کەمێک سۆزی بۆ ئەوان هەبوو، من قەسیدەکەم خوێندەوە، بەشێوەیەک سەرکەوتوو بووم، کە پێشبینیم نەدەکرد، دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە هاوڕێیانی حەسقیلی ئەنوەر و ئەدوەر و نەعیم و موسا ئێمەیان بردەوە یەکێک لەماڵەکانیان، لەوێ راستیل هات، کە کیژۆڵەیەکی جوانی جولەکە بوو، خوشکی یەکێک لەهاوڕێیان بوو، راستیل مەشروب و پەرداخ و قاپە مەزەکانی هێنا، ئێمەش دانیشیتن خواردمانەوەو جوێنمان بەعەرەب و قەومییەتەکەی و دینەکەی دەدا. ستایشی خەباتی برایانی جولەکەمان دەکرد، دەشمانگوت جولەکە ناتوانێت بەشادی بژی و هەست بەکیانی مرۆڤانەی خۆی بکات، تەنها لەکۆمەڵگای شیوعی نەبێت. چەند خۆشی ئەی شیوعیەت: ئاهەنگ و چەپڵەلێدان. مەشروب و مەزە و ئێوارەخوان، کچێکی جوانیش لەگەڵمان دادەنیشێت و قسەمان لەگەڵ دەکات و مەکروناز دەکات و هەموو شێوازێکی ناپاکی جولەکانە بۆ تێکدانی ئاکارمان بەکاردەهێنێت.

رۆژگاری دڵسۆزی جولەکەکانی بۆ نیشتمانەکەیان سەلماند، ئەوان دڵسۆزی نیشتمانە نەتەوەییەکەی خۆیانن. کاتێک هەڵاتبوومە ئێران لەتاران بینیم کە سەرۆکەکانی کۆمەڵەی بەرەنگاربوونەوەی زایۆنیزم، رێکخراوێکی زایۆنیان دروستکردووە، رۆژنامەیەکی چەپەڵشیان بەناوی جیهانی جولەکە دەردەکرد، کە زمانحاڵی ئەوان بوو، تەنها

یەکێکیان نەبێت کە ناوی نەسیم بوو، من تەنها بەدەموچاو و ناوی یەکەم ئەوم دەناسی، نەمدەزانی نازناوی چییە، ئەو تەنها لایەنگری تودە بوو. کەچی هاوڕێیانی تودە لەنەسیم ئاگاداریان کردمەوەو گوتیان: هاوڕێی عەرەب لەلای ئاغای نەسیم هیچ پیتێک مەدرکێنە.

هەموو هاوڕێیانی شیوعی جولەکە ڕەگەزنامەی عێراقیان سقوت کرا، هەندێکیان بەرەو ئیسرائیل ڕۆیشتن و هەندێکین بەرەو ئێران، ئێستاش خەریکی چالاکییەکانی زایۆنیزمن، هەموویان ڕۆیشتن تەنها یەک هاوڕێ نەبێت، ئەویش یەعقوب مسری بوو، کە دواتر ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاندو ناوی خۆی کردە عادل مونیر، ئەمڕۆ ئەو ئەندامی لیژنەی محەلییە لەکەرکوک، ئایا بەرپرسان لێکۆڵینەوەیان لەڕۆڵی ئەو جولەکە موسڵمانە کرد، لەڕووداوە ترسناکەکانی کەرکوکدا؟

بەلام ڕۆڵەکانی گەل کوڕە شێلیگرەکانی عێراق هەردەم ڕقیان لەجولەکەبوو و گومانیان لێکردوون. ڕۆژێک مەجیدی مامم بڵاوکراوەی کۆمەڵەی زایۆنیزمی لەناو بازاڕی ئەبو خەسیب دابەش دەکرد، عەلاگەیەکی بەدەستەوە بوو، لەقاوەخانەیەک کەسێک بانگی دەکات و دەڵێ "خەواجە بڵاوکراوەیەکم بدێ". بەجولەکەی دەزانێ، چونکە لەباوەڕی گەلە مەزنەکەی ئێمە نەبوو، کە عەرەبێکی موسڵمان خزمەتی کۆمەڵەیەکی تاوانکاری زایۆنیزم بکات، بەلام ئێمە وابووین، بەداخەوە خزمەتمان کردن و ئێمەش ملکەچبووین.

زۆرن ئەو شەوانەی کە خەو لەچاوەکانم دەزڕێ، شتێکی هاوشێوەی خەون دەبینن، مندالانی عەرەب بەڕیز وەستاون، دەست و قاچ و

روخساریان بەخوێنە، بەچاوێکی سەرزەنشتەکەر لێم دەڕوانن و دەڵێن: بۆچی؟ بۆچی؟

بەڵێ خزمەتی زایۆنیزمان کردو خیانەتمان لەنەتەوە و مەسەلەی نەتەوەکەمان کرد، لەوکاتەی کە وێنای ئەوەمان دەکرد، کە گوایە خزمەتی گەل و نەتەوە دەکەین.

بیرمە جارێک من لەزیندانی سەرای دەستگیرکرابووم، لەژووری گرتنەکەمدا پێنج یان شەش جولەکەی لێبوو، یەکێکیان ئەو هاوڕێیە بوو کە دواتر لەوکاتەی کە جەنگی چارەنووسی لەدژی جولەکە دەکرد، ئەوکرایە سکرتێری حزبی شیوعی، لەو گرتووخانەیە سێ عەرەبی فەلەستینیان هێنا، کە ئەوکات بەچەکەوە هاتبوونە عێراق، چونکە وەک سەرکردەکانی ئەوکات بانگەشیان بۆ دەکرد، عێراقیان بەسەرچاوەی عروبە زانیبوو، کەچی دەستگیرکران و بڕیاری دەرکردنیان بۆ دەرەوەی سنوور بۆ درابوو، هاوڕێیانی جولەکە بۆ موجاهیدەکانی عەرەبی فەلەستینیان ڕووندەکردەوە، کە چۆن جولەکە خاوەن مافن لەفەلەستینی عەرەبی، ئەمەش بەپێی دیالکتیک و پێناسەی هاوڕێ ستالین بۆ نەتەوەخوازی، چونکە ئەو گەلەی لەسەر یەک خاک دەژین و بەزمانێک قسەدەکەن و ئابوورییەکی هاوبەشیان هەیە لەگەڵ مێژوویەکی هاوبەشن، نەتەوە پێکدەهێنن.

لەبەرئەوەش کاتێک ئەو سیفەتانە لەسەر جولەکەی فەڵەستین بەدیدێت، کەواتە ئەوان نەتەوەن، ئەمەشیان فەرامۆش دەکرد کە ئەو جولەکانەی لەهەموو شوێنەکانی زەوییەوە هاتوون، بەسەدان زمان قسەدەکەن، ئەو مێژووە هاوبەشەی هەیانبوو ئەوا بەرلەدوو هەزار

ساڵ بوو، کەچی دواتر چارەنووس و مێژوویان جیاجیابوو، بەڵام دەوڵەتە ئیشتراکییەکان ئیسرائیلیان لەباوەشگرت و بۆیە پێویستە شیوعییەکانیش بەعەرەبەوە ئیسرائیل لەخۆیانەوە بگرن.

لەژمارەی پێشوو باسی ئەو ساڵەم بۆ کردی کە لەلادێ بەسەرم برد، کاتێک کە لەخانەی باڵای مامۆستایان دەرکرام، باسی ئەو خەباتەشم بۆ کردی کە لەپێناو بڵاوکردنەوەی بیرە رووخێنەرەکەی شوعیەت و راکێشانی خەڵک بۆ ناو حزبەکەمان ئەنجامم دەدا، ئێستاش باسی دیارترین رووداوی ئەو ساڵە دەکەم، کە ئاماژەیە بۆ هیچوپوچی ئەدەبی شیوعی، بەتایبەتی شیعری شیوعی، ئاماژەیە بۆ هیچی ئەو چەپڵەلێدانەی کە ئەو شیعرە لەلایەن جەماوەر دەیوروژێنێت، بۆ وشەی "جەماوەر" رووداوێکی خۆش هەیە، بەکێشەی نازانم ئەگەر ئەو بەسەرهاتە لەسەرەتای ئەو وتارەمدا بگێڕمەوە.

هاولاتییەکی عێراقی هەبوو کە خەڵکی کوردستان بوو، بەشداری لەخۆپیشاندانێک کردبوو، کە شیوعییەکان رێکیان خستبوو، بەو تۆمەتە ئەنجومەنی عورفی، حوکمی چەند مانگێک بەندکردنی بۆ دەرکردبوو، ئەو شیوعی نەبوو، بەڵکو هاولاتییەک بوو ولاتەکەی (العراق) خۆشدەویست و دڵسۆز بوو بۆی، بینی ئەو چەند مانگ بەندکردنە زۆرەو بەرگەی ناگرێت، بۆیە دەستی بەنوزەنوزێکی شێوەی گریان دەیگوت: شەش مانگ؟ تەنها دوو مانگ بەسەرچووە، ئەویتر چۆن تێدەپەڕێت؟

هاورێیە شیوعییەکان کە زۆرینەیان لەحەسقیلییەکان بوون، بەو جۆرە وەلامیان دەدایەوە: دڵتەنگ مەبە، رۆژێک دێت جەماوەر رادەپەرێت و ئێمەش نەجاتمان دەبێت و بەسەرشانانەوە لەزیندان دەرماندەهێنێ، بەو قسە پڕوپوچانە رازی دەکەن و رۆژێکیش تەفرەی دەدەن بۆ

ئەوەی سردووە بەناوبانگەکەیان لەگەڵ بڵێتەوە "زیندان بۆ ئێمەی کۆڵنەدەر نییە، زیندان بۆ تاوانباری ستەمکارە."

ئەو بەستەزمانە ئەو سرودەیان لەگەڵ دەڵێتەوە، لەبەر خوێندنەوەی ئەو سرودەش دەدرێتە دادگا، حوکمی ٦ مانگی دیکە زیندانی بۆ دەدرێت، داڕووخا، بەڵام هاورێیان پێیان گوت "دڵتەنگ مەبە، رۆژێک دێت جەماوەر رادەپەرێت و ئێمەش نەجاتمان دەبێت و بەسەرشانانەوە لەزیندان دەرماندەهێنێ" بەو بەڵێنە شیرینانە ئاسودە دەبێت و دوای ماوەیەکی دیکەیش رازی دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵیان لەمانگرتنیک بەشدار بێت، ئەویش وەک ئەوانی دیکە بەشدار دەبێت و لەگەڵ دەسەڵاتدارانی زیندان تێککیر دەبن، مانگرتنی شیوعییەکان سەرکەوتوونابێ و بەشداربوونیش دەدرێنە دادگا، دادگاش حوکمی ساڵێکی دیکە زیندانی بۆ ئەو برادەرمان دەردەکات، ئەوجارە ئەو تەواو سەرگەردان دەبێت.

ئەو کاتێک هاتە زیندان بۆ شەش مانگ زیندانی کرابوو، ئێستا ئەوەبوو بەدوو ساڵ، بەئاشکرا باسی بێزابوونی لەزیندان و درێژبوونەوەی ماوەکەی دەکرد، هاورێیان دەیانویست خەیاڵی ئەو ئاسودەبکەن و دەیانگوت "دڵتەنگ مەبە، رۆژێک دێت جەماوەر رادەپەرێت و ئێمەش نەجاتمان دەبێت و بەسەرشانانەوە لەزیندان دەرماندەهێنێ". ئەو بەتورەیی هەڵدەچێت و هاوار دەکات: جەماوەر، جەماوەر، جەماوەر، ئەی لەکوێیە؟ بۆ نایەت و نەجاتم بدات؟

رۆژێکیان دەسەڵاتداران رۆژنامەی "عوسبە"یان راگرت، ئەو رۆژنامەیە لەلایەن عوسبەی زایۆنیزم دەردەچوو، دواتر بووە زمانحاڵی شیوعیانی جولەکە، من بەو نسکۆیە کاریگەر بووم، وەک شاعیرێکی شیوعی دڵسۆز قەسیدەیەکم نوسی کە تێیدا هاتووە:

**يا حابسين صحيفة الاحرار**

**لن يمنع القيد اشتعال النار**

**ان تحبسوها في نور ساطع**

**بين ضلوع، و صرخة استنكار**

دواتر ئەوەبوو کە یەکێک لەهاوڕێیان لەکرێکارانی شیوعی لەکۆمپانیای نەوت بەسەر دواتەقینەوەی نەوت بەسەری دا سوتا، ئێمەوە وەک شیوعیەکان بڕیارمان دا تەرمەکەی بنێژین و هەموو توانای خۆمان بۆ بەکارهێنا بەخۆپیشاندانێکی مەزنەوە بەرەو نەجەفی ئەشرەفمان برد، لەوێستگەی شەمەندەفەر لەیەکێک لەئۆتۆمبێلەکان سەرکەوتم و ئەو قەسیدەیەم خوێندەوە کە لەبارەی جەریدەی عوسبەوە بوو، لەگەڵ خەباتی ئەو رۆژنامەیەو مافی کرێکاران لەچینی پرۆلیتاریم لەکۆمپانیای نەوت بەیەکەوە بەستەوە، کە بەسەرپێچیم زانی بوو(ئەمەش ئەو رووادوە بوو وەک ئێستا دەزانم ئینسان دەسەڵاتی بەسەرەوە نییە) ئەمەش هوتاف و چەپڵەلێدان و ئامادەگی دروست ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە نیگەرانی کردم کە بینیم (جەهامیر- نەوەک جەماهیر) ئامادەیی بۆ شیعری نەتەوەیی نییە، چ لەڕووی روخسارەوە یان لەڕووی ناوەڕۆکەوە.

بەڵکو شیعری پروپوچیان دەوێت لەشێوەی ئەو شیعرە سیاسییە رێکخراوانە، ئەو کەسەی ئەو قەسیدە هیچە بخوێنێتەوە، کە شاعیری شیوعی نازم حیکمەت لەبارەی بۆمبی ئەتۆمی هیرۆشیما نووسیویەتی، ئەم قەسیدەیە لەکاتی بەرگریکردن لەئاشتی نووسراوە، دەزانێ ئامانجی یەکەمی شیوعییەکان لەدونیادا ئەوەیە کە دەڵێ:

**انني طفلة في هيروشيما**

**احرقت القنبلة شعري و عيني**

**واحالتني الي رماد**

**ان شبحي يزوركم الان ايها**

**الاحياو**

**طالبا اليكم ان تنقذوا بقية**

**الاطفال**

**من المصير المؤلم الذي صرت اليه**

ئەوەی ئەو قەسیدە پوچە بخوێنێتەوە، دواتر ئەو قەسدەیە بێوێنەیە بخوێنێتەوە کە خانمە شاعیری ئینگلیز ئیدیس ستویل نوسیویەتی، ئەو خانمە شاعێرێکی ئاینپەروەر بوون، جا خوێنەر سەری لەوە سوڕ دەمێنێت، کە قەسیدەی شاعیری شیوعی لەچاو ئەو شاعیرە ئینگلیزە چەند بچوکە.

من ئێستا لەخۆم دەپرسم: ئایا لەماوەی ساڵێکی تەواو کە شەو و رۆژ لەنێو جووتیارە سادەکانم بەسەردەبرد، لەخەبات سەرکەوتم؟ ئەگەر پێوەرەکە بەگوێرەی ژمارەی ئەو جووتیارانە بێت، کە هێنامانە ریزی حزبی شیوعی، ئەوە زۆر سەرکەوتوو بوو، بەڵام لێم گەڕێن با نموونەیەکتان لەنموونەی ئەو جووتیارانە بۆ بهێنمەوە کە تەفرەمان دابوون، بەوەی کە ببنە ئەندامی حزب و ئابوونە و کۆمەکێک بدەن کە ئەو پارانە چەند رۆژێک ئەوانی لەبرسیەتی دەرباز دەکرد.

جووتیارێک هەبوو لەجووتیارەکانی گوند ناوی (ح،س) بوو، ژنێکی جوان و دایکێکی کوێری هەبوو، ئەو جوتیارە نەخۆش کەوت و ناچار بوو لەنەخۆشخانە بمێنێتەوە، دایک و ژنە بەستەزمەنەکەیان بێکەس و بێ بەخێوکەرێک مانەوە، لەو ماوەیەدا حەمەدی جووتیار زۆر لەدانیشتنەکانمان ون دەبوو، ئەو جووتیارە بوو کە باسی خەونە مەستیەکانیم لەژمارەی پێشوو بۆ کردن، ئەو لەکۆبوونەوەکانمان ئامادە نەدەبوو، هەرچەندە ببووە یەکێک لەپەرۆشترین کەس بۆ شیوعیەت و حزبی شیوعی، ئەو حزبەی کە بەڵێنی پێدابوو سەرجەم خەونەکانی بەدی بهێنێت و بەڵێنی بەهەشتی سەرزەوی پێدابوون، ئێمە لەدیارنەبوونی حەمەد نیگەران بووین، بۆیە ویستمان مەسەلەکەی بزانین و بۆ کوێ دەچێت، ئایا دەچێ ترێ بدزێ؟ بۆیە شەوێک چاودێریمان کرد، من و مامم بووین بێ ئەوەی هەستمان پێ بکات، بینیمان لەماڵە چۆڵەکەی (ح) نزیک دەبێتەوەو دواتر دەستی بۆ گیرفانی بردو چەند جگەرەیەکی دەرهێنا و دایە دەست پیرەژنە کوێرەکە کە دایکی (ح) بوو، حەمەد گوتی "پورێ دایکی ح ئەمە جگەرەیە، ح برامانە، ئەمە ئەرکی ئێمەیە."

لەدڵەوە سوپاسی هاورێ حەمەدمان کرد بۆ ئەو هەستە نەجیبزادەیە، وانەکانمان بۆ ئەو بەرباد نەبوو، چونکە لەیەکێک لەو کۆمەڵە شتەی کە لەیەکەم چرکەوە فێرمان کردبوو کاتێک کە بەرەو خۆمان کێشا ئەوەیە بووکی هەژار برای هەژارە، جووتیار برای جووتیارە، ئەوەتا حەمەدیش هاوکاری دایکی برا جووتیارەکەی دەکات و کە نابینایە و بێ سەرپەرشتە، فلسێکی نییە بۆخۆی بە جگەرە بدات.

بەڵام وانەبوو حەمەدی هاوڕێمان، دواتر هەنگاوەکانی سووکتر کردو وەک دزێک، بەڵام چەپەڵترین دز، بەرەو ئەو جێیە چڵکنە دەچوو کە هاوسەرە جوانەکەی (ح) تێیدا دەنوست، بینیمان ئەو ناپاکی لەگەڵ براجووتیارەکەی دەکات کە لەنەخۆشخانەیەکی خۆڕایی خەوتووە، حەمەد بۆ ئەو کارە ناپاکە پشتی بەچەند جگەرەیەک دەبەست کە بە پیرژەنە کوێرەکەی دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەئەرکەکەی خۆمان سەرکەوتین، چونکە ئامانجی خەباتی ئێمە پەروەردەکردنی ئەندامانمان نەبوو بەئاکاری بەرز، بەڵکو ئامانجمان وروژاندنی چاوچنۆکی و کینە بوو لەلایان، کە حەمەدیش دڵی پڕ ببوو لەو دووانە، ئەوەتا لەیەکێک لەدانیشتەکانی مەستیدا خەونی بەوە بینی کە دەست بەسەر موڵکەکانی باپیرەم دەگرێ، کە خۆی کەمێکەو لەگەڵ مامیشم بەخشندە بوو لەو خەونەدا بۆیە حەمەد بەڵێنی پێدا کە موڵکەکانی باوکی پێدەدات.

شیوعیەت بەو شێوەیە تەنها ئەخلاقی جووتیارەکانی چاک نەکرد، بەڵکو ئەخلاقی ئێمەشی چاک کرد! ئێمە ئەندامانی لیژنەی محەلی حزب لەئەبو خەسیب، ئەمەش نموونەی ئەخلاقێکە کە بۆت باس دەکەم.

شتێکی بەڵگەنەویستە ئەگەر بڵێین، هەموو ئایینە ئاسمانییەکان و غەیرە ئاسمانییەکان، هەموو راسپاردە ئەخلاقییەکان، هەر لەکۆنەوە تا ئێستا لەسەر ئەوە رۆیشتوون کە ئەرکێکی مرۆڤ ئەوەیە رێز لەباوک و باپیرەو براگەورەی بگرێت، بەڵام ئێمە، ئێمەی شیوعی، وەک دەبینین ئەو جۆرە ئامۆژگاریانەمان بەهیچ وپوچی بۆرجوازی زانی.

خەڵک لەماوەی مۆتەکە ترسناکەکەی شیوعی لەچەند مانگێکدا بینیانن، کە چۆن منداڵە شیوعییەکان هەواڵی درۆ لەدژی باوکیان و دایکیان و براکانیان دەدەن، خەڵک لەوە سەری سورما کە ئەخلاق بەو شێوە داروخاوەو بۆتە چیرۆکێکی کۆن، تا ئەو کاتەی باوکە کەڵەپیاوەکەمان و سەرکردە سیاسیە لێهاتووەکەمان عەبدولکەریم قاسم هات و ئازادی بەهەموو خەڵک دا، تا هەر توێژێک بەو ئازادییە هەقیقەتی خۆی بەدەرکەوت، ئێستا خەلک گلەیی لێناکەن و بەڵکو پیرۆزبایی لێدەکەن، چونکە هەموو توێژەکانی لەسنووری خۆی وەستاند و هەقیقەتیان بۆ خەڵک ئاشکرا بوون، ئەگەر ئەو لەسەرەتای شۆرش ئەو وتارەی بخوێندایەوە، کە تێیدا ئاژاوەگێڕی و ئاژاوەچییەکانی شەرمەزارکردن، رەنگە راست بوو ئەگەر ئێمە غەیرەشیوعیش بمانگوتایە، جیاوازی لەنێوان ئەو رژێمە و رژێمەکەی پێشوو چییە؟ بەڵام ئێستا ئەگەرچی لەوتارەکەدا شیوعیەکانیشی وردوخاش کردووە، کەچی گلەیی لێناکرێت و لەلایەن خەڵکەوە تەنها سەرسامی و پاڵپشتی و نزای تەمەندرێژی بۆ سەردەمە گەشەسەندووەکەی بەدی دەکرێت، ئەمەیە بلیمەتی. ئەگەر هاتوو بەهەموو وتارو لێدوانەکانی زەعیم دابچینەوە، هەر لەسەرەتای شۆرشەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو وتارە نایابەی کە لەکەنیسەی مار یوسف خوێندیەوەو ئەو لێدوانە مەزنانەی کە لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا تێیدا ئابڕووی ئاژاوەگێڕی و ئاژاوەچییەکانی برد، بەڕوونی بۆ خەڵکی دەرخست کە ئەو باوکی گەلی عێراقەو بەحەوت ملیۆنەکەوە، بەعەرەب و کورد و تورکمانەوەو سەرجەم نەتەوەکانی دیکەوە، دەڵێم: ئەگەر ئەو پاڵپشتە جەماوەرییە سەیر بکەین، کە بۆ وتار و

لێدوانەکانی زەعیم کراوە هەر لەسەرەتای شۆرشەوە تا ئێستا ئەوە بۆمان دەردەکەوێت و وتارەکەی کڵێسای مار یوسف و لێدوانەکانی کۆنگرە رۆژنامەنووسییەکە لەهەموویان زیاتر جەماوەر و پاڵپشتی هەبووەو کە هیچ وتارێک و لێدوانێکی بەمشێوەیە جێگای پاڵپشتی نەبووە.

ئینجا با ئێستا بگەڕێینەوە سەر بابەتەکەمان و نموونەیەکی دیکە لەنموونەی چاککاری ئەخلاقی شیوعی باس بکەم.

لەلای باپیرم جوتیارێک هەبوو ناوی مەحمود تەیارە بوو، ئەو چەند مانگێک زیاتر لەبێستانەکەی باوکم نەمایەوە، دواتر کە رۆیشت هەموو داس و ئەو کەلوپەلانەی برد، کە موڵکی باپیرەم بوو، ئەمە دزین و قۆڵبڕینە، ئەمە لەبەر چاوانە، باپیرەم کە بەو دزییەی زانی یەکێکی بەدوای مەحمود تەیارە نارد، من ئەو کاتە لەخانەی مامۆستایان فەسڵکرابووم و لەو زستانەدا لەڕۆژاوا بوون لەبەر ئاگردانەکە دانیشتبووم و رۆمانی دایکی مەکسیم گۆرکیم دەخوێندەوە، دەروونم پڕجۆش و خرۆش بوو، کاتێک باپیرەم پرسیاری کەلوپەلەکانی لەمەحمود تەیارە کرد، بەوپەڕی دڵڕەقییەوە وەڵامی دایەوە: ئەمانە بێڵ و داسی تۆ نین، بەڵکو هی منی جوتیارە، باپیرەم ئەوکاتە بە لەشەبەهێزەکەی هێرشی کردە سەر جوتیارەکەو خستیە سەر تەختەدارێکەوەو بەدارکۆپاڵەکەی لێی دەدا، ئایا دەزانن من چیم کرد؟ وام نیشان دا کە نێوانیان دەکەم، توانیم کۆپاڵەکە لەدەستی باپیرم وەربگرم و بیخەمەدەستی جووتیارەکەوە، دەستی

جولاند، ئەو نەدەویرا ئەمە بکات، بەلام دەیتوانی کۆپالەکە لەنێوچاوی باپیرەم بدات.

ئەو رۆژە ئەو کارەم بەیەکێک لەپالەوانیتیەکان زانی بۆ سەرکەوتنی جوتیارێکی زەحمەتکێش (ئەگەر دزیش بێت) بەسەر دەرەبەگێکی چەپەل، دواتر، ئەمەیە ئەخلاقی شیوعییەکان کە ئەخلاقی هەموو شیوعییەکانی دونیایەو تەنها تایبەت نییە بەئەخلاقی شیوعییەکانی عێراق، لەکاتێکی نزیکدا ئەو جۆرە رووداوانە بۆ خوێنەران دەگێرمەوە کە لەوشێوەیە بووە لەئێران بینیومەو یان لەو رۆمانە نایابەی جۆرج ئوریولیم خوێندۆتەوە، کە ناوی ناوە ١٩٨٤ کە پێشبینی ئەوەی کردووە جیهان دەبێتە سێ حکومەتی شیوعی و لەنێوان خۆیان دابەش دەکەن، وەسفی ئەو ژیانەمان بۆ دەکات کە بەریتانیا لەژێر دەسەلاتی حوکمی سوور هەیەتی.

لەوتارەکەی رابردوودا، چەند نموونەیەکی ئەخلاقە بەرزەکەی شیوعیم پێشکەشکردی، بەڵێنی ئەوەشم دا کە نموونەی دیکەت پێشکەش بکەم، ئەوەتا ئەو بەسەرهاتەت بۆ دەگێڕمەوە کە لەئێران بینیم، بۆ ئەوەی درک بەوە بکەیت، کە ئەخلاقی شیوعییەکان لەهەموو شوێنێک وەک یەکە، شیوعییەکانی عێراق لەو ناجێزی و تاوانان کە لەمۆتەکە سوورەکە لەچەند مانگێکدا لێیان ئاشکرا بوو، بێ هاوتا نین.

من و هاوڕێیەکی عەرەبم لەعەرەبستان لەناحیەیەکی عەبەدان دەخولاینەوە، چەند کتێبێکی ئەستورمان بەدەستەوە بوو، پیاوێکی پیری ئێران بەلامان تێپەڕبوو، بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەکردین، دواتر بانگی لێکردین گوتی ئاغا دەبینم کتێبت هەڵگرتووە، چییە دەتەوێ ببیتە کەر؟ ئێمەش وتمان: چی دەڵێی؟ ببین بەکەری چەمووش؟ گوتی: با قسەیەکتان بۆ بکەم: من سێ کوڕم هەبوو، لەوپەڕی ئەدەب و ئەخلاقەوەبوون، کاتێک گەورە بوون رەوانەی قوتابخانەم کردن، دەرکەوت رۆژ لەدوای رۆژ ئەخلاقیان تێکدەچوو، قوتابخانە و کتێبەکانیان وایکرد ببنە تودەیی شیوعی، ئەوەتا ئەمڕۆ ئەوان پیاوی پێڕاگەیشتوون، کەچی لەبەرامبەر خەڵکی بێگانەش رێزم لێ ناگرن، وشەی زۆر ناشیرین لەحزوری من بەکاردەهێنن، ئایا باوەڕ دەکەن، ئەگەر بڵێم بەبەرچاوی منەوە دەستپەڕ دەکەن؟ ئەمە

زۆر تورەی کردم و چوومە قوتابخانە بەبەڕێوەبەرەکەم گوت: ئەو کەرانە بۆ خۆت، کوڕەکانم بدەوە. ئەویش گوتی: کامە کەر و کامە کوڕ؟ ئەوها وەڵامم دایەوە: سێ کوڕم هەبوو لەئەخلاق یاقوتی نایاب بوون، بۆ قوتابخانەی تۆم ناردن، ئێستا بوونەتە کەر، ئەو کەرانە ببەوە کوڕەکانم بدەوە.

هاوینی ئەو ساڵەی کە تێیدا دەرکرابووم، لەلادێ دەژیام، هەڵمەتێک بۆ سەر عوسبە تاوانبارەکەی زایۆنیزم کرا، رۆژنامەی عوسبە راوەستا و ئەو کۆمەڵەیەش کۆبوونەوەکانیان قەدەغەکرا و سەرۆکەکانیان دەستگیرکران، یەکێک لەسەرۆکەکانی ئەو کۆمەڵەیە جولەکەیەک بوو، ناوی نەعیم تۆفیق بوو، پۆلیس بەدوایەوە بوو، حزبیش ناردیە گوندەکەی ئێمە کە ئەوکات وەک قەڵایەکی دوورەدەست بوو لەقەڵای شیوعییەکان. جا نەعیم هاتەلای ئێمە، لەیەکێک لەبێستانەکانی خورما شوێنێکمان بۆ رێکخست، زۆربەی کاتی خۆمان بەدانیشتن لەگەڵ ئەو بەسەردەبردو سودمان لەزانیارییەکانی ئەو وەردەگرت لەسەر ماددەی دیالکتیک و کاروباری حزب، وامان لەخەڵکی گوند گەیاند، کە ئەو یەکێکە لەبرادەرەکانی من لەخانەی باڵای مامۆستایان و ناویشی مەحمودە، ماوەیەکی زۆر مایەوە، زۆربەی کاتەکانی بەخوێندنەوە یان قسەکردن بەسەردەبرد. سەرەوەی سمتی هەڵاوساو و دامارا بوو، لەیەکێک لەنەخۆشخانەکان هەندێک یۆد و پەمۆمان بۆ هێنابوو. لەکەپرە قوڕینیەکەی ناو بێستانەکە هاوڕێ نەعیم دشداشەکەی هەڵدەکردو دەرپێیەکەی دادەکەند، یەکێک لەئێمە خۆی دادەهێناوە، یان دەکەوتە سەرچۆک بۆ ئەوەی دامێنی جولەکە شوعییە بەخشندەکە تیمار بکات. رۆژێکیان لەو

شێوەیە دەبێت هاوڕێ حەمەد بەسەر دادێ و دەبینی لەکۆخەکە نەعیم دواوەی رووتە و عەبدودائیمیش لۆکەی بەدەستەوەیە بەبرینەکانی نەعیم دادەهێنێت. وێنەکە لەزهنی هاوڕێ جووتیارە سادەکەمان چەسپی بوو، بەڵام هیچی نەگوتبوو. شەوێکیان لەبیستانێکی دیکە دانیشتنێکی مەیخواردنەوەمان ئەنجام دا، تا سەرخۆش بووین مەیمان نۆشی، ئەو شەوە عەبدودائیمان لەگەڵ نەبوو، لەگەڵ هاوڕێ نەعیم مابۆوە و بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات و هانی بدات، بەڵام حەمەد جڵەوی خەیاڵی بەرداو لەڕاست و چەپی خۆی روانی و پرسی: ئەی دایمۆ لەکوێیە، مەبەستی عەبدودایم بوو، ئێمەش وەڵاممان دایەوەو گوتمان: لەگەڵ مەحمودە. حەمەدیش گوتی: هەڵبەتە لەگەڵ مەحمودە، ئەو دانیشتنی لەئێمە و عەرەقخواردنەوەکەی ئێمە خۆشترە. ئەو ژنیەتی. وا دەزانن من نازانم چی روودەدا. رۆژێک لەکەپرەکە بەیەکەوەم بینین، دایمۆ پەمۆی دەخستنە هینەکەی مەحمودەوە، قوتابیان.. خوێندکار... حزبی تەحریر (مەبەستی حەمەد حزبی تەحریر بوو) ئەگەر ئێوە بەوشێوەیە بەدڕەوشتی بکەن، ئەی کێ داکۆکی لەئێمە دەکات؟ مەحمود لەگەڵ دایمۆ راهاتووە، ناتوانێ لێیدابڕێ و ئۆقرە بگرێت؟ دەڵێن چەند رۆژێک لەمەوبەر چۆتە بەسرا و تەنها چەند کاتژمێرێک ماوەتەوە؟ بۆچی؟ ئەو وادەزانێ هێشتا پۆلیس بەدواوەیەتی. بەڵام راستی ئەوەیە ئەو ئارەزووی دایمۆی کردووە، کە چی لێدەکات. سبەی من دەچمە لای مەحمود و دەیخەمە زەبیلێکی گەورەوەو لەسەر پشتی خۆمی دادەنێم تا دەگەمە بازاڕ، لەگەراجی ئۆتۆمبێلەکان فرێی دەدەمە سەر زەوییەکە و هاواردەکەم: ئەوەتانێ لەلاتانە، دەستگیری بکەن، منیش لەگەڵ ئەو دەستگیر بکەن،

ئەو شیوعیە منیش شیوعیم، قوتابی... خوێندکار... حزبی تەحریر.. ئەی کێ داکۆکی لەئێمە دەکات؟.

پشووی هاوین کۆتایی هات و لەگەڵ ئەوەش ماوەی دەرکردنەکەم کۆتایی هات، چوومە بەغدا، دوای گەیشتنم یەکەم کار کە کردم ئەوە بوو سەردانی هاوڕێ حوسێن شەبیبیم کرد، کە لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لەزیندانی گشتی راگیرابوو، ئێستا شێوەم بیردەکەوێتەوە، بێجامەیەکی ئاوریشمی لەبەردابوو، بەدەستیشەوە پاکەتێکی کانزایی گرتبوو، کە پەنجا جگەرەی جۆری بلایزەری ئینگلیزی تێدابوو، کە تەنها خواپێداوەکان دەیتوانی بیکێشن.

ئەو زیندانە بەهەشتێک بوو، بەر لەنیوەڕۆ من چوومە ئەوێ، کاتێک نیوەڕۆ هات من لەگەڵ ئەوان نانم خوارد، جۆرە خواردنێک کە پێشتر تامم نەکردبوو، دوای نانخواردن، حوسێن شەبیبی چەند پرسیارێکی لەبارەی چالاکییەکانی ئێمە لەبەسراو ئەبوخەسیب کردو چەند ئامۆژگارییەک و رێنماییەکی پێدام بۆ ئەوەی لەسەر رێبازە سوورەکەی ئەو بڕۆم لە خانەی باڵای مامۆستایان و گوتیشی: جاسم حەمودی خوێندنی تەواوکردووە، ئەوتۆ کارەکانی ئەو لەخانەکە بەدەستەوە بگرە.

من زۆر بەو متمانەیە دڵخۆش بووم کە هاوڕێ حوسێن بەمنی دابوون، ئەمەم بەئەرکێکی گەورەتر زانی لەوەی کە پێم دەکرێت و چەند رۆژێک دواتر پەیوەندیم بەهاوڕێ یەهودا سدیق کرد، داوام کرد ئەو ئەرکە بەکەسێکی دیکە بدات، چونکە من وەک شیوعی ناوم زڕاوەو راگرایەتی چاودێریم دەکات و تەنگم پێ هەڵدەچنێ. لەگەڵ

ئەوەشدا من لەهەموو کۆبوونەوەکانی شانەی حزب ئامادە دەبووم و سەرجەم ژمارەکانی رۆژنامەی القاعده و بڵاوکراوەکانی دیکەی حزبم بەدەست دەگەیشت، پابەند بووم بەهێمنیەکی رووکەش بۆ ئەوەی پاساوێک نەدەمەوە راگرایەتی و زەفەرم پێ ببات.

رۆژێکیان کە پێنج شەممە بوو، هاورێیانی شیوعی لەماڵەوە پەیوەندیان پێوەکردم، پێیان راگەیاندم کە بەیانی خۆپیشاندانێکی حزبی بەرێوەدەچێت و داوایان کرد بەشداری تێدا بکەم، ئێستا وەک وێنەیەکی تەڵخ لەبەرچاومە کە چووین لەقاوەخانەیەکی کەناری دیجلە، دواتر لەبازارەکانی دەوروبەری ئەوێ دەخولاینەوە، چەند دانەیەک گۆپاڵمان کڕی، چونکە پێویست بوو کە خۆپیشاندانەکە چەکدار بێت بەلای کەمەوە بەگۆپاڵ بێت. خۆپیشاندانەکە دەستپێکرد، لەنزیک سینەما حەمرا بوو، پلانەکەمان لەخۆپیشاندانەکە ئەوەبوو کە کۆمەڵێک لەئێمە لەشوێنی وەستانی پاسەکانەوە بێت و وەک ئەوەی چاوەڕوانی پاس بکەین، دواتر کە پاس هات رابکەن و وەک ئەوەی بیانەوێت لەپاسەکە سەرکەون و بۆیەش هەڵدێن و هوتاف دەکێشن تا کومەڵەکانی دیکە دەگەنە لایان و ئەوکاتە خۆپیشاندانەکە دەستپێدەکات و دروشمەکان بەرزدەکرێنەوە. پلانەکە سەرکەوتوو بوو، خۆپیشاندان دەستپێکرد، پۆلیس پێشتر بەکات و شوێنی خۆپیشاندانەکەی زانی بوو، بەڵام هاورێیان دەیانویست سووربن لەسەر خۆپیشاندان ئەگەر هەرچییەک رووبدات، وایان بەباش زانی هەریەکە قوڵ لەقوڵی ئەویتر هەڵکێشێ بۆ ئەوەی بوار بۆ کەس نەبێت رابکات و ناچار بێت خۆڕاگر بێت.

لەناخەوە بڕیارم دابوو خۆڕاگر بم، بڕیارم دابوو لەژێر ئاڵای سووردا بمرم، وەک ئەوەی یەکێک لەشاعیرە شیوعییەکان دەڵێ. هەرهێندەمان زانی ئۆتۆمبیلێکی جێپی پۆلیس لەدواوە بۆ خۆپیشاندانەکە هات و من کەوتمە سەرزەوی و خوێن لەدەستم دەڕۆیشت، هاوڕێیانی خۆپیشاندەرم وەک کەروێشکی ترساو هەلاتن، من کە نیازم نەبوو رابکەم، لەبارودۆخی خۆم مامەوە و بینم دوو هاوڕێم لەچەپ و راستمەوە رامدەکێشن و منیش بەردەبمەوە. لەمێژە بۆم دەرکەوتووە کە شیوعییەکان ترسنۆکترین خەڵقی خودان، بۆ ئەمەش هۆکار هەیە، من وای بۆ دەچم کە ئەمە پەیوەندی بەبێ باوەڕی ئەوان هەبێت، کە باوەڕیان بەزیندووبوونەوە و ژیانی دوایی نییە، بۆیە ژیانیان بەلاوە ئازیزە، چونکە تاکە ژیانیانە، ئەوەی مێژووی عەرەبمان بخوێنێتەوە دەزانی کە شەڕێکی فیکری توند لەنێوان جەبرییەکان و قەدەرییەکانی زانایانی موسڵمان هەیە، جەبرییەکان باوەڕیان بەوە هەیە، کە مرۆڤ دەتوانێت کار بەچارەنووسی خۆی بکات و بەتوانای خۆی دەتوانێ لەمردن و ئازار خۆی دوور بگرێت، بەلام قەدەرییەکان وای دەبینن، کە قەدەری مرۆڤ نووسراوە، کاتی مردنی دێت ئەگەر لەبورجی سەرکەشیش دابن(بورجی موشید لەئایەتی قورئان وەرگیراوە) بۆی کاتێک لەو شەڕەدا قەدەرییەکان سەرکەوتن، ورەی موسڵمانەکانیش بەرزبووە، سەربازەکان بێ ترس و دوودڵی دەچوونەوە ناو مەترسییەکانیەوە، چونکە دەزانێ نامرێت ئەگەر بۆی نەنوسرابێت.

من لەسەر زەوییەکە هەڵسامەوەو تۆزم لەجلەکانم تەکاند، بینیم هەردوولای شۆستەکە پڕ بوو لەپیاوانی پۆلیس کە دەیانەوێت لێرەو لەوێ هاوڕێیانی راکردوو دەستگیر بکەن، من جگەرەیەکم دەرهێنا و

خستمە سەر لێوم و دەستەکانم خستەوە گیرفانم بۆ ئەوەی خوێنە چۆڕاوەکەی دەستم بشارمەوە، دواتر بەسەنگ و هێمنی بەلای پیاوانی پۆلیس تێپەڕبووم، ئەوان لەو باوەڕدانەبوون کە من، منێک کە بەهێمنی ڕێگەدەگرم لەخۆپیشاندەران بم.

بەلای معاونێکی پۆلیس ڕەت بووم، کە پیاوێکی قەڵەو و کورت بوو، لەسەر شۆستەکە وەستا بوو، هەوڵی دەدا هەر خۆپیشاندەرێک بگرێت، کە بەلای تێدەپەڕی، هاوڵاتییەک لای پرسی ئەو خۆپیشاندەرانە چیان دەوێت؟ معاونی پۆلیس گوتی: چوزانم؟ دەیانەوێت لینین بێنن و بیکەنە شا، هەرچەندە ئەوکات من پێکەنیم، بەڵام ئەو قسەیەی ڕاست بوو، هەرچەندە بەسادەیی گوزارشتی لێکرد.

ئەوەی شیوعییەکان لەهەر شوێنێک دەیانەوێت (جگە لەشیوعییەکانی یوگسلاڤیا) ئەوەیە کە وڵاتەکەیان بە ڕەورەوەی یەکێتی سۆڤیەت ببستنەوەو ملکەچی دەسەڵاتی کرملینی بکەن. ئایا بەسەرهاتی ئەو جەنەراڵە سۆڤییەتیەت پێگەیشتووە کە دواتر بووە وەزیری بەرگری حکومەتە شیوعییەکەی پۆڵەندا؟

شیوعییەکانی عێراق ئەرزو ئاسمان بەیەک دادەن، ئەگەر شارەزایەکی بەریتانی یان ئەمریکی بۆ دروستکردنی پەنیر و قەڵاچۆکردنی جورج بێتە وڵاتەکەمان، پێیان وایە ئەو نێردراوی ئیمپریالیزم و سیخورە، هاتنیشی بۆ وڵاتی ئێمە بۆ کەمکردنەوەی سەروەریی ئێمەیە، ئەی هاوڕێیان چی لەبارەی ئەو ژەنەراڵە روسییەوە دەڵێن کە دواتر بووە

وەزیری بەرگری حکومەتی پۆڵەندی کە ئەو حکومەتە شیوعییە سەربەخۆ بێت و هەمووشمان دەزانی وەزارەتی بەرگری زۆر گرنگە.

ئەوان ناو لەوەدەنێن هاوکاری نێوان هاوڕێیان، ئایا سەفسەتەیەکی روونتر لەمە بینیوە؟ لێگەڕێ با شتێکی دیکەت بۆ بگێڕمەوە بۆ ئەوەی درک بەوە بکەیت، کە دڵسۆزی شیوعییەکان بۆ گەل و نیشتمانەکەیان چەندە.

لەسەرەتای شۆڕشە پیرۆزەکەمان، دوای ئەوەی کۆمارە ئازادەکەمان سیاسەتی بێلایەنی هەڵبژاردن لەبەرامبەر هاوردەکردنی عێراقی هەموو بازاڕەکانی جیهان کرانەوە، بێگومان جگە لەئیسرائیل، جگە لەفەرەنسا کە گەلی ئێمە لەجەزائیر دەچەوساندەوە، جگە لەئیتاڵیا کە جولەکەکان بەتایبەتی جولەکە عێراقییەکان کردبوویانە مەڵبەندێکی بازرگانی بۆ خۆیان.

بەدانانی ئەو پلانە حەکیمانە دڵخۆش بووین، چونکە دەرفەت بۆ بازرگانی عێراقی و بەکاربەری عێراقی دەرەخسێنێت کە چاکترین کەلوپەل بەهەرزانترین نرخ بەردەست بخەن، بۆیە بازرگانەکان داواکانیان پێشکەشی بەڕێوەبەرایەتی گشتی بازرگانی دەکردو لەهەرشوێنێک کەلوپەلی باش و هەرزانیان دەست بکەوتایە هاوردەیان دەکرد. بازرگانەکان ئەوکاتە داوایان لەو بەڕێوەبەرایەتییە کرد بۆ هێنانی کوتاڵی پەمۆی یابانی، بەڵام هاوڕێیەک کە نامەوێت پیتی یەکەمیشی بهێنم، کە دەسەڵاتی زیاتر لەبەڕێوەبەری گشتی بەخۆی دابوو، چونکە لە خەباتگێڕەکان بوو، ئەو داوایەی رەتکردەوە و رێگەی نەدا ئەو بازرگانانە ئەو جۆرە کوتاڵە لەیابان بهێنن و

پێگوتن: یابان وڵاتێکی ڕەجعی و ئیستعمارییە. بۆیە ئەگەر بازرگانەکان دەیانەوێت مۆڵەتی هاوردەکردنیان پێبدرێت، پێویستە هاوردەکانیان لەچینی میللییەوە بێت.

بەڵام پێشتر بازرگانەکان پەیوەندیان بەبازاڕی چینەوە کردبوو، بینیبویان کە نرخی یابانی زۆر لەچین هەرزانترەن ئەو نرخانەیان بەو هاوڕێیە نیشان دا کە بەرتیلخۆریش بوو، پێشیان گوت کە ئەو نرخانەی یابان زۆرهەرزانە و لەخزمەتی گەلی عێراقە ئەو گەلەی کە هاوڕێیە شەریفەکان بۆی دەگرین، وەڵامی دابووەوە گوتبووی ئەمە بایەخی نییەو چین وڵاتێکی دۆستەو ئەو خورمای زۆری لەعێراق کڕیوە، کەچی یابان هیچی نەکڕیوە، ئەوانیش ناچار بوون بەدڵی هاوڕێ بکەن و مۆڵەتیان وەرگرت و هاوردەیان لەچین کرد، چەند مانگێک وەستان کە کەلوپەلەکان گەیشت دڵخۆش بوون، کاتێک کارتۆنەکانیان کردەوە بینیان لەسەری نووسراوە مەید ئین چاپان، واتە چین خۆی لەیابانی کڕیوە بۆ ئەوەی قازانج لەچەند قەشمەڕێکی عێراقی بکات.

زۆر لەخوێنەران پرسیاری ئەوەم لێدەکەن، کە بۆچی نووسینەکانم زنجیرە نییە، بەو شێوەیەی کە جەربەزەیی خۆم لەگەڵ شیوعیەت بگێڕمەوە، گێڕانەوەکەشم بەپێی ڕێکخستنی زەمەن بێت، من وەڵامم ئەوەیە کە هەندێکجار ڕووداوی لەناکاو ڕوودەدەن، ناچارم ئەوکاتە باسی بکەم و بەر لەوەی بەسەر بچێت، نموونەی ئەو ڕووداوانەش ئەو ناوبژیوانەیە کە شیوعییەکان ناردویانە، یان بەلایەنی کەمەوە بڵێم مستەفای برام ناردویەتی، ئەو ڕووداوە واخۆی زاڵ کرد، کە باسی بکەم و ماقوڵ نییە دوای دوو هەفتە باسی بکەم و بڵێم شیوعییەکان بەر لەدوو هەفتە نێردراوێکیان ناردووە.

یەکێک لەرۆژنامە نیشتمانییەکان! وتارێکی بڵاوکردۆتەوە کە لەلایەن براکەم مستەفا شاکر سەیاب، بەناونیشانی (براکەم تاوانبار دەکەم) نووسراوە، من ئەو وتارەم خوێندەوە، بەزەییم بەنووسەرەکەی هاتەوە، کە برابچووکەکەمە، بینیم ئەو وتارە وەک نووسینی شیوعییەکان پڕیەتی لەتێکەڵ و پێکەڵی، لەخۆم پرسی: ئایا بۆ شیاوە کە وەڵامی قوتابییەکی پۆلی چواری دواناوەندی بدەمەوە، ئەگەر ڕۆژگارێک من لەکارەکەم دەرنەکرابووام ئەوە ئەمڕۆ مامۆستای ئەودەبووم، جگە لەوەش ئەو قوتابییە فاشیلە کەسێکی ئاسایی نییە، بەڵکو شتێک بەیەکەوەمان دەبەستێتەوە، کە نکوڵی لێناکرێت و فەرامۆش ناکرێت، ئایا پەیوەندی خوێن لەلایەن شیوعییەکان نەبێت لەکەسانی دیکە هەر هیچ نەبێت، بەهێزترین پەیوەندی نییە؟

ئەو نووسەرۆکە دوای ئەو پێشەکییەی کە لەفرمسێک نقوم بووەو بەدەستێکی لەرزۆک پڕکراوەتەوە، شێوەی ئەو نووسینانەی کە هەرزەکارانی سەرسام بوو بەدێڕەکانی مەنفەڵوتی دەینوسن و پڕی دەکەن لەفرمێسکی عەشق و داماوی، نووسەرۆکە باس لەوە دەکات، کە بەناچاری خۆی لەجەنگێک دۆزیوەتەوە، کە بەسەریدا فەرزکراوەو دەبوایە بیکات و لەگەڵ لایەنە نیشتمانییەکان بوەستێت، واتە شیوعییەکان، ئەمە لێکدانەوەی منە، هی ئەو نووسەرۆکە نییە، تێبینی ئەو گروپە خۆشەویستە بکە، کە بۆ شیوعییەکان هەیە، سەرکەوتن و خەبات و پاکانەشی دەخەمە سەربار، لەگەڵ ئایندەی من و بژێوی منداڵەکانم.

وەک ئەوەی بۆ تاکێکی عێراق ئایندە نییەو بۆ منداڵەکانی بژێوی نییە، مەگەر لایەنە نیشیمانخوازە سورانە سەرکەوتن و ئامانجەکانیان بەدەست هێنا، کە ئەویش سیستەمی شیوعیەتە، من رووی قسەکانم لەهاورێیانە، دەڵێم: لەوەی حزبەکەتان پێشبینی ئەوەی کردووە، کە دەبێت جەنگ بەگوند و لادێیەکان بکرێت لەپاڵ شارەکانیشەوە کە پێشتر خەبات تەنها لەوێ بوو، لەوکاتەوە هیوای ئەوەی بەجوتیارەکان دەدەن، کە زەویان بەسەر دابەش دەکەن.

ئەوەتا زەعیمی بلیمەت (زەعیم نەوەک حزبی شیوعی عێراقی) زەوی بەسەر جووتیارەکان دابەش دەکات، ئایا ئایندەی جووتیارەکان و بژێوی منداڵەکانیان بەبوونی ئەو زەعیمە فریادڕەسە مسۆگەر نییە، کە چەندین جار جەختی لەسەر ئەوە کرۆدتەوە، کە ئەو لەسەرووی هەموو لایەنگیری و حزبەکانە و ئەگەر ئێوە حوکمتان لەبەر دەست بووایە، ئەوەی هاورێ گەورەکانتان خاوەنی باڵەخانەو چەندین ئۆتۆمبێل دەبوون و هاوسەرگیری زۆرو زەوەندیان دەکرد، وەک ئەوەی ئێستا دەیبینین؟

دواتر ئەو نووسەرە زیرەکە دەڵێ: سەیاب وتارێکی هەیە لەشێوەی دانپیانانەو ئێستایش لەلای یەکێک لەڕۆژنامەکانمان پارێزراوە، ئەگەر بڵاوبکرێتەوە نادادپەروەری ئەو دەردەخات.

ئایا ئەو وتارە چییە، وەک ئەو برایە بەڕێزە وەسفی دەکات؟ ئایا لەشێوەی دانپێنانە؟ دەمویست قسە لەسەر ئەو نووسینە بکەم بەپێی زنجیرە زەمەنییەکەی، بەڵام ئەو برا شیوعییە ناچاری کردم، پەلە لەوەبکەم و کە ئێستا دەیگێڕمەوە:

دوای ئەوەی لەکارەکەم دەرکرام، وایلێهات مستەفای برام، لەماڵەوە زۆر سەردانی دەکردم و زۆر گازندەی لێدەکردم، کە ئەوەی بەسەرم هاتوە بەدەستی خۆم بووە، باسی لەوەش دەکرد، کە نیشتمانییەکان واتە شیوعییەکان هێشتا منیان خۆشدەوێ، عەزیز حاج کە هاوڕێمەو لەخانەی مامۆستایان بەیەکەوە بووین، دەیەوێت بمبینێ، عەزیز حاج کە ئێستا کۆمەڵێک سیفەتی قودرەتی قادری هەیە، دەتوانێ بەیەک وشە بمگەڕێنێتەوە سەرکارەکەم، تەنانەت مستەفا ئەوەشی پێ ڕاگەیاندم، کە عەزیز حاج ویستویەتی ئەوکاتە سەردانم بکات، کە من دەستگیرکرابووم، ئەو پێداگرییەی مستەفا و نیشاندانی مەسەلەکان بەوشێوازە سیحرییەو زۆری پێداگری ئافرەتانیش لەماڵەوە، تەنگاویان کردو وتم دەچمەوە لای عەزیز حاج و تا بزانم چی دەوێ و خۆ هیچ نادۆڕێنم، چومە بارەگای ڕۆژنامەی ئیتحاد شەعب، کە ئەوکاتە حزبی شیوعی کردبوویە بارەگا ئاشکراکەی خۆی، عەزیز حاجم لەوێ نەبینی، بەڵکو جەمال حەیدەری و هەمزە سەلمانم بینی، کە هەردووکیان هاوڕێم بوون، ئەوان پێشوازییەکی چاکیان لێکردم و خەمی خۆیان بەدەرکردنم دەربڕی و دواتر گوتیان بابەتی فەسڵکردنم ئێستا جێگای باس نییە، بەڵکو لەسەرمانە باسی ناکۆکییەکانم بکەین لەگەڵ حزبی شیوعی، بەباش زانرا کە هەرچی هەیە لەکاغەزێک

بینوسم و دواتر دیراسه بکرێت و لەلایەن حزبەوە بڕیاری کۆتایی لەسەر بدرێت، کاغەزێکم وەرگرت و چیرۆکەکەم گێڕایەوە لەسۆزانی کوێر و چەکەکان و منداڵەکان دەستم پێکرد، کە وەک پێشتر لەو ڕۆژنامەیەم گێڕایەوە.

جەمال حەیدەری نووسینەکەی نەخوێندەوە، گوتی باوەڕ بەهەموو قسەکانت دەکەم، تەنها لەو نووسینە ئەوەم رووننەکردۆتەوە، کە وەک براکەم ناوی دەنێ هەڵەکەم، بۆیە من ئەوەشم زیاد کرد، کە هەڵەی من ئەوەیە من هێرشی شیوعییەکانم بەوە قبوڵکرد کە هێرشم کردەوە سەریان، وەڵامی جوێنەکانم بەجوێن داوەتەوە، بەڵکو ئەرکی من ئەوەبوو وەک شیوعیەک بێدەنگ بم و هەرچەندە بەسیخور وەسفم بکەن و وەک کەسێکی لەناخەوە دیموکراسیخواز لەنووسینی قەسیدەکانم بەردەوام بم، ئەمە ئەو دیمانەیە بوون کە شیوعیە بچووکەکە بەبڵاوکردنەوەی هەڕەشەم لێدەکات و من کێشەیەک لەبڵاوکردنەوەی نابینم.

نووسەر خوابیپارێزی و کاتێک دەچێتە تاقیکردنەوەی بۆ پۆلی پێنجی ناوەندی سەرکەوتوو بێت، دەڵێ "پێویست بەوە نییە ئەو درۆ و رووداوانە ئاشکرا بکەم کە نووسەر بەخەیاڵێکی شاعیری رازاندویەتیەوە، ئەو رووداوانەی ئەو دەیگێڕێتەوە و خۆی لێکردۆتە شاهێدحاڵێک- ئەگەر ئەو بوختانانەی راست بێت- لەساڵانێک روویداوە نووسەر هیچ نەبوو جگە لەمنداڵێک، کە منداڵ دەڵێن گریا. گریا. گریا. ئەویش دەگریا، وابزانم نکۆڵی لەوە ناکات."

ئایا بلیمەتی شیوعیت بینیوە؟ من فەهد و سەرکێشیەکانی لەگەڵ بەلقیس و نادینی و ئیلحادی ئەوانم بیر نییە، چونکە من منداڵێکی بچووک بووم، بەڵام هاوڕێ مستەفا کە چوار ساڵ لەمن بچووکترە، ئەوەی بەبیر دێ من کە منداڵ بووم هەر کاتێک منداڵ دەیانگوت گریا.

گریا. من دەگریام؟ بژی یادەوەری شیوعی. کەسێک لەوپەڕجووی(معجزە)یەی شیوعی سەری سوڕنامێنێ، وەک ڕووداوەکان سەلماندیان، ئەوان بلیمەت و خاوەن یادەوەری بەهێزن، ئەوان ڕۆژگارێک نووسراوێکیان دەرکردو پیرۆزباییان لەوەکرد کە جولەکە ڕەگەزنامەی عێراقیەکەی ئەوانی سقوت پێکردووەو بەرەو ئیسرائیل ڕۆیشتوون و لەستەم نەجاتیان بووە، بەڵام چەند ڕۆژێکی بەسەرداتێنەپەڕی خەڵک نووسراوەکەی یەکەمیان بیرچوو، مەبەستم ئەوەیە شیوعیەکان بیریان چوو- بۆیە بەیاننامەیەکی دیکەیان دەرکردو دژی کۆچی جولەکە بۆ ئیسرائیل وەستانەوەو گوتیان دەبێت جولەکە لەشوێنەکانی خۆیان بمێننەوەو لەپاڵ هێزە نیشتمانییە بەشەرەفەکان خەبات بکەن.

ئەو نووسەرە وێنەیەکی لەبەردەم خۆی داناوە، دواتر وێنەی ئاوەژووەکەی خۆی دەگوازێتەوە، بەمنی دەدات و ئایا زێدەڕۆیی لەلەزەت کردووە؟ من نامەوێت ئاماژە بەو شتانە بکەم، کە کەسێک لەبارەی براکەیەوە دەزانێ، ئەمە لەبەرژەوەندی دانییە کە دەستی خۆمان بەخەڵک بسڕینەوە.

دواتر نووسەر وەک هەموو شیوعییەکانی دیکە هەوڵ دەدا، ڕێونکردن و فێڵ لەگەڵ زەعیمی پاڵەوان بەکاربهێنێت، بەوەی کە تەنها شیوعیەکان دڵسۆزی کۆمارن، جگە لەوان قەومییەکان و سەربەخۆخوازەکان و ئەوانی دیکە ناپاک و کودەتاچیین، وەک ئەوەی ڕووداوەکانی کەرکوک و بەعقوبە و ڕووداوەکانی سلێمانی و ئەوانەی لێرەو لەوێ ڕوودەدەن، تەنها بەس نەبێت بۆ ئەوەی زەعیم بزانێت کە دڵسۆزی شیوعییەکان بۆ ئەو و نیشتمان چەندە.

ئەو نووسەرۆکەیە لەبارەی منەوە دەڵێ "لەلای بزووتنەوەی نیشتمانپەروەران ئەو باوەشەی دایکی دۆزییەوە، کە لەدەستی دابوو

و ئەو هەست بەکەموکوڕیەشی دەرکەوتووە کە لەمنداڵییەوە بەو هۆکارە هەیەتی."

کێ تووشی هەستی خۆبەکەمزانی بووە، هەی کەشکولن، ئەوە ئەو نازناوە بوو کە منداڵبوو بۆ ئەومان بەکاردەهێنا، چونکە زۆر دەگریا.

کاتێک دایکت مرد، تۆ ساوایەکی شێرەخۆری نەخۆش بووی، لەسۆزی دایکێک بێبەش بووی کە هەرکاتێک گازندەت ئاراستە بکرایە دەگریایت، ئەوەشت بیر بێت ئەمڕۆ ئەو گازندەیەت ئاراستە نەدەکرا ئەگەر دایک مابووایە، ئەوکات سەرت درێژ بوو، ئێستاش وەهایە، بەڵام بەقژەکانت شاردۆتەوە، بەوە تۆمان دەگریاند، کارەکەر و جووتیارەکان و خەڵکی گوند بەو نازناوە بانگیان دەکرد کە لایان خۆش بوو، ئەویش ئەوەبوو "سەردرێژ."

ئایا کامیان دەکرێت هەستی بەکەمزانی هەبێت؟ برا گەورە کە نە خێڵە نە گۆجە و نەکەموکوڕییەکی جەستەیی هەیە؟ یان منداڵێکی بچووکی نەخۆش کە دایکی مردووە و ئەویش سەرێکی گەورەی هەیە؟

من کە منداڵێکی بچووک بووم، ماقوڵ نییە وەک تۆ دەڵێی حزبی نادینی و کارەکانی ئەوەمان بیر بێت، ئەی تۆ کە چوار ساڵ لەمن بچووکتری چۆن بەباشی بیرت دێ کە وا باسیان دەکەی (ئەوا من لەداهاتوو بۆ خوێنەری ئازیزی باس دەکەم و جیاوازی لەنێوان بانگەشەی ژەهراوی و گوتەی بەریئ دەکەم) هەموو زانیارییەکانت ورد و راستن، چونکە تۆ بەباشی بیرت دێ، بەخێربێیتەوە ئەی داماو بەخێربێیتەوە بلیمەتی شیوعی.

من ئامۆژگاریت دەکەم کە بەلای خوێندنەکەتەوە بڕۆی، بۆ ئەوەی بتوانی بەشداری لەتاقیکردنەوەی بەکالۆریای پۆلی پێنج بکەیت و تێیدا سەرکەوتوبیت، ئەی راستکەرەوەی مێژوو، لەمنەوە هەزار سڵاو.

لەنێوان ڕووداوی ئەو خۆپیشاندانەی کە بۆم باسکردی و ئازایەتی هاوڕێیە مولحیدەکانی تێدا دەرکەوت، لەگەڵ ڕاپەڕینی کانون، کە لەچەند مانگی داهاتوویدا شیوعیە جولەکەکانی ژیاندەوە، ڕووداوێکی گرنگتر نادۆزمەوە باسی بکەم لەڕووداوی دەستگیرکردنی هاوڕێی (نەمر) فەهد گرنگتر بێت .

دەمەوعەسری ڕۆژێک لەڕۆژەکانی ساڵی ١٩٤٦ بەرەو چایخانەیەک دەچووم، کە هەواڵە شووەکەی ئەوکاتەم بیست، من لەو چایخانەیە نزیک بووم، کە دەکەوێتە بەرامبەر وەزارەتی بەرگری، گوێم لێبوو دوو پیاو باسی ئەو هەواڵەیان دەکرد، یەکێکیان سەرنجی لەسەر هەواڵەکە داو گوتی "فلان کوڕی فلان، ساڵانێکە بەدوای دەگەڕێن و دەیانەوێت دەستگیری بکەن، سوپاس بۆ خوا، دوای دەستگیرکردنی لەئاسودەیی دەژین. زۆر لەقسەکانی ئەو کۆنەپەرستە چەپەڵە و سیخوری ئیمپریالیزم تورە بووم."

چیرۆکی دەستگیرکردنی فەهد سەرنجڕاکێشە، بەپێویستی دەزانم بیگێڕمەوە، چونکە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەخلاقی شیوعیەت و لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووی ئەو حزبە سیخورەو ڕێبەرەکانی نیشان دەدات، ئەمە چیرۆکێکە پاڵەوانەکەی هاوڕێ حوسێن شەبیبیە، بەڵام

بەر لەوەی ئەو چیرۆکە بگێڕمەوە، دوو بەسەرهاتی دیکە هەیە، کە لایەنەکانی کەسایەتیە ئازاکەی ئەو پاڵەوانەمان بۆ ئاشکرا دەکات.

ئەوەی بەبیرم دێ ساڵی ١٩٤٥ بوو، حوسێن شەبیبی کتێبێکی دەرکرد، کە لەبارەی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو بوو، حوسێنیش ئەندامی حزبی شیوعی بوو، لەبەر ئەوەی ئەو لەحزبێکی نهێنی بوو، پێویستی دەکرد، نهێنیپارێزبن و شتێک لە رێنووس و وێنەی بەدوای خۆیان جێنەهێڵن تا ئاشکرا بکرێن، بەڵام هاوڕێ حوسێن دەیویست ناوبانگ دەربکات، دەیویست خەڵک بیناسێ، بەلایەنی کەمەوە کەسانی (شەڕەفمەند)، دەیویست کە بەشەقامی رەشید تێپەڕێت دەیان خەڵک سڵاوی لێبکەن، چاکترین رێگاش بۆ ئەمە وێنەی خۆی بۆ خەڵک دەربخات، تا کاتێک خەڵک بەلای تێپەڕین و سڵاویان کرد بڵێن "ئا ئەمەیە خەباتگێڕی مەزن."

بەمجۆرە وێنەی بەڕێزی خۆی لەکتێبەکە بڵاوکردەوە، براکەی کە ناوی محەمەد عەلی بوو، حوسێن توانیبووی بیکاتە بەلشەفی، بەتەواوی لەحوسێن دەچوو، کاتێک محەمەد عەلی ئاشکرا بوو، هەندێک کاری ئەوتۆی ئەنجام دابوو کە پێویست بوو پۆلیس دەستگیری بکات، پۆلیس لەهەموو عێراق بەدوایەوە بوو، بەڵگەیەکیش لەلایەن پۆلیس نەبوو محەمەدی پێ بناسرێتەوە، تەنها وێنەی براکەی نەبێت، کە لەو کتێبە "نیشتمانییە" بڵاوکرابۆوە، بۆیە پۆلیسی نهێنی و ئاشکرات دەبینی، کە دانەیەکی ئەو کتێبە بەدەیان بەدەستەوە بوو، سەیری بەرگی کتێبەکەیان دەکردو لەگەڵ دەموچاوی رێبواران بەراوردیان دەکرد.

ئەمەیان چیرۆکی یەکەم، بەڵام چیرۆکی دووەم لەوەیان بەدبەختترە وەک دەڵێن. ئەوەی زانراوە لەلایەن خەڵکەوە ئەوەیە دوو تانە لەشیوعییەت و شیوعییەکان دەدرێت، لەهەموو کات و شوێنێکدا،

ئەوانیش یەکەمیان بێباوەڕیی و دووەمیان داوێنپیسیە. بۆیە پێویستە لەسەر شیوعییەکان و ڕێبەرەکانیان بەلایەنی کەمەوە لەسێکس و ئابڕووچوونەکانی سێکس دووربکەونەوە، ئەو بابەتانەش باس نەکەن کە لەئایینەکان دەدات. بەڵام بەپێچەوانەوەی ئەوەی پێشنبینی دەکرا، ئەوان زێدەڕۆییان لەسێکس کرد، بەشێوەیەک ئەوکات دەتتوانی بەرۆکی کچێک یان ژنێکی شیوعی بگریت و هاوار بکەیت: وەرن ئەوە بەدرەوشتە.

کاتێکیش بڕیاری لەسێدارەدان بۆ هاوڕێیانی (نەمر) فەهد و حوسێن شەبیبی و زەکی نەسیم و یەهودا سدیق دەرچوو، کاتی جێبەجێکردنی هات، بۆ هەریەکێکیان پیاوێکی ئایینیان نارد، شێخێکی موسڵمان و قەشەیەکی مەسیحی و حاخامێکی جولەکە، بۆ ئەوەی هەریەکەیان خوایان و رۆژدوایان بەبیربێتەوەو پێشوازی لەمردن بکەن، بەڵام کاتێک شێخ لەشەوی لەسێدارەدان دەچێتە لای حوسێن شەبیبی، ئەو شێخەکە دەردەکات و سوکایەتی پێدەکات و دەڵێ "من شیوعیم و شیوعی باوەڕی بەخوا نییە". سلاو لەهاوڕێیانی ...نەمر و زیندوو.

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر چیرۆکەکەمان و پاڵەوانەکەی کە ئەویش هاوڕێ حوسێن شەبیبیە.

کاتێک لەساڵی ١٩٤٥ روخساری راستەقینەی حزبی شیوعی دەرکەوت، کە ناوی خۆی نابوو حزبی تەحرروری وەتەنی، ئەو کات حوسێن یەکێک بوو لەسەرکردە دیارەکانی و هەزاران خەڵکی لەگەڵ دابوو، کە کەسانی نیازپاک بوون و پرۆگرامەکەی ئەویان بەنیشتمانی و پێشکەوتوو زانی بوو، نەیاندەزانی ئەویش کوڕێکە لەکوڕەکانی حزبی شیوعی، کە لەوە راهاتووە سەندیکای کرێکاران و یەکێتی قوتابی و جوتیار و سەندیکای مامۆستایان و دەیان رێکخراوی دیکەی "دیمۆ...کراتی" دروستکردووە، وەک ئەوەی لەسەرەتای

هەڵگیرسانی شۆرش بینیمان کە حزبی شیوعی دەسەڵاتی بەسەرداهەیەو ئەمەش وایکردبوو کە لەئامانجە سەرەکییەکانی خۆیان دووربکەونەوەو خەسڵەتی تەسکی حزبی هەبێت، کە وایکرد ئەندامانیان پاشەکشە بکەن، دوای ئەوە هەقیقەتەکەیان زانی.

یەکێک لەوانەی ئینتمای بۆ ئەو حزبە هەبوو، گەنجێک بوو ناوی عەبدولوەهاب بوو، خوشکەکەشی ناوی(خ) بوو، باوکیان لەناحیەیەکی بەغدا گۆشتفرۆش بوو، ئەو خوشک و برایە لەئەندامە بەگڕوتینەکانی حزبی تەحەرور بوون، لەهەموو چالاکییەکی وەک خۆپیشاندان و ئاهەنگ و کۆمەک کۆکردنەوە و هتد بەشدار دەبوون، تا وایلێهات ناویان لەلای هەموویان دەرکەوتبوو، ئێمەی ئەندامانی حزبی تەحەرور و لایەنگرانی، من گوێم لەناوی ئەو خوشک و برایە بوو ئەو کاتەی لەبەسرا بووم، زۆر چیرۆکی پاڵەوانێتی دەگمەنی ئەوانیان بۆ گێڕامەوە، کاتێک حوسێن شەبیبی و یان یەکێک لەهاوڕێیە گەورەکان دەستگیر دەکران، گۆشتفری باوکیان چاکترین گۆشتی دیاردەکردو دواتر کچەکە بەدەستی خۆی دەیبرژاند و کچەکە (خ) خواردنەکەی بەسەر سەرخۆیەوە دەبردە گرتوخانەکە بۆ ئەوەی هاوڕێیان بیخۆن.

کاتێک یەکێک لەو هاوڕێیانە لەگرتووخانە دەرچوو، بینی پۆلیس بەدواوەیەتی و دونیای لێ تەنگ کردۆتەوە، نەیدەتوانی خانوویەک بگرێت، چونکە ئەوکات بەداڵدەیەکی شیوعییەکان دادەنرا، بۆیە ئەگەر بچێتە هۆتێلیش ژیانی لێدەبێتە دۆزەخ، گۆشتفرۆشی باوکی عەبدولوەهاب فریای کەوت و داوای لێکرد بچێتە ماڵی ئەوان و ژوورێکی بۆ تەرخان کردو پێی گوت "ماڵ ماڵی خۆتە، وەهاب براتە و خ خوشکتە". خا کچێکی جوان و لەرەونەقی گەنجێتی دابوو، هاوڕێ ئارەزووی ئەو کچەی کرد، بەبیانوی رۆشنبیرکردنی ئەو کچە لەڕووی حزبیەوە وایکرد دڵ و جەستەی داگیرکرد، تا رۆژێک هات

توانی بەئامانجی خۆی بگات، بۆیە بیانوی دۆزیەوەو ماڵی باوکی کچەی جێهیشت و بۆشوێنێکی دیکە چوو.

کچە دووگیان بوو، باوکیان بینیان سکی کچەکە دائاوسێ، پرسیاریان لێکرد کە کێ دەستدرێژی کردۆتە سەر، کاتێک وەڵامی دایەوە کە هاوڕێ ئەو کارەی کردووە، باوەڕیان بەکچە نەکرد، لێیان توند کرد، بەڵام کچە سووربوو لەسەر هاوڕێی ناوبراو، برا و باوکی گوتیان کارەکە ئاسانە، قسە لەگەڵ هاوڕێ دەکەین، رازی دەکەین کە زەواجت لەگەڵ بکات و بەمەش مەسەلەکە لەبێشکەوە زیندەبەچاڵ دەکەین، ئەوان هاوڕێیان بینی و ئامۆژگاریان کرد کە خا بهێنێت، ئابڕووی نەبات، بەڵام ئەو دەمی خۆش بێت ئەگەر بەکرموڵە و خۆڵیش بێت، گوتی" نامەوێ بەزەواج زوڵم لەو کچە بکەم، من رۆژێک لەژیانم لەدەرەوەم، بەڵام بیست رۆژ لەگرتووخانەم، لەوانەشە ساڵانێک دەستگیر بکرێم، دواتر من کارم نییە تا بژێوی بۆ دابین بکەم". باوکی جەرگبڕاو گوتی "ئێمە هیچمان ناوێ تەنها پەردەپۆشکردنی ئابڕووچوونەکە نەبێت، من ئامادەم هەردووکتان بەخێو بکەم"، بەڵام هاوڕێی( نەمر) لەسەر هەڵوێستی خۆی سوور بوو.

ئەو باوک و کورە پەنایان بۆ هاوڕێ فەهد بردو گوتیان "ئێمە لەناوچەیەک دەژین موحافزکار و پەیوەستە بەدابونەریت، ئەگەر کچەکەمان دووگیان بێت و منداڵی ببێت ناتوانین رووبەڕووی خەڵک بینەوە و لەگەڵیان بژین". فەهد قسەی لەگەڵ هاوڕێی ناوبراو کردو هاوڕێ وەڵامی دایەوەو گوتی "هاوڕێ.. زۆر شت هەیە ئێمە باوەڕمان پێی نییە و کۆمەڵگا زۆرترین بڕوای پێ هەیە، بۆیە ناچاردەبین لەگەڵی بڕۆین ئەگینا تووشی مەینەتی دەبین، لەگەڵ ئەوەی ئێمە باوەڕمان بە خوا و ئایینەکان نییە، بەڵام ناتوانین لەبەردەمی مزگەوت

بوەستین و هاوار بکەین بڵێین خەڵکینە نوێژ مەکەن خوا نییە و زیندبوونەوە نییەو ڕۆژی دوایی و بەهەشت و ئاگر نییە، لەگەڵ ئەوەی ئێمە باوەڕمان بەئایین و مەزهەبیش نییە، بەڵام ئەو خۆی بەسەر ئێمە زاڵ کردووە، من لەمەزهەبێکم (خ) لەمەزهەبێکی دیکەیە، باوکم هەندێک ڕێورەسمی ئایینی ئەنجام دەدات و لەبریدا پارە وەردەگرێت، ئەگەر من ژنێک لەمەزهەبێکی دیکە بهێنم، ئەوا خەڵک بەکرێی ناگرن و باوکم لەبرسان دەمرێت و پێگەی کۆمەڵایەتی زیانی بەردەکەوێت."

فەهد ئەو شتانەی بۆ باوک و برای کچەکە گێڕایەوە، ئەوانیش دانیشتن بۆ ئەوەی چارەسەرێک بدۆزینەوە، ئەوان بیریان دەکردەوە: ئەو ئابڕووچوونەکەی نزیک بوو ڕووی دەدا؟ ئەگەر وەها ئابڕوویان بچێت ئەوا بەهای ژیان چییە؟ مردن باشترە لەوە، بۆیە بڕیاریان دا کچەکە بکوژن و ئابڕوچوونەکەشی لەگەڵ ئەو بنێژن. لەشەوێکی تاریکدا قەساب و کوڕەکەی کچەیان کوشت و ناشتیان، لەوەدەترسان کارەکەیان ئاشکرا بێت و زیندانی بکرێن و لەسێدارە بدرێن، لەوکاتەدا بیرۆکەیەک بەخەیاڵی کوڕەکە هات، کەدەیتوانی تۆڵە لەو دزە داوێنپیسە بکاتەوە، کە بەدنمەکی لەگەڵ چاکە و نان و خوێی ئەوان کرد و ئابڕووی بردن، جگە لەمەش بەو بیرۆکەیە دەیتوانی خۆی و باوکی لەپەتی سێدارە نەجات بدات.

عەبدولوەهاب چووە بەڕێوەبەرایەتی تەحیقاتی جینائی. پۆلیسەکان بەمفەوەز و ئەفسەرەوە سەرسام بوون، پێشتر، ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا، ئاسانکاریان بۆ کرد بزانن چی دەوێ، ئەو گوتی کە لەلایەن برادەرێکی نێردراوە، ئەو برادەرە ئامادەیە شوێنی فەهد ئاشکرا بکات، بەڵام بەمەرجێک. کاتێک لێیان پرسی مەرجی هاوڕێیەکەی چییە؟ ئەو گوتی ئەو برادەرەی تاوانێکی ئەنجام داوە، بەڵام شوێنی فەهدیان

پێناڵێ تەنها دوای ئەوەی کە بەڵێن دەدەن ئەو لەسەر تاوانەکە سزا نادرێت.

بەرپرسانی تەحقیقاتی جینائی بەڵێنی ئەوەیان دا ئەگەر ئەو برادەرە شوێنی فەهد ئاشکرا بکات، ئەوا لەسەر تاوانەکەی سزانادرێت، ئەگەر تاوانی کوشتنیش بێت، چونکە تاوانی کوشتنی تاکە مرۆڤێکە، کەچی ئامادەیە تاوانبارێک ئاشکرا بکات، کە ئەگەر بۆی بلوێت حەوت ملیۆن عێراقی دەکوژێت، جا عەبدولوەهاب گوتی خۆی شوێنی مشکەکەیان نیشان دەدا، ئەو خوشکەکەی خۆی کوشتووە، چونکە یەکێک لەهاوڕێیان داوێنپیسیان لەگەڵ کردووە، بەمشێوەیە هاوڕێ فەهد لەپێناوی لەزەتی هاوڕێی ناوبراو دەستگیر کرا، بەڵام بەرپرسان مەرجی ئەوەیان دایە عەبدولوەهاب کە عێراق جێبهێڵێت، چونکە نەوەک بگوترێت پۆلیسی بۆچی لێی بێدەنگە و ئەویش خوشکی کوشتووە، من عەبدولوەهابم لەئێران بینی، ئەو چیرۆکە خوێناوییەی بۆگێڕامەوەو چاوەکانی پڕ لەفرمێسک بوون.

شیوعییەکانی عێراق نکوڵی لەو چیرۆکە دەکەن، دەڵێن (خ) زیندووەو منداڵی بووە، ئەو شووی کردووە و منداڵی دیکەی بووە، بەڵام ئەگەر هێشتا زێدەڕۆییان لەو چیرۆکە کرد، تۆ داوایان لێ بکە با ماڵی ئەو ژنەت نیشان بدەن لەگەڵ دوکانی باوکی، دواتر تۆش بڕۆ دوکانەکە و بەقەسابەکە بڵێ من کوڕەخاڵی فلانم کە زاواتە منی ناردووە جگەرێکی بۆ ببەم، ئەمە بکە بۆ ئەوەی راستگۆیی شیوعییەکانت بۆ دەرکەوێ. تەنها ئەمەش نا، بەڵکو چەندین ئابڕوچوونی دیکەیان هەیە کە رۆژنامەی الحريه ئامادە نەبوو، بڵاویان بکاتەوە، چونکە ئاستی رۆژنامەکە لەو ئەدەبەی ئەوان بەرزترە.

ئەو نامانەی لەکەسوکار و هاوڕێیانەوە لەبەسراوە بۆم دێن، هەواڵی ئەوەیان پێیە کە گوایە نووسینەکانی من شیوعییەکانی ئەوێی نیگەران کردووەو تەواو رقی هەڵساندوون و ئەوانەی هەواڵی درۆی لەو جۆرە بڵاودەکەنەوە، کە ئەوان ڕێگر دەبن لەگەڕانەوەم بۆ کارەکەم، کە هەر ئەوانیش هۆکاری فەسڵکردنەکەم بوون، ئەو نامانە دەڵێن لەتیفینۆف سکاڵایەکی لەدژی من تۆمار کردووە، پشتی بەو ماددە یاساییە بەستووە کە هەقی ئەوەی پێدەدا، چونکە ئەو هەندێک شتی دراوەتە پاڵ ئەگەر ڕاست بێت ئەوا لەناو خەڵکدا دەبێت ڕیسوا بێت.

بەو نووسینانە داچوومەوە شتێکی وام نەدۆزییەوە، کە کەسایەتیە بەڕێزەکەی لەکەدار بکەن، من نەمگوتوە ئەو کۆخەکەی لەگوند سوتاند و دواتر وای بڵاوکردەوە، کە قەومییە پیلانگێڕەکان کۆخەکەیان سوتاندووە، دواتریش سێ سەد دیناری کۆمەکەی بۆ کۆکرایەوە، لەکاتێکدا کەلوپەلە سوتاوەکانی نەدەگەیشتە پەنجا دینار، من نەمگوتووە ئەو ئابونە بۆ حزبی شیوعی کۆدەکاتەوەو لەپێناوی ئەوەش جووتیارەکان لەپێستیان دادەماڵێ و لێرەو لەوێش بەڵێنی ئەوەیان پێدەدا کە شیوعییەکان فلانە بێستان بەفڵانە جووتیار دەدا و فیسار بێستانی فیسار وەردەگرێت. ئەگەریش ئەو دە دینار بۆ حزب

کۆبکاتەوە، ئەوەی دەگاتە حزب تەنها یەک دینارە، بۆ ئەمەش دەڵێ جووتیارەکان هەژارن و پارەی ئابوونەیان نییە.

هیچ شتێکم لەو بابەتانە نەگووتوە، تەنها ئەوەندەم گوتووتوە کە ئەو ئەندامێکی حزبی شیوعی نادینی بوو و داوای لەهاوڕێیەکانی دەکرد کە بە لەتیفینۆف ناوی ببەن و ئێستا موعتەمیدی حزبی شیوعییە لەئەبو خەسیب، بۆ ئەمەش شاهێدم لەو خەڵکانە هەیە کە لەحزبی نادینی بوون و دەشزانن ئەو سکالایەی ئەو چەند پوچەڵە. با لەتیفینۆف داوام لەسەر تۆمار بکات، کە ئەو شیوعییە و دەشزانێ تاوانبارکردنی ئەو بەشیوعییەت لەنێو خەڵک خۆی و حزبە سیخورەکەیان و ڕێبازە بێباوەڕەکەیان ریسوا دەکات.

من شتێکی وەهام نەگوتووە ئەو لەکەدار بکات، بۆ نموونە نەمگوتووە کاتێک فەرەنسا باری کەوتەلێژی ئەو لەگۆڕەپانی گوند دەگریا و دەیگوت "ئەو.. ئەو فرانسە شکا". کاتێکیش ڕێبوارەکان پرسیاریان لەهۆکاری گریانەکەی کرد، وەڵامی ئەوە بوو کە مێردە خوشکەکەی حاجی(...) کە بازرگانی خورمایە، خورما دەفرۆشێتە فەرەنسا. نەمگووتوە کاتێک موحسین مەلا عەلی بێ ئامادەبوونی لەدادگا حوکمدرابوو، لەدەستی پۆلیس هەڵاتبوو، حزبی شیوعی ڕەوانەی گوندی جیکۆری کردبوو لەبێستانێک دەژیا کە خاوەنەکەی بنەماڵەی لەتیفینۆف بوو، حزب خەرجی موحسینی دەدا بە لەتیفینۆف، ئێمە لەگوند بەموحسینمان دەگوت حاجی، دواتر ئاشکرا بوو وایلێهات پۆلیس لەناو گوند بەدوای دەگەڕا، بۆیە ئەو بڕیاری دا بچێتە شوێنێکی دیکە، ئەمە بێگومان قسەی خودی موحسینە. شەوێکیشیان دەیەمین شەوی موحەڕەم بوو کاتێک ژنەکەی لەتیفینۆف هاتە ماڵەوە لەسنگی خۆی دەدا و شینی بۆ حوسێن دەکرد، کوڕەکەی کە ناوی ئەحمەدە لەگەڵی دابوو، کە تەمەنی حەوت ساڵ نەدەبوو، من لەسەر جێگا ڕاکشابووم و خەوم لێنەکەوتبوو، ئەحمەد لەتەکمەوە وەستا بە

ئاخەوە وتی "حاجی داماوە دەڕوا و باوکیشم رۆژی یەکشەممە دەچێتە بەسرا بۆ ئەوەی پەیوەندی بەحزبەوە بکات."

هیچ شتێکی لەوبارەیەم نەگوتووە، نەمگوتووە ئەو سەفەری بەغدای کرد بۆ ئەوەی لەیەکێک لەکۆنگرەکانی حزبی شیوعی ئامادەبێت، من ئەوکات لەلایەنگرانی رایە شەغیلە بووم کە لەلایەن حەیدەرییەوە سەرۆکایەتی دەکرا، کەچی لەتیفینۆف لەگەڵ جەماعەتی قاعیدە و رەفیق باسم بوو، ئەوان ئێمەیان بەسیخور دەزانی و ئێمەش ئەوانمان بەسیخور دەزانی، کەچی کە لەتیفینۆف لەبەغدا گەڕایەوە، بۆی دەرکەوتووە کە من رەتکراوەمەتەوە، چونکە من سیخورم، چونکە لەجەماعەتی شەغیلەمە، دواتریش گوتی ئەوان لەیەکێک لەچایخانەکانی نزیک ئێزگە دانیشتوون و دواتر بۆ کۆشکێک رەنگ زەرد رۆیشتوون لەفڵانە شوێن و لەوێ کۆنگرەی حزبی شیوعییان کردووە، من هیچم لەو شتانە نەگوتووە ئەی هاوڕێی ئازیز لەتیفینۆف، سکالاکەت لەپای چییە، تەنها لەبەرئەوە سوکایەتیم پێکردووی و شەرەفی تۆم لەکەدار کردووە کە گوتوومە تۆ شیوعی؟ ئەگەر لەبەر ئەوە بێت من ئامادەم قەرەبووت بکەمەوە، بەپێی دادگا دیاری دەکات.

یەکێک لەو رووداوانەی دیکە کە وام لێدەکات بەرەو بیروەرییەکان بچم، نامەیەکی براکەمە کە لەبەسراوە هاتووە، ئەو گلەیی لەو نووسیانەم دەکات و لێم دەپرسێ: ئامانج لەو نووسینانە چییە؟ ئەمە کاریگەری بەسەر شیوعییەکانەوە نییە. منیش دەڵێم ئەگەر ئەو هەقیقەتانەی من دەیانگێڕمەوە کاریگەری بەسەر ئەوانەوە نەبێت، بۆچی تا ئاستی شێتی نیگەران دەبن و تا ئەو ئاستەش کە خوێنی منیان حەلاڵ کردووەو گوتوویانە دەیکوژین و بکوژەکەش بەنادیاری دەمێنێتەوە؟

براکەم پرسیارم لێدەکات کە بۆچی بیر لە ئەو و ئایندەی منداڵەکانی ناکەمەوە؟ ئەمە پاساوێکە بۆ زۆر کەس کە وایکردووە خۆیان وەک شیوعی دەربخەن، ئەمەش لەبەر ترس بووە لەئایندەی خۆیان و ئایندەی منداڵەکانیان. ئەو کەسە ترسنۆکانە وا دەزانن کە عێراقی عەبدولکەریم قاسم دەبێتە شیوعی. ئەو کات نەک تەنها ئەو کەسانە سزا دەدرێن، کە لەسەر شیوعییەکانیان نووسیوە، بەڵکو برا و کەسوکاریشیان دەکوژن؟ برادەران مەترسن عێراق نابێتە شیوعی. ئەو سیاسەتە پێشکەوتووخوازە و حەکیمانەی زەعیم، چاکترین زامنە لەوەی کە شیوعییەت شوێنێکی شیاوی لەعێراق نابێت. کاتێک جووتیار بەپێی یاسای ئیسلاحی زراعی زەوی پێدرا، چیتر شتێک نییە لەلایەن شیوعیەتەوە تەفرەی بدات، جاران بەڵێنی ئەوەیان پێدەدا کە ئەگەر شیوعی دەسەڵات وەربگرێ زەوی پێدەدەن، ئەی ئێستا بەڵێنی چی؟ کۆشکی بەرز؟ یان ماشێن؟ یان ژنێک لەژنانی مامۆستا و کچانی قوتابخانە؟

کرێکاریش لەسەردەمی زەعیمدا مافی دراوە و رۆژانەکەی بەرزبۆتەوە، یاسای وەها دانراوە کە مافەکانی دەپارێزێت، جا شیوعییەکان بەڵێنی چی پێدەدەن؟ ئایا دەیانکەن بەوەزیر، هەزارەها کرێکار هەیە، هەر هەموویان دەبن بەوەزیر؟ یان بەڵێنەکەیان وەک ئەو بەڵێنە دەبێت، کە بەجووتیارەکەیان دابوو کە بەسەرهاتەکەی دەگێڕمەوە، بەڵێنی ئەوەیان پێدابوو کە ئەگەر حزب بێتە دەسەڵات کۆشکێک و کارەکەرێکی دەبێت، کە جووتیارەکە گوێی لێدەبێت هاوار دەکات "ئێوە درۆ دەکەن". لێیدەپرسن "بۆچی درۆ دەکەین؟". ئەویش دەڵێ ئەگەر هەرکەسێک کارەکەرێکی پێ بدەن، ئەوا ژمارەی کارەکەرەکان لەناو ماڵان چەند ملیۆنێک دەبێت، لەکوێ ئەوەندە کارەکەر دەهێنن؟ لەخەڵکی عێراق؟

باشە بۆچی ئەو چەند ملیۆن کارەکەرە لەنەوەی عێراق دەبێت کە بەڵێنتان پێداون کارەکەر و کۆشکیان پێ بدەن؟. ئەمەیە بەڵێنی شیوعییەکان. ئەوە لەو نزیکانە لە(کیرالا) روویدا، نموونەیەکی ئاشکرامان پێدەدات لەسەر دەسەلاتی شیوعی، ئەگەر کیرالا لەئەورووپای رۆژهەلات بووایە ئەوە روون دەبۆوە کە چ هەلوەشانەوە و دابەزینێک لەسەر ئاستی بژێوی و ئاستی بەرهەمهێنان هەیە.

ماوەی چەند مانگە مۆتەکەی سوور، وانەیەک بوو لەکەموکورییەکانی، گەل زانی شیوعییەت چییەو شیوعییەکان کێن، ئەگەر بهاتایە سەرکەوتوو بوونایە لەوەی دەیانەوێت و دەولەتی شیوعی دابمەزراندایە، حالەتەکە سەد جار زیاتر خراپتر دەبوو. رۆژنامەی ئیتحاد شەعب چەند رۆژێک لەمەوبەر وتارێکی بلاوکردۆتەوە، تێیدا هاتووە کە شۆرشی ١٤ی تەمموز شۆرشێکی بۆرژوازییە. ئایا بەرپرسان درک بەمانای ئەمە دەکەن؟ ئەمە مانای ئەوەیە کە دەبێت شۆرشێکی دیکە بکرێت، کە شۆرشێکی پرۆلیتاری پێچەوانەی ئەو شۆرشی بۆرژوازییە بێت. تەواو وەک ئەوەی لەرووسیا لەدوای شۆرشی بۆرژوازی بەسەر دەسەلاتی قەیسەرەکان روویدا و لینین هات و شۆرشی بەلشەفی دژی بۆرژوازەکان کرد.

لەچەند مانگی رابردوودا بەئاشکرا دەرکەوت کە ئەمە خەونی شیوعییەکانە، پیلانگێری و نەخشەدارشتن و چەک و ئەو پارانە کە بەدەستیانەوە گیرا، دەسپێک بوو بۆ ئەو شۆرشە پرۆلیتارییە، دوای ئەمەش شیوعییەکان شەرم لەمە ناکەن، کە بانگەشەی ئەوە بکەن، ئەوان نیشتمانپەروەر و دلسۆزی ئەو کۆمارە نەمرەن.

ئەگەر ئەخلاقە بەرزەکەی رۆژنامەی حوریە نەبوایە وەها ئابروم دەبرد، بەهیچ شێوەیەک ئابروچوونەکەتان دانەپۆشرایەو ئەوکاتە دەمامک و ئەخلاقی ئەو ژنە شاعیرەم ئاشکرا دەکرد کە دواتر بۆتە

(ڕەفیقە)، باسی ئەو هاوڕێیە گەورەم دەکرد، کە سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکانی بەغدا بوو، کە دوو مانگی تەواو لەماڵەکەی مامەوە، ئەو هاوڕێیە ژوورێکی بۆ کۆبوونەوەکانی ڕێکخستن تەرخانکردبوو، بەڵام تێیدا تەنها لەگەڵ ژن و کچان کۆدەبۆوە، کاتێک لەگەڵیان کۆدەبۆوە لەژوورەوەش دەرگاکەی شیش دەدا. گوایە ئەوان لەبارەی شتی زۆر نهێنییەوە قسەدەکەن و دەبێت ئاگاداری خۆیان وەربگرن؟ ڕۆژێک فزوڵیەت و گومان هانی دام لەکونی دەرگاکەوە سەیری ژوورەوە بکەم، چیم دی؟ خوێنەری ئازیز تۆ درک بەوە دەکەی، کە چیم بینیوە، ئەمە ئەخلاقی شیوعییەکانەو ئێستا ئاشکرایە، پێویست بەوە ناکات بۆ سەلماندنی ئابرووچوونی دیکە باس بکەین.

کەسێک هەندێک شتی بۆ گێڕامەوە کە لەو کاتە بینیویەتی کە لەزیندان بووە، ئەو ئێستا هاوڕێیەکە لەئێوە. باسی لەوە دەکرد هەندێک فەرمانی حزبی دەهات داوای لەگەنجەکان دەکرد بەتایبەتی ئەوانەی کە قۆز بوون، دڵی هاوڕێیەکانیان خۆش بکەن، ئەوانیاش داواکەی حزبە مەزنەکەیان بەجێدەگەیاند! ئەوەیە ئەخلاقی ئێوە. من داوا لەو برایانە دەکەم کە ماوەیەک بەئێوە هەڵخەڵەتابوون و دواتر ڕاستی ئێوەیان بۆ دەرکەوت، با ئابڕووچوونەکانی ئێوە ئاشکرا بکەن، ئەوا خزمەتێکی دیاری نیشتمان دەکەن، من داوا لەدکتۆرە عەدەویە مەحمود ئەدیب دەکەم، کە باسی ئەوە بکات چی لەزیندان بینیوە لەو ژنانەی کە هاوڕێ شیوعی بوون، ئێوە پرسیار لەدکتۆرە بکەن، بۆچی لەئێوە جیابۆوە، پرسیاری ئەوە بکەن بۆچی کەسانی دیکە لەئێوە جیابوونەوە.

جا براکەم لێم دەپرسێ: ئامانج لەو نووسیانانە چییە؟ وەڵامی دەدەمەوەو دەڵێم ئێمە لەشەڕی باوەڕین دژی شیوعییەکان، مەترسی شیوعی لەمەترسی ئیمپیرالیزمی چەپەڵ کەمتر نییە، لەتوانامان هەیە لەئیمپریالیزم و سیخور و بەکرێگیراوە ناپاکەکانی نەجاتمان بێت،

نمونەی نوری سەعید و جەماعەتەکەی لەحیلفی بەغدا، بەڵام ناتوانین لەمۆتەکەی شیوعی و دەسەڵاتی شیوعیەت نەجاتمان بێت ئەگەر تێوەگلاین، ئێمە لەجیهاد بۆ داکۆکیکردن لەنەتەوە و ئاین و کولتور و نەریتمان، داکۆکی لەسەربەخۆیی و کیانەکەمان دەکەین، بۆیە با بەیەکەوە بین ئەی نەیارانی شیوعی، جا لەهەر دین و نەتەوە و توێژێکن.

نامەوێ دووبارە قسە لەسەر شتێک بکەمەوە، کە هەموو خەڵک دەیزانێ، هەموومان راپەرینە مەزنەکەی کانونمان لەبیرەو دەزانین کە لایەنە نیشتمانپەروەرەکان تەنانەت هەموو گەل ئەنجامی دا و لەوانەشە رۆڵی شیوعییەکان تێیدا بێماناترین رۆڵ بێت. بەڵام دوای ئەو سەرکەوتنە بێ وێنەیەی گەل بەدەستی هێنا، شیوعییەکان هەموو سەروەرییەکانی راپەرینەکە و قارەمانێتییەکانیان دایەپاڵ خۆیان، ئەو شەهیدانەی کە مەیلیان بۆ هیچ حزبێک نەبوو، ئەوان بەشەهیدی شیوعیان هەژمار دەکرد، تەنانەت دەحامی حەمبال کە بۆ داکۆکی لەحزبی شیوعی شەهید نەبوو، بەڵکو هەستی ئایینی و نیشتمانی پاڵنەری بوو، وایدەزانی کە دژایەتی ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوەکانی جیهادە، ئەویش بەشەهیدی شیوعی دانرا، تەنانەت بینیمان کە چۆن شیوعییەکان بانگەشەیان بۆ شۆرشی تەمموز دەکردو بە هی خۆیان دەزانی، کەچی حزبی شیوعی تاکە حزب بوو کە لەگەڵ شۆرشی تەمموز یاوەر نەبوو، بۆیەش دەستی بەدەستکەوتەکانی ئەو شۆرشە رانەگەیشت.

ئەوانەی بەو شۆرشەش هەڵسان رۆڵەکانی گەل بوون، زۆر چاکیش دەیانزانی مێژووی ئەو حزبە بەکرێگیراوە پڕە لەناپاکی و ئیعترافات، بۆیە لەخۆیان دڵنیا نەبوون، کە بەشداری بەو حزبە ناپاکە بکەن و نهێنییە ترسناکەکانی شۆرشیان لەلا ئاشکرا بکەن، ئەگەر واشیان بکردایە ئەوا بێگومان هەواڵەکانی ئەو شۆرشە چاوەڕوانکراوە دەگەیشتە دائیرەی تەحقیقاتی جینائی.

زەعیم کاتی خۆی نێردراوێک دەنێرێتە لای حزبی شیوعی و پرسیاری موعتەمەدەکەیان لێدەکات لەسوپا بۆ ئەوەی لەپێناو شۆرش بەشداری پێ بکرێت، ئەوان ناوی ئەو ئەفسەرە موعتەمەدەیان پێ دابوو، کە ئەفسەرێکی هیچ و پوچ بوو، ئەگەر ئەو ئەفسەرە لەشۆرش بەشدار بووایە، ئەوە دەبوو بەلەکەیەک و بەهای شۆرش بەبەرچاوی سەربازەکانەوە کەم دەبۆوە.

ئایا خوێنەر دەزانێ، کە یەکێک لەسەرکردەکانی حزبی شیوعی وەکیلی تەحقیقاتی جینائی بوو، موچەیەکی بێنرخی لەبەرامبەر فرۆشتنی ویژدانی خۆی وەردەگرت؟ ئەگەر خوێنەر ئەوە نازانێت، با ئێستا بیزانێ.

کاتێک هەندێک ئازادی درا، حزبە شیوعییەکەمان چالاک بوو، خۆپیشاندانەکانمان شەقامەکانی پڕ دەکرد، تەنانەت هاتوچۆشی دەوەستاند، خەڵک لەمەدا تووشی شۆک دەبوو، بەڵام مەبەستی حزب ئەوەبوو کە هێزی خۆی بۆ خەڵک دەربخات. هەرچی کەناس و حەمباڵ و تەنانەت تاوانبار و گیرفانبڕیشمان بۆ خۆمان راکێشا بوو، ئەویش بە بەڵێنی شیرینی وەک کۆشک و خانمی حوری ئاسا. لەوەدا زۆر سەرکەوتوو بووین. خەڵکانێک لەدانیشتوانی کەرادە، کۆڕێکی ماتەمینیان بۆ شەهیدانی راپەرینەکە ئامادە کردبوو، منیش بانگهێشت کرابووم، کە بەشداری لەو کۆڕە بکەم، نەیاندەزانی من شیوعیم،

تەنانەت (محەمەد شەرارە)ش داوەتکرابوو، نەیاندەزانی کە ئەویش شیوعییە.

ئەوەی قەسیدەکەی من و وتارەکەی محەمەد شەرارە بخوێنێتەوە، کە لەوێ خوێندرایەوە، بە روونی تێبینی ئەو هێڵە شعوبی شیوعیە دەکات، لەقەسیدەکەی من هاتووە:

**مازال يملأ مسمع الأحقاب**

**ذاك الهدير من الدم المنساب**

**يعلو فيرتجف الطغاة وتحمي**

**أسطورة الأحساب و الأنساب**

ئایا رەچەڵەک و ئەسڵوفەسڵ چ پەیوەندی بەڕاپەڕینی گەل هەیە لەبەرامبەر زوڵمدا؟ ئەمەیان شعوبیەتە کە لەوەدا تورە دەبێت و مێشکی دەتەقێت، کە عەرەبێک بڵێت من عەرەبم، وتارەکەی محەمەد شەرارەش هەموو تایبەت بوو بەهێرشکردنە سەر حەجاج، ئەو پاڵەوانەی کە دەیوست پارێزگاری لە کوفە بکات لەدژی داگیرکەرانی فارس و هەر ئەو سیستەمێکی نەمری دا کە کەسێک ناچێتە کوفە عەرەب نەبێت.

داماوەکان عەرەبن، چاکەیان لەگەڵ نەتەوە ژێردەستەکان کرد، کەچی نەوەی ئەو نەتەوانە دوای تێپەڕبوونی ١٣٠٠ ساڵ، زیاتریش قینیان بۆ عەرەب حەشار داوە، ئایا عەرەب نەبوو وای لەفارسەکان کرد، کە ببنە وەزیر و دەسەڵاتدار و فەقیە و ئیمام کە عەرەب لەدوایانەوە بێت؟ ئەو خێزانە فارس و هیندی و ئەفغانییانە نەبوون، کە بەرەو عێراق هاتن و تێیدا نیشتەجێ بوون، ئایا منداڵەکانی ئەوان لەهەموو شوێنەکان دەرنەکەوتن؟

ئێمە ڕەچەڵەکی هیچ کەسێک بەنەنگ نازانین، ئەو کەسەی کە بۆ ئەو نەتەوەیە دڵسۆزە، کە لەوڵاتی خۆی دەژی و قسە بەزمانەکەی خۆی دەکات و خۆی بەتاکێکی نەتەوەکەی خۆی دەزانێ، بەڵکو لەگەڵ ئەو نەتەوانەم دایە، کە لەوڵاتانی عەرەبی دەژین و لەپیتاکی ئەوان دەخۆن، دواتریش پیلان بۆ عەرەب و عروبە دادەڕێژن، من بیرتان دەهێنمەوە، کە بەڕێزان ئێوە بۆیە رقتان لەنەتەوەکەی ئێمەیە و دوژمنایەتی دەکەن، لەبەر ئەوەی دەزانن لەئێمە نین و هێشتا دەمارگیرن بۆ خوێنی غەیرەعەرەب.

لەو ڕۆژگارەدا دەنگی شعوبیەت ئاشکرا و بەرزدەبێتەوە، برایانی جولەکە پێشتر دەیانزانی دەوڵەتە سۆزانیەکەیان دادەمەزرێت، بۆیە دەیزانی چاکترین خزمەت کە پێشکەشی دەوڵەتی جولەکە بکەن ئەوەیە کە بخزێنە ناو حزبی شیوعی و بەوشێوەیە بەڕێوەی ببەن، کە بەرژەوەندی جولەکەی جیهانی دەیەوێت، هاوڕێیان یەهودا سدیق و عەدس و ساسۆن حەسقیل، کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی بوون ئەوکات، لەوە سەرکەوتن کە حزب بخەنە خزمەتی زایۆنیزم و ئیسرائیل، جولەکەکان دەستێکی باڵایان هەبوو، تەنانەت لەڕاپەرینەکەش، چاویان لەوەبری بوو کە حزبی شیوعی کە خۆیان بەڕێوەیان دەبرد، دەسەلات بگرێتە دەست، چونکە ئەوکات سوپا نانێرێتە ئیسرائیل، یان بەسەر شەقامەوە زاڵ دەبێت نێوانی سوپا و حکومەت بکات، یان بەلایەنی کەمەوە لەدواوە لەسوپا بدات.

شیوعیەکان نوکتە و سەرنجیان لەسەر ئەو بابەتە هەیە، بۆ نموونە، ئەوان وشەیەکی نەشیاو بۆ (دواوە) بەکاردەهێنن و دەڵێن سوپای عێراق کە لەپێشەوە هینەکەی دڕاوە، چۆن دەتوانێت پارێزگاری لەدواوە بکات؟

لەو خۆپیشاندانەی شیوعی کە لەگۆڕستانەکەی باب موعزەم کۆتایی هات و ئەوکات شاعیر و وتارخوێنەکان چوونە سەر دیواری گۆڕستانەکە بۆ ئەوەی وتار و قەسیدەکانیان بخوێننەوە، ئەوەی ئەو ڕووداوەی بەبیر بێت، ئەوەشی بیردێتەوە کە کچێکی سپی و خرپن کە تەمەنی ١٥ ساڵ کەمتر یان زیاتر بوو، شیعرێکی خوێندەوە، کە شاعیرێکی ناسراو بۆی دانابوو، دەیانگوت ئەو شاعیرە خۆشی دەویست، ئایا ئەو کیژۆڵە خەباتگێرە کێ بوو؟ ئەمە مادلینی جولەکە بوو، کە چیرۆکێکی لەگەڵ من هەبوو، دواتر چیرۆکێکی لەگەڵ هاوڕێ باسمی سکرتێری حزب هەبوو.

من ئارەوزووی ئەو کچەم کرد، کە لەلای دیواری گۆڕستانەکە شیعری خوێندەوە، بەڵام هێندەنەبوو لەبیرم کرد، ڕۆژێکی نیوەڕۆ بوو لە ١٩٥٠ یان ١٩٥١ بوو، من لەلای چایخانەی زەهاوی تێدەپەڕیم، کاتێک کچێک منی ڕاگرت، ئەو کچە پیاوێکی پیری لەگەڵ دابوو، دواتر زانیم ئەو پیاوە کەفیلی بووە کە لەگرتوخانەی دەرهێناوە، ئەو ڕایگرتم و گوتی "مامۆستا بەدر، مامۆستا بەدر". منیش وەستام و بێ پێشەکی و بێ ئەوەی خۆی بناسێنێ گوتی "دیوانێکی شیعری باشت هەیە، بەڵام نەمبینیوە، ئایا پێم دەدەی؟ منیش گوتم کامیان گوڵە سیسبووەکان یان ئەفسانەکان، هەردووکیان لەبازاڕ هەیە و شیعری دڵدارین، غەزەلن.

ئەو هاوڕێیە گوتی "ئێمە بە دوای غەزەل ناگەڕێین، شیعری خەباتمان دەوێت". ئەوسا زانیم کە ئەویش لەخەباتگێڕە شەریفەکانە، زانیشم کامە دیوانی مەبەستمە، من قەسیدەیەکم هەبوو، تا ئێستاش تەواوم نەکردووە، بەڵکو فەرامۆشم کردووە، تێیدا باس لەخەباتی شیوعییەکان دەکەم لەهەر شوێنێک بن، لە چین و یۆنان و یەکێتی سۆڤیەت، ژوانێکمان دەستنیشان کردو منیش ئەو دەفتەرەم پێدا کە

قەسیدەکەی تێدا نووسرابوو، پرسیاری ئەوەی لێکردم کە بڵاوکراوەکانی حزبم پێدەگات، منیش بە بەڵێ وەڵامم دایەوە، بەڵێنی ئەوەمان دا کە لەهەفتەی داهاتوو یەکتر ببینینەوە، هەفتەی داهاتووش هات و ماوەیەک پیاسەمان کرد و باسی کاروباری خەباتمان کرد و لەهەفتەی سێیەمیش یەکترمان بینیوە.

ئەوە مادلین بوو، کە دوو ساڵ لەمەوبەر ئارەزووم کردبوو، ئەوە ئێستا هاتۆتە لام، منیش غەزەلێکم لەبارەیەوە نووسیوە، بەڵام کراسێکی شڕی خەباتم بەباڵای غەزەلەکە پۆشیوە، لەسەر کاغەزێکی شینی بۆندار، پێمدا و دڵشادبوو پێی، جیابووینەوە، بەڵام بەڵێنی ئەوەمان دا کە دیدارێکی دیکە بکەین، من دەڕۆیشتم بیرم لەو ژوانە چاوەڕوانکراوە دەکردەوە، سووربووم لەسەر ئەوەی کە ئەو جارە بیبەمە هۆتێلێک لەو هۆتێلانەی کە بەنهێنییەکانیەوە ناسراون.

لەهەفتەی چوارەمدا چاوەڕوانم کرد، بەڵام سەعاتێک تێپەڕی هەر نەهات، دوای ئەوەی بێزار بووم منیش ڕۆیشتم و دواتر زانیم کە پۆلیس دەستگیری کردووەو دواتر ئازادی کردووە، بەڵام نەمبینیەوە. دەنگۆیەکی وەها بڵاوبووەوە، کە حکومەت دەیەوێ مادلین بگرێت، چونکە جولەکەیە و بۆیە کە بیگرێت رەگەزنامەکەی لێدەسەنێتەوەو رەوانەی ئیسرائیلی دەکات، مادلین ئەندامێکی چالاک و دڵسۆزی حزبی شیوعی بوو، برا شەریفەکەشی ئەندامی حزبی شیوعی بوو، ئەو کات لەزیندانی نوگرەسەلمان بەندکرابوو، هاوڕێیان زۆر سودیان لێوەرگرتبوو، دڵی ئەوانی خۆشکردبوو. یەکێک لەهاوڕێیان کە ئێستا هاوڕێیەکی گەورەیە لەنێو سوڕایەوە کە ئەو کات لەبەڕێوەبەرایەتی هاوردەکردن بووین، ئەو هاوڕێیە گوتی هاوڕێیەکی کچمان هەیە، کە جولەکەیە، گەنجە و جوانە، حکومەت دەیەوێ رەگەزنامەی لێبسێنێتەوەو رەوانەی ئیسرائیلی بکات، ئەگەر موسڵمانێک بیخوازێت ئەویش دەبێتە موسڵمان و ئەوکات حکومەت ناتوانێت رەگەزنامەکەی

لێسەنێتەوە، کێ دەیخوازێ؟ من ناوی خۆم تۆمارکرد، بۆ ئەوەی زەواجی لەگەڵ بکەم، مامۆستا محەمەد شەرارەش ناوی تۆمار کرد. سەیر نییە، راستە محەمەد خێزاندارە و لەتەمەنی پەنجا ساڵی دایە، راستە کچەکانی لەتەمەنی مادلین یان لەوانەیە گەورەتریش بن، بەڵام بۆ ئارەزووی شیوعییەک سەیر نییە.

جا سیفەتی هەریەکێ لەئێمەیان تۆمار کرد، وەک مووچەت چەند و ئەندامانی ئەو خێزانەی کە بەخێوی دەکەی وئایا زەواجت کردووە یان نا، دایکت مردووە یان زیندووە، چەندین زانیاری دیکە. هەفتەیەک چاوەڕێمان کرد، بێئەوەی ئەنجامێک هەبێت، کاتێک لەبارەی داواکارییەکانمان پرسیارمان لەهاوڕێیان کرد، گوتیان ئەو بیرۆکەیە لەمێشکی خۆتان دەربهێنن، چونکە مادلین پەناگەیەکی ئارامی دۆزیوەتەوەو لەچاوی پۆلیس بەدوورە، دواتر زانیم ئەو چۆتە ژێرزەمینی حزب لەگەڵ هاوڕێ باسمە کە ئەو کات سکرتێری حزب بوو.

ئەوکات مادلین سەرنجڕاکێش بوو، هاوڕێ باسمیش ئەوە نەبوو کە ئەو نێچیرە بەنرخە لەدەست خۆی بدات، ئەو (دۆن خوان)ێکی بەناوبانگ بوو لەسلێمانی بەر لەوەی ببێتە سکرتێری حزب، بۆیە توانی بگاتە مەبەستی خۆی، جا بە تەفرەدان بێت یان ناچارکردن بێت. ئەگەر پڕی بداتێ و بیەوێت لاقەی بکات، دەتوانی چی بکات، ئەو لەژنەکە بەهێزترە، ئایا هاوار بکات؟ ئەوکاتەش پۆلیس دێت و خۆی و سکرتێری حزب دەستگیر دەکات.

هەندێک دەڵێن بەوە رازی کردووە کە ئەو مێردیەتی و پەیوەندی نێوانیان زەواجە، بەڵام ناچێت حاکمیک یان قازییەک بێنێت بۆ ماڵی حزب مارەیان بکات، بۆیە زەواجەکە بەشێوەی کاتی بێ مارەکردن دەبێت.

مادلین دووگیان بوو، ویستی خوای تۆ ئەوە بوو کە پۆلیس توانی هەموو ئەوانە دەستگیر بکات کە لەماڵی شیوعی دابوو، هاوڕێ باسم و دۆستەکەی، یان هاوسەرە بێ مارەییەکەی دەستگیر کران، لەزیندانی ئافرەتان مادلین کوڕێکی بوو، دەبێ ناوی چی بێت؟ ناوی سەلام بوو، ناوێکی جوانتر لەسەلام هەیە، ئەو کوڕی حزبە، بۆیە جوانترە بۆ حزب کە پاڵەوانی کۆشتارگەکەی کەرکوکە ئاشتی بەرپابکات!

دکتۆرە عەدویە مەحمود کە ئەوکات لەزیندانی ژنان زیندانی سیاسی بوو، لەدایکبوونی سەلامی بینبوو، مەبەستم سەلامی عالمی نییە، بۆیە ئەو کاتە درکی بە ئامانجە بەرزانە کرد کە باوەڕی پێبوو و خەباتی بۆ دەکردو گەنجایەتی و کارەکەی خۆی لەسەر دانابوو، لێرەوە دکتۆرە لەشیوعیەکان هەڵگەڕایەوە.

من لێرەوە داوا لەدکتۆرە دەکەم کە ئەمە جاری دووەمە داوای لێدەکەم بیروەرییەکانی لەبارەی شیوعیەت و حزبی شیوعی بنوسێتەوەو بەمەش خزمەتێکی گەورە پێشکەشی نەتەوەکەی دەکات.

بەبڕوای من ئەو دەروازەیەی کە من دەینووسم دەبێ تایبەت بێت بەبەرەنگاربوونەوەی شیوعیەت و شیوعییەکان و ئابڕووبردنی تاوان و سەرشۆڕییەکانیان، جا ئەو کارە یان لەڕێگەی گێڕانەوەی یادگارییە تایبەتەکانی من دەبێ، کە ئەو ئابڕووچوونانە باس بکات، یان لەڕێگای گێڕانەوەی بیرەوەری هاوڕێیەک دەبێت، کە باوەڕم پێیەتی، یان لەرێگای ئەو نووسینانەوە ئەو کارە دەکرێت، کە لەلایەن ئەدیبانی ئینگلیز و ئەمریکا و تەنانەت خودی شیوعییەکانەوە نووسراون.

لەتوانای شیوعییەکاندا هەیە، کە بەدرۆزن تاوانبارم بکەن، ئەگەر هاتو بیرەوەرییەکی خۆم یان هی هاوڕێیەکی باوەڕپێکراوم گێڕایەوە، یان دەتوانن ئەو نووسینانەش بەدرۆ بخەنەوە، کە لەلایەن ئینگلیز و ئەمریکییەکان و غەیرەئەوان نووسراون، بەبیانوی ئەوەی ئەوانە بەکرێگیراوی ئیمپریالیزمی جیهانین و ئەو نووسەرانە بەجونەی و دۆلار بەکرێگیراون، بەڵام شیوعییەکان ناتوانن نکوڵی لەو نووسینە بکەن، کە لەلایەن نووسەرێکی شیوعی سۆڤیەتی نووسراوە، بەتایبەتیش کاتێک دەزانرێت کتێبەکەی لەسەر ئەرکی یەکێتی نووسەرانی سۆڤیەت و حکومەتی سۆڤیەتی چاپکراوەو دواتریش

خانەی زمانە بیانییەکان لەمۆسکۆ وەریگێڕاوەو بڵاویکردۆتەوە، دواتریش هاوڕێیانی عێراقی شەرەفمەند هاتوون وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و لەخانەی بەغدا بڵاویان کردۆتەوە.

ئەوان ناتوانن وەرگێڕەکان بەوە تاوانبار بکەن، کە دەستکاری تێکستەکانیان کردووە، ئەوەی من ئەمڕۆ دەیکەم ئەوەیە بۆ خوێنەر چەند نموونەیەک لەئەخلاقی شیوعییەکان دەردەخەم، کە لەو کتێبەدا هاتووە "خاکی بەیار کە کێڵامان" لەلایەن شولۆخۆفەوە نووسراوە، شیوعییەکانی عێراق وەریانگێڕاوەو بڵاویان کردۆتەوە.

هەندێک خەڵک بەتایبەتی ئەوانەی شیوعین و حزبی نین، حەز دەکەن بگوترێت کە شیوعییەکانی عێراق بە بەدڕەوشتیان لەشیوعییەکانی دیکە جیا دەکرێتەوە، ئەمە قسەیەکە هیوایەکی ئەوەی تێدایە، کە حزبی شیوعی عێراقی باش بێت کاتێک کەسانی رۆشنبیر و پاک کۆمیتەی ناوەندیان بەدەستەوە گرت.

بەڵام ئەمە ورێنەیەکە دەبێت لەخەیاڵمان نەمێنێت، چونکە ئاکاری شیوعییەکان (جگە لەشیوعییەکانی یوگسلاڤیا کە لەئەلقەی داهاتوودا باسیان دەکەم) ئەگینا لەهەموو دونیا وەک یەکە، بۆیە ئاکاری حزبی بەلشەفی کە یوسف ستالین بەڕێوەی دەبات، کە یەکێک لەچوار فەلسەفەی مارکسی، لەگەڵ ئاکاری حزبی شیوعی هاوشێوەیە کە لەلایەن حوسێن رەزەوی بەهبەهانی بەڕێوەدەبرێت، کە پێشتر مامۆستای نواندن بوو لەخانەی مامۆستایانی لادێ و دەرچووی خانەی مامۆستایانی سەرەتایی بوو.

لەهەموو کات و شوێنێکدا سێ تانەمان گوێبیست دەبێت، کە لەلایەن خەڵکەوە لەشیوعییەکان دەدرێت، ئەو چەند مانگەی کە مۆتەکەی شیوعیەکانمان لەدەسەڵات بینی، ئەو وێنەیەمان بینی، کە کوشتارگەکەی کەرکوک نیشانی داین چۆن شیوعییەکان منداڵان دەکوژن و دەیانخەنە ناو زبڵدانەوە .

ئێمە ئەگەر لاپەڕەی ٦٦ لەڕۆمانەکەی شلۆخۆف (زەوییە بەیارەکەی کە کێڵامان) بکەینەوە، لەوەرگێڕانە عەرەبیەکەی، کە خودی شیوعییەکانی عێراق بڵاویان کردۆتەوە، بەڵگەیەکی روون لەسەر دڵڕەقی شیوعییەکان و دڕندەیی ئەوان دەدۆزینەوە، دەزانین کە دەروونە شەڕانگێزەکەی ئەوان بەزەیی نییە.

رووداوەکانی ئەو رۆمانە لەگوندێکە کە شیوعییەکان دەیانەوێت چیرۆکێکی هاوبەشی تێدا دروست بکەن و کۆلاکەکان (موڵکدارەکانیان) دەربکەن، بۆیە دەیانەوێت دەست بەسەر منداڵەکانیان و جلوبەرگ و یارییەکانیان دابگرن، بەڵام یەکێک لەوانەی کە ئەرکی دەستبەسەرداگرتنی پێسپێردراوە ناوی ئەندرییە، کەسێکی خاوەن دڵ و ویژدانە، بۆیە ئازار لەو دیمەنانە دەکێشێت کە دەیبینێت. جا ئەوەی خوارەوە ئەوەیە کە نووسەری سۆڤیەتی نووسیویەتی لەبارەی ئەندەریە و ئەندامانی شانەی شیوعی لەگوندەکە کە لەلاپەڕە ٦٦و ٦٧و٦٨ وەرگێڕانە عەرەبیەکەی رۆمانەکە هاتووە .

ئەندەریە چاوەکانی لەوان ئەبڵەق کردو لێوەکانی تەتەڵەی دەکردو بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی:

-هەموو شتێک تەواو بوو، من لەوەی ئەو کارە بەشداریتان لەگەڵ ناکەم.

-کامە کار؟

-ناجۆلنۆف کە سکرتێری شانەی شیوعی بوو، تۆپەڵەکانی هەژمارکردنی دوورخستەوە "چیتر ناچم دەست بەسەر مرۆڤێک دابگرم، پێویست بەوە ناکات چاوەکانت لەمن زەق بکەیتەوە، با جەڵتەیەک لێت نەدا."

-لەوانەیە زۆرت خواردبێتەوە؟

داڤیدۆڤ کە نێردراوی حزب شیوعی بوو بۆ گوندەکە، بەوردی لەو سەرنجەی روخساری ئەندریە بوو، کە لەموکڕییەکەوە روابوو، گوتی:

-ئەندریە چیتە؟ مەسەلەکەمان بۆ روون بکەوە.

ئەو ئاوازە هێمنەی کە لەدەنگی بیستراوی داڤیدۆڤ هەبوو ئەندریە وروژاند و زمانی گرت و لەتورەییان دەلەرزی:

-من هێشتا فێری ئەوە نەبووم جەنگ لەدژی منداڵان هەڵبگیرسێنم، مەسەلەکە لەبەرەکانی جەنگ جیاواز بوو، مرۆ لەوێ خۆی ئارەزووی شمشێر دەکات، لەوانەی کە رووبەڕوویان دەبێتەوە، بەڵام من لەو کارە بێزاربووم و ناگەڕێمەوە سەری.

دەنگی بەرز دەبۆوەوە وەک لەرەلەری ژێیەک کە بیەوێت بپچڕێت، بەڵام دوای بێدەنگیەک کە لەدەنگی سەرەمەرگ دەچوو، دەنگی لەناکاو نزم بووەوە:

-ئایا دەکرێت بەو شتانە هەڵبستی؟ دیقەت لەوە بدەن! من سەربڕ نیم. من دڵم هەیە، بەشداریم لەجەنگ کردووە، ئەوە بەسیەتی. سەرلەنوێ هاوارەکانی دەستی پێکردەوە.

-جاییف یانزە منداڵی هەیە. ئای لەهاوارەکانیان کاتێک کە هاتن. هەستم کرد قژەکانم قوت دەبێتەوەو چاوەکانم نوقاند، گوێچکەکانم کەڕ کرد، بەرەو تەوێڵەکە رام کرد، ژنەکانم لەهۆش خۆدەبرد و ئاوی ساردم بەدەموچاوی بوکەکە و منداڵەکانی دادەکرد، دواتر.. ئایا لەکۆڵ ئەو کارەم ناکەنەوە؟

ناجۆلنۆف کە بەناولەپەکانی ماسولکەکانی دەموچاوە لەرزیوەکەی گرتبوو، چاوەگڕگرتووەکانی لێ ئەبلەق کردبوو ئامۆژگاری کرد:

-کەواتە بگری. ئەمەیان تۆزێک بارت سوک دەکات.

-بەڕاستیش کارەکە شایەنی گریانە. ئای. کاتێک بیر لەوەدەکەمەوە کە ئەگەر ئەمەیان کوڕی من بوایە.

دواتر ئەندریە لەقسەکردن وەستاو ددانەکانی لێک گیرکردو رووی خۆی سووڕاند، پشتی لەمێزی خوانەکە کردو هەموویان بێدەنگ بوون.

داڤیدۆڤ لەسەر خۆ هەڵسایەوە، هەر لەسەرخۆش روو بەڕەنگی شینی مردوان دادەپۆشرا و بەرەو ئەندرەیە رۆیشت و شانی گرت و بێ ئەوەی توانا بداتە خۆی بەرەو خۆی سوڕاند و بەهەناسەسورایەوە چاوەکانی لەسەر ئەندرییەوە چەسپاو بوو.

-تۆ بەزەییت بەوان دێتەوە.. حاڵی ئەوان دەلاوێنیتەوە. باشە، ئایا ئەوان بەزەییان بەئێمە هاتۆتەوە؟ بۆ هەتیوەکانمان گریاون؟ کەواتە چی؟ دوای مانگرتنەکە باوکمیان لەکارگەکە دەرکردو دواتر بۆ سیبریا دووریان خستەوە. ئێمە چوار منداڵ بووین لەگەڵ دایکمانماینەوە. من کە گەورەکەیان بووم تەمەنم دەگەیشتە ٩ ساڵ، شتێک نەبوو بیخۆین، دایک ناچار بوو(سەیری من بکە) کە لەشفرۆشی بکات بۆ ئەوەی نەهێڵێت لەبرسان بمرین، موشتەریەکانی دەهێنا ماڵەوە، ئێمە لەژووری نووستنێک دەژیان و لەژووری نووستنەکەش تەنها قەرەوێڵەیەک مابوو، ئێمە لەسەر زەوی دەخەوتین لەپشت پەردەیەکەوە، هەندێک لەموشتەرییەکان سەرخۆش بوون، دەستم دەخستە سەردەمی خوشکە بچووکەکانم، بۆ ئەوەی نەهێڵم بگرین، ئەی کێ فرمێسکەکانی ئێمە وشک دەکاتەوە؟ ئایا گوێت لەمنە.. بەیانیش ئەو رۆبڵە نەفرەتییەم دەبرد...

داڤیدۆڤ ئەو دەستەی کە پڕ ئاسەواری زام بوو ختسیە سەر لووتی ئەندریەو لەئازارا ددانەکانی جیڕ کردەوە.

-ئەو رۆبڵەی کە دایکم بەدەستی هێنابوو، دەمبرد بۆ ئەوەی نانی پێ بکڕم.

دواتر مستەکۆڵەیەکی رەشی بەمێزی خواردنەکە کێشا وەک ئەوەی هەست بەمەزنیتی بکات و هاواری کرد:

-تۆ چۆن دەتوانیت بەزەییت بەوان بێتەوە؟

دووبارە بێدەنگیان بەسەردا زاڵ بوو، لەو سەری مێزەکەوە ناجۆلتۆڤ دانیشتبوو، وەک ئەوەی نێچیرێکی بەدەستەوە بێ دەستی ئەندریەی گرتبوو، ئەندریە بێدەنگ بوو و دافیدۆڤیش هەناسەی بزڕکابوو، دواتر هاتوچۆیەکی بەشوورەکە کردو لەسەر قەنەفەکە دانیشت و باسکەکانی لەخۆیەوە ئاڵاندبوو و بەدەنگێکی پچڕ پچڕ دەستی بەقسەکرد:

-ئایا دروستە ئەی دەبەنگ بەوشێوەیە هاوار بکەیت و بڵێیت من لەوکارە بەشداریتان لەگەڵ ناکەم. بەزەییەم بە منداڵەکان دێتەوە. تۆزێک بیر بکەوە لەوەی بەئێمەت گوت؟ ئایا لەبەزەییت بەخێزانی کۆلاکەکان دێت؟ کە ئێمە دەریان دەکەین. بەڵام ئێمە تەنها بۆ ئەوە دەریان دەکەین بۆ ئەوەی رێگریمان لێ نەکەن، کە ژیانێکی پاک دوور لەچەپەڵی بونیاد بنێین. تۆ نوێنەری دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤیەتی لەجربمیاچ . ئایا وا نییە؟ بۆیە منیش بەوە هەڵدەستم کە پڕوپاگەندەت بۆ بکەم.

هەوڵیدا زەردەخەنەیەک بکات.

-ئێمە کۆلاکەکان دەردەکەین و رەوانەی لای شەیتانیان دەکەین، لەلای سۆلۆڤسکی، بەڵام ئەوان نامرن، ئەگەر کار بکەن، نان دەخۆن،

ئەو کاتەی لەبونیادنانی ژیانی خۆمان تەواو دەبین، ئەو کات منداڵانی کۆلاک دەگەڕێنەوە، دیارە ئەوکات چینی پرۆلیتاریا تەمێی کردوون.

پاکەتێکی جگەرەی دەرهێنا دەمێک بەدەستە لەرزۆکەکانی دەیویست یەکێک لەجگەرەکان بەدەستەوە بگرێت، ئەندریە هەڵسایەوە بێ ئەوەی چاوەکانی بەسەر ناجۆلتۆڤەوە لابدات، کە دەموچاوی زەردی تۆخ دایپۆشی بوو، ناجۆلتۆڤ وەک ئەوەی لەگەڵ حەوزی ئاوەوە هاتبێت و مشتەکۆڵەکانی خۆی توند کردبوو و تفێکی بەڕووی ئەندریە کرد:

-ناپاک. بەوشێوەیە خزمەتی شۆرش دەکەیت. تۆ دڵت پڕ لەبەزەییە. هەست ناسکیت. بەڵام من وا نیم، ئەگەر هەزاران پاشەبەرە و منداڵان لەبەردەمم ریز بکەیت و پێم بڵێیت دەبێت لەپێناو شۆرش هەموویان بکوژیت، بە تفەنگەکەم هەمویان دەکوژم- دواتر ناجۆلتۆف بەدەنگێکی دڕندانە هاواری کرد- هەموویان دەکوژم. تروسکایی توڕەیی لەچاوەکانی بوو و چاوەکانیشی زەق ببوونەوە، دەمیشی کەفی دەکرد.

ئایا بینیت ئەو شیوعییە چی گوت؟ ئەگەر هەزارانت لەبەردەم ریزکرد (چاک گوێ بگرە) هەزارانت لەپاشەبەرە. منداڵانی دیکە ریز کرد، ئەو بەتفەنگەکەی بێ بەزەییانە روحیان دەکێشێ، ئەمەش لەپێناو بەرژەوەندی شۆرشە، هەڵبەتە شۆرشی پرۆلیتاریا.

کەواتە ئەو سەدان دەمانچە و تفەنگ و چەقۆ و خەنجەرەی کە شیوعیەکانی عێراق حەشاریان دابوو، بۆ ئەوە ئامادە کرابوو، کە روحی منداڵان و پاشەبەرەکانی پێ بکێشرێت، بۆ بەرژەوەندی

شۆرشی پرۆلیتاری، سڵاو لەمرۆڤایەتی هاوڕێیە بەشەرەفەکان و دروشمە بێ ماناکانیان، کە لەژێر ئاڵا سوورەکەیان حەشاریان داوەو حزبە ناپاک و سیخوڕ و دڕەندەکەیان دەزانرێت.

ئەی خوێنەر دوای ئەوەی لەقسەکانی ئەو نووسەرە سۆڤیەتە خەباتگێرە بۆت دەرکەوت، کە تۆمەتەکان چییە ئاراستەی شیوعیەکان دەکرێت، ئەویش ئەوەیە ئەوان بکوژی دڵرەقن، ئەوان بێباوەڕی دژ بەئایینن.

لەئەڵقەی داهاتوودا هەر لەقسەکانی ئەو نووسەرە دوو تۆمەتەکەی دیکە دەسەلمێنم (لەزاری خۆتەوە ریسوات دەکەم ئەی ئیسرائیل) یان راستتر بڵێم ئەی برای ئیسرائیل و ئەی سیخوڕەکەی، جا ئەگەر دەزانی کە سیخوڕی ئیسرائیلی یان هەڵخەڵەتاوی و نازانی کە سیخوری.

یەکێک لەپلان و تاکتیکی شیوعییەکان ئەوەیە کە پڕوپاگەندە و درۆ و دەلەسە و قسە لەبارەی کۆدەتایەکی مەزەندەکراو بڵاودەکەنەوە، ئەمەشیان هۆکارێکە بۆئەوەی لەنەیارانیان بدەن و ریزەکانیان بەهێز بکەن، شیوعییەکان لەهەموو شوێنێک بەتایبەت لەعێراق ئەو کارەیان هەیە، دوای ئەوەی زەعیم ئابڕووی ئاژاوەگێڕیی و ئاژاوەگێڕەکانی برد، لەگەڵ کارە بۆگەنەکانیان کە لەکەرکوک ئەنجامیاندابوو، حزبی شیوعی تووشی نسکۆیەکی بێوێنە بووە، تەنانەت لەکاتی گرتن و لەسێدارەدانی فەهدیش ئەو نسکۆیەی بەخۆیەوە نەدیوە، سەدان کەس لەڕێکخستنەکانیان دێنە دەرەوەو ناشکەڕێنەوە، جا هاوڕێیانی بەشەرەف هۆکارێکیان بەدەستەوە نەماوە ریزەکانی خۆیان پێ بەهێز بکەن، جگە لەباشترین هۆکارەکەیان نەبێت، کە ئەویش بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و درۆ و دەلەسەیە، ئێستا ئەوان لەناو دۆست و لایەنگر و هاوڕێیانیان ئەوە بڵاودەکەنەوە، کە گوایە حکومەت دژی قەومیە ساختەچیەکان وەستاوەتەوەو راویان دەنێت و دەستگیریان دەکات، ئێستا حکومەت هەر کەسێک تەمبێ دەکات بەگفتار و بەڕەفتار سوکایەتی بەهاوڕێیان بکات.

گوایە لەسەر ئەو بنەمایەش حکومەت خاوەنی رۆژنامەی (بغداد)ی راگرتووە، چونکە ئەو وتارەکانی رائیدی بڵاوکردۆتەوە، کەچی

لەڕاستیدا خاوەنی ڕۆژنامەکە لەبەر هۆیەکی دیکە دەسگیر کراوە، کە بچووکترین پەیوەندی بەوتارەکانی رائیدەوە نییە، تەنانەت واشیان بڵاوکردۆتەوە، کە مامۆستا تەها فەیازیش دەستی حکومەتی پێگەیشتووەو خودی رائیدیش گیراوەو بەدر شاکر سەیابیش بەهۆی ئەو نووسینانە گیراوە، کە لەگۆشەی (من شیوعی بووم) بڵاویکردۆتەوە، جا ئەگەر ئەو پڕوپاگەندانە هەروەها بمێنێتەوە، خەڵک باوەڕیان پێناکات و بەتەواوی رەتی دەکەنەوە، لەبەر ئەوەشە شیوعییەکان تێدەکۆشن بەلایەنی کەمەوە بەشێک لەو پڕوپاگەندانەیان بێنەدی.

کاتێک دەڵێن حکومەت سەیابی دەستگیرکردووە، لەبەرئەوەی دوژمنی شیوعییەکانە، کاتێکیش ئاشکرادەبێت من دەستگیر نەکراوم، بەدرۆدەخرێنەوە، بەڵام بەمەش ناوەستن، پڕوپاگەندەی وەها بڵاودەکەنەوە، کە گوایە حکومەت دووبارە پاڵپشتی شیوعییەکان دەکات، وەک ئەوەی ئەو حکومەتەی کە زەعیمە مەزنەکەی گوتی لەسەرووی مەیل و لایەنەکانە، ڕۆژێک پاڵپشتی ئەم لایەنەدەکات و ڕۆژێکی دیکە لەگەڵ لایەنێکی دیکە دەبێت.

وەک زەعیمە پێشەنگ و سەرکەوتووکەمان بەهەموو گەلی گوت، بەهەموو ئایین و نەتەوە و باوەڕە سیاسیەکانیانەوە، کە نابێت حکومەت لەدژی توێژێک بێت، بەبۆنەوەی بیروباوەڕی ئەو توێژە، ئەمە دوا قسەی زەعیمەو قسەیەکی دیکەی نییە.

لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین لەوە بگەین، کە کۆششیان کرد من بخەنە تەلەکەوەو ڕەوانەی گرتووخانەم بکەم، بۆ ئەوەی بەشێک لەدەنگۆکانیان ببێتە بەهەقیقەت، کە مەبەستی ترسناکیان لەدوایەوە هەیە. ئەوان ئافرەتێکیان هانداوە بۆ ئەوەی سکاڵا لەدژی من تۆمار بکات، گوایە من شەرەفی ئەوم لەکەدار کردووە، کاتێک باسی یاری

هاوڕێیەکم کردووە، مەبەستم ئەو ئافرەتە بووە، کەچی ئەوان چاکتر دەزانن ئەو سکاڵایەی ئەو ژنە پوچەڵ دەبێت، هیچ دەرفەتێکی دیکەی تێدا نییە، چونکە ئەوانەی نووسیومە هیچ ئاماژەیەکی ئەوتۆی تێدانییە، کە ئەو ژنە مەبەست بێت، کەواتە مەبەست لەوروژاندنی ئەو ژنە چییە؟ بۆ ئەوەیە ئەگەر رۆژێکیش بێت لەزیندان رابگیرێم و یەکێک لەپڕوپاگەندەکەیان راست دەربچێت، بەڵام خودای گەورە و بەتوانا ئەوانی بێ ئومێد کرد، دوای چەند خولەکێک لەپرسیار و وەڵام بەکەفالەت ئازادکرام، سوپاس بۆ خوا و سوپاس بۆ کۆمار و ئازادییەکەی و رێزگرتنەکەی لەهاوڵاتیان.

بەهەرحاڵ، دەگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتەی کە دوێنێ دەستمان پێکرد و نموونەیەکمان لەو کتێبە هێنایەوە، کە نووسەرێکی سۆڤیەتی نوسیویەتی و خانەی زمانانی بێگانە لەمۆسکۆ وەریگێڕاوەتە سەر ئینگلیزی، لەو چاپەش هاوڕێیانی ئێرە وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بڵاویان کردۆتەوە، کاتێک بەدوای دوو بەشی ئەو کتێبە گەڕام، کە تێیاندا ئاماژەم بۆ ئەو بابەتانە کردبوو، کە پەیوەندیان بەبابەتەکەی منەوە هەیە، بەڵام ئەو دووبەشەم نەدۆزیەوە، بۆیە بیرم لەوە کردەوە، کە دوو دانەی دیکە لەو کتێبە بکڕم، کەچی زوو پاشگەزبوومەوە لەبەر خۆمەوە گوتم پێویست ناکات سوودی ٣٠٠ فلس بەو شیوعیە بەکرێگیراوانە بگەیەنم، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە یادەوەریم توانیویەتی ئەو چەند رستەیە ئاماژە بۆکراوانە لەخۆیەوە بگرێت، جا من بەپشتبەستن بەیادەوەرییم دەینوسم، بەڵام لەبەرئەوەی شیوعییەکان نەریتیان وایە، کە شتەکان بەدرۆ دەخەنەوە، لەوانەیە نووسینەکەی منیش بەدرۆ بخەنەوە، بۆیە دوو دانەی نوێم لەکتێبەکە کڕی و ئاماژەم بەژمارەی لاپەڕەکانیش کردووە.

دوێنێ لەگەڵ من، نموونەیەکتان لەدڵڕەقی و ستەمی شیوعییەکان بینی، گوێبیستی ئەوەش بوویت کە یەکێک لەوان دەیگوت ئەگەر هەزاران پەککەوتە و منداڵی لەبەردەم ریز بکەن، ئەو ئامادەیە بەتفەنگەکەی روحیان بکێشێ، ئەگەر ئەمە لەپێناوی شۆرش بێ. ئەو رستەیە قەسیدەیەکی نایابی بیرخستمەوە، کە لەلایەن شاعیرێکی ئازادی ئەورووپاوە نووسراوە، ئەو قەسیدەیە لەکاتێک نووسراوە، کە پایتەخی وڵاتی ئەو شاعیرە لەدژی ستەمی شوعییەکان راپەریون، کەچی ٦٠٠ تانکی بیانی هاتۆتە شارەکەو راپەرینەکەی شۆرشگێرانی بەگەنج و پیر و ئافرەتەوە لەناوبردووە، دوای ئەوەی جەنگەکە کۆتایی پێدێت و گەلە راپەریوەکە سەرکوت دەکرێت، خەڵکەکە چەند سەربازێکی لەدار دروستکراویان دۆزییەوە، کە منداڵان یاری پێدەکەن، ئەو یارییانە بەخوێنی ئەو منداڵە سووربوون، کە خاوەنی ئەو یارییانە بووەو بەزرێپۆشی هاورێیان کوشراوەو لەپاڵ سەربازەکانی راکشاوە، خەڵکەکە ئەمەیان لەگۆرەپانی جەنگ بینی، بابەتی یارییە دارینەکان، کە لەشێوەی سەربازن، سوربوونیان بەخوێنی منداڵە کوژراوەکە دەبێتە بابەتی قەسیدەی ئەو شاعیرە، ئەو لەقەسیدەکە منداڵەکە دەدوێنێ و باسی ئەوەی بۆ دەکات کە سەربازەکان دەجوڵێنەوە و قسەدەکەن، بەڵام بێ دڵ و ویژدان و بێ بەزەیین لەشێوەی یارییە سەربازییەکانی منداڵان، ئەوان وڵاتەکەیان داگیرکرد و گەلەکەیان کوشت، ئەوا سەربازەکانی منداڵەکەیان پەرتەوازە کردو هەموویان کوشت، دواتر لەخوێنی منداڵەکەیان گەوزاند.

ئەمرۆ باسی تۆمەتی دووەمت بۆ دەکەم، لەو سێ تۆمەتەی کە ئاراستەی شیوعییەکان دەکرێت، لەسەر ئاستی جیهان و لەهەموو شوێنێک، ئەویش ئەوەیە کە ئەوان دڵڕەق و بێبەزەیین، ئەوان بەدرەوشت و ئەوان بێباوەڕن و دوژمنی ئایینن.

ئەگەر شیوعییەکان باوەڕیان بەخوا هەبووایە، دەبوایە سوپاسی بکەن، لەوەی کە من وتارەکانم لەدژی ئەوان لەڕۆژنامەی حوریە بڵاودەکەمەوە، کە نەریتەکەی ڕێنادات ئەو بەدڕەوشتیە سێکسیانە بگێڕمەوە کە لەسەر شیوعییەکان دەیزانم، چونکە ئاستی رۆژنامەکە لەوە بەرزترە. تەنانەت سەرنووسەری رۆژنامەکە چەندین لاپەڕەی لاداوە، کە لەڕۆمانەکەی ئەو زەویە بەیارەی کێڵامان وەرمگرتبوو، کە هی شولوخۆڤە و لەبارەی ژنی سکرتێری شانەی شیوعی لەجیرماشی نووسراوە. خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر ئەو چیرۆکە بۆ ئەوەی نموونەی بەشەرەفی مێردە شیوعییەکان ببینی، کە ژنەکانیان چۆن بەئابڕوچوون رووی ئەوانیان رەشکردووە، جا ئەگەر شیوعی دان بەوە بنێت، کە ئێمە بەئابڕوچوونی دەزانین!

من بۆیە بەوە واز دەهێنم تەنها یەک رستە لەکتێبەکە وەردەگرم کە لەسەر زاری ئەو هاوڕێیە پاڵەوانە هاتووە. کاتێک ئەو هاوڕێ خەباتگێڕە لەیەکێک لەجوتیارەکان دەدا، تا خوێناوی دەبێت، ئەو جوتیارە دەڵێ:

-ئەگەر پیاوەتیت هەیە بە لوشای ژنت نیشان بدە.

ئەو کاتە مەردایەتی ئەو هاوڕێیە قارەمان دەبزوێ و ژنەکەی تەڵاق دەدات، کەچی رووبەڕووی گلەیی لیژنەی محەلی حزب دەبێتەوە- کە هەموویان وردەکاری بەسەرهاتەکەی دەزانن- کە چۆن ئەو ژنەکەی لەسەر ئەوە تەڵاق داوە، کە تەنها چەند گەپ و یارییەکی لەگەڵ چەند گەنجێک کردووە. بژی ئەو ئەخلاقە کە پیاو نازانێت سەرنجێکی شیاوی لەبارەوە بدات.

لەشوێنێکی دیکەی هەمان رۆمان قسە دێتە سەر داڤیدۆڤ، کە نوێنەری حزبی بەلشەفییە لەگوندەکە، پێی دەڵێن: بێگومان تۆ باوەڕت

بەخوا نییە. دواتر پێی رادەگەیەنن کە ئەمساڵ باران نەباریوەو ئەگەر وەها وشکەساڵی بێت کشتوکاڵ نابێت، دواتر لێی دەپاڕێنەوە کە رێگەیان پێ بدات، نوێژە بارانە بکەن، بۆ ئەوەی لەخوا بپاڕێنەوە بارانیان بۆ ببارێنێت. هاوڕێ ئەمە بەداوایەکی پوچ دەزانێ و هەڵدەچێ و باسی یاساکانی سروشتیان بۆ دەکات و پێیان دەڵێ باران هەر دەباری، ئەگەر نوێژ بۆ خوا بکەن یان نەیکەن. دواتر هەڕەشەی ئەوەیان لێدەکات ئەگەر بێت و ئەوان بۆ نوێژەبارانە قەشە بهێننە گوند، ئەوا ئەو بەو جەوەی کە خوری مەڕی پێدەبڕێتەوە، ریشی قەشە هەڵدەپاچێت.

ئەو کاتەی شیوعی بووم، کتێبێکم خوێندەوە بەناوی "ئایین لەیەکێتی سۆڤیەت"، ئەوە کتێبێکی وێنەدارە باس لەبوونی مزگەوت و کڵێسای مەسیحی و جولەکەکان دەکات و دەیەوێت بیسەلمێنێت کە رژێمی شیوعی دژی ئایین نییە. دەتانەوێ کێ بەو کتێبانە هەڵخەلەتێنن؟

راستە کلێسا و مزگەوتەکان هێشتا لەوڵاتانی یەکێتی سوڤیەت ماون، بەڵام کێ هاموشۆی ئەو شوێنانە دەکات؟ پیرو پەککەوتە. یان راستتر ئەو نەوەیەی کە چەند ساڵێکی دیکە مردن درکیان پێدەکات و ئیتر شوێنەوارێکیان نامێنێ، جا ئەو کات کێ دەچێتە کڵێسا و مزگەوت.

ئەمڕۆ لاوانی سۆڤیەت وانەی ئیلحاد دەخوێنن و فێری ئەوە دەبن، کوفر بەخوا و ئایینەکان بکەن، جا ئەمە لەقوتابخانە و کۆلیژ و یانەکان و هەموو شوێنێک هەیە، جا ئەوکات کڵێسا و مزگەوتەکان دەبنە کتێبخانەی گشتی و بارەگای کۆمەڵە و رێکخراو و سەندیکای لاوان و جووتیاران و کرێکاران.

جا کەواتە ئەمەیە ئەخلاقی شیوعییەکان کە لەکتێبەکانی خۆیان وەرگیراوە، لەچەند مانگی مۆتەکەی سووریش چەندین نموونەمان

لێیان بینی، دڵڕەقی و ستەم و وەحشیەتگەری ئەوان بۆتە پەند. کێ بوو منداڵ و پیر و ئافرەتانی لەموسڵ و کەرکوک کوشت، کێ بوو خوالێخوشبووان عەبدولئەمیر لەکازمیە و ئەنسی لەبەسرا سوکایەتی بەتەرمەکانیان کرد، دەیان تاوانی دیکەیش هەر کە لەعێراق ئەنجام دراوە ئەوان بوو، لەبارەی تاوانە ئەخلاقیەکانیش شتێکم لەرابردوو بۆ باسکردی، ئەگەر لەبەر خواستی چەند پیاوێکی چاک نەبووایە، کە ڕێزیان دەگرم و شانازیان پێوەدەکەم، ئەوا چەندین نموونەی دیکەم دەهێنایەوە، کە بەشی کتێبێک بێت.

قسەکردن لەسەر هەڵوێستی شیوعییەکانی عێراق بەتایبەت و شیوعییەکانی عەرەب بەگشتی و هەموو شیوعییەکانی دونیا لەسەر مەسەلەی فەڵەستین، لەگەڵ پشتگیرییە راشکاو و بێ ئابڕووییەکەیان بۆ زایۆنیزم، بابەتێک کەس ناتوانێت فەرامۆشی بکات، تەنانەت هێشتا لەعێراق خەڵکانێک هەن، شیوعییەکان بەبرایانی جولەکە ناودەبەن، ئەو نازناوەش لەو دروشمەوە هات، کە شیوعییەکانی عێراق لەخۆپیشاندانەکانیان لەساڵی ١٩٤٨ بەرزیان کردبۆوەو بانگەشەیان بۆ دەکرد. سەرەڕای ئەمەش چەندین وردەکاری خۆش هەیە بەکێشەی نازانم ئەگەر بیانگێڕمەوە.

هەڵوێستی حزبی شیوعی عێراقی لەبەرامبەر مەسەلەی فەڵەستین لەسەرەتادا هەڵوێستێکی مامناوەند بوو، لەگەڵ ئەوەی لەلایەک بەرژەوەندی و ئامانجە نەتەوەییەکان لەخۆیەوە نەگرتوو، لەلایەکی دیکەیش ئەو ناپاکییەی ئاشکرانەبوو کە شەرمی لێناکاو لێی تەریق نابێتەوە.

شیوعییەکان لەعێراق و هەموو وڵاتانی عەرەبی بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد، لەفەلەستین حکومەتێکی دیموکراتی پێکبهێنرێت، بۆ ئەوەی

عەرەب و جولەکە تێیدا بەشدار بن، ئەو کاتە ئەو چارەسەرە زیاتر بوو لەوەی کە شیوعییە جولەکەکان خوازیاری بوون، مەبەستم ئەو شیوعیانەیە کە دزەیان کردبووە ریزەکانی حزبی شیوعی عێراقی و دواتریش چەندین پێگەی گرنگی سەرکردایەتیان بەدەستەوە گرت.

ڕووداوەکانیش ئەوەیان ئاشکرا کرد، کە دووجار سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی جولەکە بووە، یەهودا سدیقی جولەکە لەدوای فەهد بووە سکرتێر، ماوەیەکی کورتیش ساسۆن دەلال کە ئەویش جولەکە بوو، سکرتێری ئەو حزبە بەکرێگراوە بوو.

جولەکەکان خەونەکەیان ئەوەبوو: ئەگەر حکومەتێکی هاوبەش لەفەڵەستین لەنێوان جولەکە و عەرەب پێکهێنرا، ئەوکاتە هەموو جولەکە کۆچبەرەکانی دونیا دەڕژێنە فەلەستین، ئەوکات عەرەب دەبێتە کەمینەیەک لەنێو ملیۆنان جولەکە. لەپێناوی ئەمەش بەماڵەکەیان کۆمەکی بزووتنەوەی شوعییان لەعێراق دەکردو کچەکانیشیان بۆ تەفرەدانی هاوڕێیە بەشەرەفەکان بەکاردەهێنا، دەسکەوتیشیان لەپاڵ ئەمە زۆر مەزن بوو، ڕووداوەکان ئەوەشیان دەرخست، کە سکرتێری حزبی شیوعی میسری جولەکەی ئیتاڵیا بوو!

ئەوکات حزبی شیوعی بڵاوکراوەیەکی بەسەر دابەشکردین، تێیدا دروشمە دادپەروەرەکەی لەبارەی پێکهێنانی حکومەتی هاوبەشی نێوان جولەکە و عەرەبی فەلەستین شرۆڤەکردبوو، بۆ هەرکەسێک کە لەدروشمەکە ناڕازی بوایە، ئەو وەڵامەمان بۆ ئامادەکردبوو: تۆ دەبێت حکومەتێکی عەرەبی تەواو پێکبێت وەک حکومەتەکەی نوری سەعید بارگیری ئیمپریالیزم بێت؟ ئەی گوناهی ئەو جولەکە بەستەزمانانە چییە، کە لەفەلەستینن؟ ئایا فڕێیان دەینە دەریا و ئینجا حکومەتێکی عەرەبی بێگەرد دروست بکەین؟.

لەگەڵ ئەوەی دەمانزانی ئەو پاساوەمان پوچەڵە، کەچی دەستیشمان پێوەگرتبوو، پیاوە چاکەکانی ناو حزبی شیوعی بەدەست دابەشبوونی کەسایەتیانەوە دەناڵێنن، ئەوان لەلایەکەوە پابەندن بەوەی کە داکۆکی لەدروشم و بۆچوونەکانی حزب بکەن و گوێڕایەڵی فرمانەکانی بن، لەلایەکی دیکەیشەوە لەناخی دڵەوە بڕوایان بەڕاستی ئەو شتانە نییە، کە حزب بانگەشیان بۆ دەکات، منیش بەدەست ئەو شیزۆفرینیایەی کەسایەتیم دەمناڵاند، تا ئەو رۆژەی یەکلام کردەوەو خۆم لەکۆیلایەتی شیوعی ئازادکرد.

بۆ نموونە من شیعری زۆر لەشاعیرانی شیوعیم خوێندۆتەوە، لەوانە نازم حیکمەت و نیرۆدا و راگۆن و ماوتسی تۆنگ و شاعیری سۆڤیەتی سیمۆنۆف، بینیم زۆر بێ مانایە، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەیان شایەنی ئەوە نین پێیان بگوترێت شیعر، کەچی وەک ئەندامێکی حزب، پابەند بووم بە بەرگریکردن لەو شاعیرانەو بانگەشەکردن بۆیان، کە گوایە مەزنترین شاعیری دونیان. وەک ئەوەی بڵێم، شاعیرێکی پڕوپوچی وەک نازم حیکمەت مەزنتر بێت لەشاعیری بلیمەتی ئینگلیز ئیلیوت و ئیدیس ستویل، کە ژنە شاعیرێکی ئاینپەروەر بوو، چونکە ئیلیۆت شاعیری مەرگ و دەرەبەگایەتی و ئیمپریالزمە. بەڵام لەگەڵ خودی خۆم زۆر سەرسام بووم بەئیلیۆت و ستویل، تەنانەت من سەرسام بووم بەشاعیری مەزنی ئەڵمانی رێلکە، کە رەخنەگرانی ئەدەبی شیوعی وەک نموونەی شاعیرێکی رەجعی و رەشبین وەریاندەگرت و گوایە گوزارشت لەئومێدی چینێک دەکات، کە لەناوچووە، ئەویش چینی دەرەبەگە، ئەو لەحاڵەتێکدایە نەوەک تەنها رەشبینە، بەڵکو خوازیاری مەرگیشە، بەڵام کێ دەتوانێ بەوان بڵێت ریلکە لەڕووی شیعر و مرۆڤایەتی و پێشکەوتوویی، زۆر لەسیمۆنۆڤ مەزنترە، کە گەورەترین شاعیری سۆڤیەتە؟.

کاغەزە سورەکە ماوەیەک لەمەوبەر قەسیدەیەکی بڵاوکردەوە، کە وەرگێڕدراوی شیعرێکی شاعیرێکی شیوعی چینی بوو کە دەڵێ:

جۆخینەکان گەورە دەبن

دەبنە گرد

عەمبارەکان پڕدەبن لەگەنم

بەیانیەک زوو لەخەو هەڵدەستم و

مانگاکەم دەبەمە کێڵگە.

ئەگەر ئەو تێکەڵەیە بەشیعر بزانین، ئەوا سوکایەتی بەشیعر و شاعیران دەکەین، کەچی شیوعییەکان بەشیعرێکی مەزنی دەزانن.

هێندەی نەبرد، کە یەکێتی سۆڤیەت لەنەتەوەیەکگرتووەکان دەنگی بۆ ئەو بڕیارە دا، کە فەلەستین دابەش دەکات، ئەمە دوای چەند رۆژێک بوو کە حزبی شیوعی بڵاوکراوەیەکی دەرکردبوو، داوای دەوڵەتێکی یەکگرتووی بۆ عەرەب و جولەکە کردبوو، ئەدیبی گەورەی عەرەب مەتاع سەفدی جارێکیان بۆی گێڕامەوە کە لەدیمەشق تەنها لەشەوێکدا حزبی شیوعی دورشمەکانی خۆی گۆڕیوە، بەڵام سەرپەرشتیارانی رۆژنامەکەی حزب نەیانتوانیوە چارەسەری ئەمە بکەن، بۆیە بەیانی رۆژنامەکە دەرچووە، دوو دروشمی پێچەوانەی یەکتری تێدابووە، وتارێک کە داوای پێکهێنانی حکومەتێکی هاوبەشی عەرەب و جولەکە دەکات و وتارێکی دیکەش بانگەشەی دابەشکردن دەکات.

حزبە شیوعییەکان، تەنانەت هی وڵاتانی عەرەبیش، کە مەسەلەی فەلەستین مەسەلەی خۆیانە، نەوەک مەسەلەی سۆڤیەت، لەمەدا

نەیانتوانیوە جیاوازیان لەگەڵ بۆچوونەکانی یەکێتی سۆڤیەت هەبێت. هاوڕێیانی جولەکە بەو هەڵوێستەی سۆڤیەت ئاسودە بوونە، هێندەی نەبرد حزبی شیوعی عێراقی بڵاوکراوەیەکی دیکەی دەرکرد تێیدا دابەشکردنی فەلەستین بەپەسەند دەزانێ، تەنانەت رۆژنامەی حزبی شیوعی کە قاعیدە بوو، لەوکاتەوە وتاری توند بڵاودەکاتەوەو ئیدانەی جەنگی فەلەستینی دەکات و بەجەنگێکی چەپەڵی دەزانێ و داوا دەکات، کە سوپاکانی عەرەب لەفەلەستین بکشێنەوە. ئەو هەڵویستەی شیوعییەکانی عێراق توڕەیی و رقلێبوونەوەی گەلی وروژاند، تەنانەت ئێمە لەئەبو خەسیب زۆر ئەندامی شانە شیوعییەکەمان لەدەست دا.

رۆژێکیان جورئەتم کرد و پرسیارم لەیەکێک لەهاوڕێ گرنگەکان کرد، کە هۆکار چی بوو حزبمان ئەو هەڵوێستە وەربگرێت، کە پێچەوانەی تەواوی گەل بێ و تەحەدای هەستی بکات، ئەو هاوڕێیە نموونەی یەکێک لەوتەکانی هاوڕێ فەهدی هێنایەوە، کە دەڵێ "هەر کاتێک دروشمەکانمان راست بێت بەرزی دەکەینەوە، جا ئەگەر جەماوەر رازی بێت یان ناڕازی، حزبەکەی ئێمە جەماوەر بەڕێوە دەبات، نەوەک جەماوەر حزب بەڕێوەببات."

لەبەرامبەر ئەو پاساوە فەهدییە یەکلاکەرەوەیەدا، هیچم بۆنەمایەوە بێدەنگی نەبێ، بۆ زۆر شەوان لەشەونخونی و ئازاردابووم، ئەو کاتەی کەئەندامی حزبی شیوعی بووم، ئەمەش لەبەر بیرۆکەیەک بوو، کە هاتە خەیاڵم و لێم جیانەدەبۆوە، کە وا باسی دەکەم.

جولەکەیەکی لاواز هەبوو ناوی خەزوری بوو، کە لەگوندەکەی ئێمە و گوندەکانی دیکە دەخولایەوە، فافۆن و سفری کۆنی دەکڕی ودواتر دەیفرۆشتەوە، بەو کارە دەژیا، خەزوری رەگەزنامەی لێسەندرایەوەو رەوانەی ئیسرائیل کرا، دەرکەوت ئەو پیاوە ١٠هەزار دیناری هەیەو نەشیتوانیوە پارەکەی لەگەڵ خۆی ببات و چۆتە وڵاتی نەتەوەکەی.

بیرۆکەکەی من ئەوەبوو، خەڵک لەکۆنەوە بۆیە رقیان لەجولەکە دەبێتەوە، کە گوایە پارەی زۆرو زەوەندیان خۆشدەوێ، بەڵام خەزوری، ئەو لانەوازەیەی کە وابزانم خوێندن و نووسینیشی نەدەزانی، مەینەتی رۆژی هاوین و بارانی زستان و سەگوەڕی لادێیەکان و ئەزیەتی خەڵکی بینی بوو بۆ چەند درهەمێک، کەچی هەمووی بەجێهێشت و رۆیشتە ئیسرائیل؟ لەپێناو چی؟ بۆ ئەوەی لەوڵاتێکدا بژی، کە تێیدا هەست بەوە بکات لەهەمووشتێک، یەکێکو لەهاوڵاتییەکانی، وەک ئەوەی بەخەیاڵیدا هاتووە.

دڵسۆزی بۆ نەتەوەکەی و ئەو بەها روحییە وایلێکردبوو، کە واز لەو ماڵە بهێنێت، کە مەینەتی بینی بوو لەکۆکردنەوەیدا. کەچی من. من ئەو کەسەم کە بانگەشەی ئەوە دەکەم ئەدیب و شاعیرم، گوایە بەندەی کۆیلەی پارە نیم و بایەخی پێنادەم، ئەو قەسیدەیەی کە دەینوسم بۆ خۆم زۆر خۆشەویسترە لەهەزاران دینار، کەچی هەر بۆ ئەوەش ناپاکیم لەنەتەوەکەم کردو لەپێناویدا نکۆڵیم لەو بەها روحییە کرد؟ من هیوام وابوو کە داهاتم باشتر دەبێت و پارەم زۆرتر دەبێ، کاتێک شیوعییەکان دەسەڵات دەگرنە دەست. کەواتە من لەخەزۆری هیچترم؟

ئەو بیرۆکەیە ئازاری دام، بەخواردنەوە و بەخوگرتن بەمەی ویستم لەبەر ئەو بیرۆکەیە رابکەم، بەڵام هەر بەدوامەوە بوو تا ئەو کاتەی لەفیکری شیوعیەت نەجاتم بوو.

یەکێک لەو چیرۆکانەی کە لەژیان بێ موورادی کردم و فرمسێکی بەچاوانم هێنایە خوار، بەشاهێدی زۆر لەبرادەران، ئەوە بوو کە برادەرێکی عەرەبی فەلەستینی بۆی گێرامەوە، لەسەروبەندی لەدەستدانی ئەو پارچە پیرۆزەی نیشتمانی عەرەب، ئەوەیە کە کوڕی شاعیری گەورەی فەڵەستینی عەبدولڕەحیم مەحمود کە لەپێناو

بەرگریکردن لەعروبە و نیشتمانەکەی شەهیدبووە، ئێستا ئەو کورەی دەستە بچووکەکانی بۆ نان پاندەکاتەوەو سواڵ دەکات، ئەوەم هێنایە بەرچاوی خۆم، منداڵێکی عەرەب بەجلی دڕاو و پێی خواس و دەستە لاواز و زەردەکانی درێژ بکات و سواڵ بکات "برایان لەڕایی خوا".
جوێنم بەشیوعییەکان دا کە خۆشم ئەو کات تێیدا ئەندام بووم.

لەسەرەتای ساڵی خوێندنی ١٩٤٨-١٩٤٩ وەک مامۆستا لەقوتابخانەیەکی شاری رمادی دامەزرام، لەچاکترین هوتێلی ئەو شارە ژوورێکم بەکرێ گرت و دەستم بەکارکرد، من کە مامۆستای ئینگلیزی بووم. زیاتر لەنیوەی وانەکانم بەوە بەسەر دەبرد، کە بۆ قوتابییەکان لەبارەی شیوعیەت دەدوام، باسی ئەوەم بۆ دەکردن، ئەو شیوعییەتە چییە، کە ئەوان لێی دەترسن؟

بابەیەکەوە ببینین، من بنەماکانی ماتریالیزمی دیالیکتیکی و چەندین بیرۆکەی دیکەی شیوعیەتم بۆ ئەوان شرۆڤە دەکرد. زۆر جوان و سەرنجڕاکێش بوو. ئەو شیوعیەتەی کە بۆ قوتابیەکانم باس دەکردن، شیوعیەتی سەربڕین و سوتاندن و تاڵان و کوشتن نەبوو، کە وەک لەکەرکوک بینیمان، ئەو شیوعییەی کە من باسم دەکرد شیوعیەتی پاشکۆی دەوڵەتانی بیانی نەبوو، چونکە دوانی ئەوەی حکومڕانیان کردووە، دوو فەیلەسوفن لەچوار فەیلەسوفەکەی مارکسی- لینینی- ستالینی. ئەو شیوعیەتەش لەخزمەت ئامانجەکانی زایۆنیزم نییە، ئەو شیوعیەتەی من بێباوەڕی و بەدڕەوشتیش نییە. نەخێر.. ئەو وشە چاپکراوانەی ناو کتێبەکان، کە من بۆ قوتابییەکانم شرۆڤە دەکرد، جوان و ناسک بوون.

داخی ئەوە من دەسوتێنێ، کە هەزاران گەنجی باش هەیە، کە ئارەزوویەکی راستگۆییان هەیە بۆ خزمەتکردنی نیشتمان و

گەلەکەیان، کەچی شیوعییەکان بەوشەی وەک هەنگوین و خەونی خۆش و بەڵێنی شیرین هەڵیاندەخەڵەتێنن. کاتێکیش پێیان دەکەوێتە ناو چاڵی شیوعیەت، دڵیان بەقین و بەخیلی و شەڕانگێزی نەبێت پڕنابێت.

پەیوەندیم تەواو بەحزبەوە پچڕابوو، لەهەموو شاری رمادی کەسێکی شیوعی نەبوو، یان بەلایەنی کەمەوە شیوعییەک نەبوو، لەوێ خەڵکی شارەکە بێت، بەڵام من دوو هاوڕێم دۆزیەوە، یەکێکیان مامۆستایەک بوو، کە لەخانەی باڵای مامۆستایان لەگەڵمدا بوو، ئەویتریان دکتۆرێکی ناسیاو بوو، کە ناوی دکتۆر ریاز بوو، شیوعی لوبنان بوو، ئەوانیش لەهەمان ئوتێلەکەی من نیشتەجێ بوون.

لەوانەیە خوێنەر پرسیار بکات: چۆن خۆتان لەلای یەکتر ئاشکرا کرد کە ئێوە شیوعین؟ من و مامۆستاکە یەکترمان دەناسی، بەڵام دکتۆرەکە پەیوەندی لەگەڵ بەرپرسە گەورەکانی حزب هەبوو لەبەغدا، ئەوانیش باسی ئێمەیان بۆ کردبوو، بۆئەوە بێ ترس خۆمان لای ئەو ئاشکرا کرد.

رەنگە خوێنەر سەری لەوە سوڕما بێ، کە گوتم زۆربەی وانەکانم بۆ پڕوپاگەندەی رێبازە کاوڵکەرەکە تەرخان دەکرد، بەڵام ئایا خوێنەر گوێبیستی ئەوە نەبووە، کە دوای شۆرش سکاڵای قوتابییەکان بەرزدەبووەوە- قوتابیە قەومییەکان بەتەنها- چونکە مامۆستاکانیان ئەوانەی لەهاوڕێیانی بەشەرەف بوون، هیچ شتێکیان فێرناکەن، بەڵکو زۆرترین کاتیان بۆ پڕوپاگەندەی حزب بەکاردەهێنن، چونکە شیوعی باوەڕی وایە، کە گوتنەوەی مارکسیەت بۆ قوتابی و بڵاوکردنەوەی شیوعیەت لەنێوانیاندا زۆر بەسوودترە بۆیان و بۆ نیشتمانەکەیان، لەوەی یاسا و بیرکاری و وانەی ئینگلیزی و عەرەبیان پێ بڵێن. جا

تەواوی خەڵکی شارەکە نازانم چۆن دەیانزانی ئێمە ئەو دوو مامۆستایە شیوعین. بەڵام ئێمە بایەخمان بەوە نەدەدا.

ئەو کات ڕووداوێکی خۆش ڕوویدا، کە بەچاوی خۆم بینیم و بەگوێی خۆم بیستم، ئەوکات لەناوەڕۆکی نەگەیشتم، دوای ماوەیەکی زۆر نەبێت. ڕۆژێکیان کۆمەڵێک کرێکار و ئەندازیاری نەوت بۆ دۆزینەوەی نەوت هاتنە ڕمادی. لەهۆتێلەکەی ئێمە دابەزین، لەیەکێک لەشەوەکان ئاهەنگێکیان هەبوو، دەیان بوتڵ بیرەیان دانەبوو تا کرێکار و فەرمانبەرەکانی نەوت سەرخۆش بوون، بێگومان لەنێویاندا هاوڕێیانی بەشەرەف هەبوون، کاتێک مەست بوون خۆیان ئاشکرا کرد. حزبی شیوعی ئێستاشی لەگەڵدا بێ زۆر بایەخ بەدوو جۆر کرێکار دەدات: کرێکاری نەوت. کرێکاری هێڵی شەمەندەفەر. چونکە ئەوانە دەتوانن دەست بەسەر دوو لەگرنگترین هۆکارەکانی شەڕ دابگرن .

لەکاتی دانیشتنەکەماندا لەهوتێل و لەدانیشتنی خواردنەوەی کرێکارەکان برادەرێکمان لەگەڵدابوو کە خەڵکی ڕمادی بوو، نازانم وەرگێڕ بوو، یان تێبینەری کۆمپانیابوو. بیستم یەکێک لەکرێکارە شیوعییە سەرخۆشەکان پێی دەگوت: مامۆستا لەگەڵ ئەوەی تۆ لەچینی کارکەر نی، بەڵام تۆ نیشتیمانخوازی بۆیە تۆمان خۆشدەوێ.

لەخۆم پرسی: تەنها نیشتمانخواز. تۆ لەچینی کارکەر نیت و تەنها نیشتمانخوازی؟ ئەمە مانای چییە..؟ دوای ماوەیەک لەو قسە شیوعیانەیە تێگەیشتم مانای: تۆ لەگەڵ ئەوەی نیشتمانخوازی، بەڵام شیوعی نیت. ئەمەش دواتر دەرکەوت کە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان شیوعییەت و نیشتمانپەروەری هەیە، من نموونەی دوو ناو دەهێنمەوە: وڵاتی چینی نیشتمانی. چینی شیوعی. هەرچەندە چینی ناوبراو بەنیشتمانی ستەمێکە مەبەست سوکایەتیکردنە بەوشەی نیشتمانی. شیوعییەکانیش هەر بەو مەبەستە بەکاریدەهێنن، چونکە

لەدیدی ئەوانەوە نیشتمانپەروەری و نەتەوەیی خورافاتی بورژوازییە. ئەو وتەیەی لینینمان بیستووە، کە شیوعییەکانی عێراق و وڵاتانی دیکە کردیانە دروشمی خۆیان: کرێکارانی جیهان یەکگرن، تۆ ئەگەر ئەو وتەیە شرۆڤە بکەیت، بەمانای ئەوە دێت کە کرێکاری ئیسرائیلی سەهیون بن حەسقیل ئەو نزیکترە لەکرێکاری عێراقی محەمەد بن حسێن. نزیکترە نەوەک مامۆستا کامل جادرچی، چونکە سەهیون کرێکارەو کەچی مامۆستا جادرچی تەنها کەسێکی بۆرژوازە.

شیوعییەکان بەو شێوەیەی خوارەوەی گەشەکردنی بیری نەتەوەیی شرۆڤە دەکەن، ئاساییە شرۆڤەکەی ئەوان بەکورتی بگێرمەوە:

دەرەبەگایەتی رژێمی حوکمڕانی باو بوو لەئەوروپا، دەوڵەت بەچەمکە نوێیەکەی بوونی نەبوو، بەڵکو چەند هەرێمێک بوو، کە بە دوقیە ناسرابوو، هەر هەرێمێکیش لەوان میرێکی دەرەبەگ حوکمڕانی دەکرد، شەڕ و ململانێی لەنێوان ئەو هەرێمانەدا هەبوو. کاتێک پرسیارت لەجووتیارێک دەکرد تۆ کێی؟ بەوشێوەیە وەڵامی نەدەدایەوە، کە ئەو بریتانی یان ئەڵمانیە. بەڵکو دەیگوت ئەو سەر بەفڵانە هەرێمە.

دواتر چینی بورژوازی لەسەر شانۆکە دەرکەوت، ئەو چینە بەدوای دەستی کاری هەرزان دەگەڕێت، بۆ ئەوەی کاری پێبکات و بەدوای کەرەستەی خاویش دەگەڕا بۆ ئەوەی کەلوپەلی لێ دروست بکات، بەدوای بازاڕی بازرگانی بگەڕێت بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانی تێدا بفرۆشێت. بۆیە دەرەبەگایەتی هەڵوەشاندەوە بەمەش بەدەستی کار گەیشت. بۆ زامنکردنی بازاڕ و بەدەستهێنانی کەرەستەی خاویش دەبوایە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقیا داگیر بکات، بەڵام ئایا هەرێمێکی وەک ڤینیسیا دەتوانی هیند داگیر بکات، بەمشێوەیە هەرێمەکان یەکیان

گرت و دەوڵەتیان دروستکرد لەشێوەی ئەلمانیا و ئینگلیز، بەمشێویە نەتەوەی وەک ئەڵمانی و ئینگلیزی دروست بوو.

ئەمەیە شرۆکردنی شیوعییەت-بێگومان بەشێوەیەکی سادە- بۆ بیری نەتەوەیی و گەشەکردنی، بەو مانایەش نەتەوایەتی تەنها فێڵێکی بورژوازییە بۆ گەیشتن بەدەستی کار و کەرەستەی خاو و بازاڕ لەپێناو قازانج.

ئەوەی مێژووی ئومەمیەتی دووەم بخوێنێتەوە دەبینی کە ئەوان بەر لەجەنگی جیهانی یەکەم بانگەوازێکیان ئاراستەی کرێکاران کردووە بەوەی بەبانگەوازەکانی بۆرژوازییەکان فێڵیان لێنەکرێت، با کرێکارێکی فەڕەنسی نەچێتە جەنگ لەدژی براکەی کە کرێکارێکی ئەڵمانییە. بێگومان ئومەمیەتی دووەم لەو ئەرکەی فەشەلی هێنا ئەوکاتەی هەندێک لەجەمسەرەکانی لەخۆیان هەڵگەڕانەوە وەک - بانگەوازانی جەنگ و قەومییەکانی، لەکۆدەتاچییەکان.

لەوانە بانگەوازی شیوعییەکان ئاساییە، کە دەڵێن ئێمە برای جولەکەین، ئەمە لەو روانگەیەوە هاتووەو سەرەڕای ئەمەش دەسەڵاتی شیوعییەکان بەسەر ماشێنی حزبەوە زاڵە.

لەسەرەتادا فەهد لەجولەکەکان دەترسا و لێیان دوودڵ بوو، گومانی لێیان هەبوو، بۆیە نەیانتوانی ئەو کات دەسەڵاتیان لەحزبی شیوعی هەبێت، بەڵام دواتر جولەکەکانی عێراق بەفرمانی جولەکەی جیهانی، بێگومانی بەهاوکاری هەندێک عێراقی غەیرە جولەکە حزبێکی شیوعیان دروستکرد و رۆژنامەیەکیان بەناوی وەحدەی نیزاڵ (یەکێتی خەبات) دروست کرد، ئەمەش بۆ فەهد و هاوڕێیانی خراپ بوو، کە دوو حزبی شیوعی لەوڵاتێک هەبێت، بۆیە دانوستاندن لەنێوان ئەو دوو حزبە ئەنجام دران بۆ یەکخستن و یەکگرتن.

حزبەکەی فەهد گەورەتر و پێشکەوتوتر بوو، بۆیە زۆر سروشتی بوو، کە حزبەکەی وەحدەی نیزاڵ بچێتە ناو حزبەکەی فەهدەوە، فەهد مەرجی ئەوەشی لەسەر سەرکردایەتی ئەوان دانا، کە تەنها دوو کەس یان سێ کەسیان نەبێت، ئەگینا هەموویان بەئەندامی سادە بچنە ناو حزبی شیوعی. مەبەستی جولەکەکان لەدروستکردنی حزبی شیوعی شتێک نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت، کە بچنە ناو حزبی شیوعی عێراقی و دواتریش بەسەریدا زاڵ بن، بۆیە بەمەرجەکەی فەهد رازی بوون، هاورێی نەمریش کە فەهدە ئەمەی بەدەستکەوتێکی گەورەی حزب و سەرکەوتنێکی نایابی هەژمارکرد، بۆ نموونە تۆ دەتبینی ئەو شانەی شیوعییەی کە لەلایەن عەبد تەمەرەوە رێکدەخرا، کە ئەو تەنها پیاوێکی سەندیکایی بەرێزبوو، لەشانەکەیدا ساسۆن دەلال ببووە ئەندامێکی سادە. ساسۆن دەلال یەکێک بوو لەوانەی کە مارکسیەتیان خوێندبوو، ئەو لەکاتی ئەڵقە مارکسیەکانی رێکخستنی جولەکە تێیدا قوڵببووە. نەدەتوانرا ئەوە لەجولەکەکان بشاردرێتەوە، کە دەیانویست شیوعیەت و حزبە شیوعییەکان بقۆزنەوە، بەتایبەتی لەوڵاتانی عەرەبی، بۆ ئەمەش دەستەبژێرێکیان لەگەنجەکان ئامادەکردو شیوعیەتیان خوێندو تێیدا بوونە مامۆستا.

بۆیە عەبد تەمەر بەسەرسوڕمانییەوە دەوەستا و سەیری هاورێ ساسۆن و رۆشنبیرە مارکسیە فراوانەکەی ئەو و نەزانییەکەی خۆی دەکرد. ئەمە سەرەتای داگیرکردنی حزبی شیوعی بوو لەلایەن جولەکەکانەوە.

هێندەی پێنەچوو، کە ئەوان شێوازەکانی خۆیان گرتەبەر کە لێزانانە بەکاری دەهێنن و هەموو بنەماکانی ئەو شێوازانەیان هەیە: ماڵ و وروژاندن و خواردنەوە. دوای ئەوەی لەو ئەرکەیان سەرکەوتن، کۆمەڵەی جولەکەیان دروستکرد، کە لەکاتی هەڵوەشانەوەشیدا ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵەیە وەک ئەندامی حزبی شیوعی وەرگیران، بێ

پاڵاوتن و تەزکیەکردنێک. ئەمەش لەدانپێنانەکەی یەعقوب میر میسریدا هاتووە.

حکومەتی سەردەمی پێشوو، دوای ئەوەی فەسڵی کردم، ستەمی لێنەکردم، تەنها توانی چەند مانگێک فەسڵم بکات، کە لەو چەند مانگەشدا کارم لەکۆمپانیایەکی نەوت لەبەسرا دۆزیەوە، کە مووچەیەکم لەو کۆمپانیایە وەردەگرت، بەقەد ئەو مووچەیە بوو کە لەحکومەت وەرمدەگرت. دواتریش لەفەرمانگەکانی حکومەت کارم پێدرایەوە.

بەڵام ئێستا لەسەر راپۆرتێکی درۆ فەسڵ کراوم، کە شیوعییەک لەسەر منی بەرزکردۆتەوە، کە دەسەڵاتی بەسەر کاروباری فەرمانگەکەوە هەیە. سەرەڕای ئەوەی بەڕێوەبەری ئەمن دوای لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو راپۆرتە بەرائەتی بەمن داوە.

کارکردنیش لەکۆمپانیاکانی نەوت ئێستا نییە، تەنها لەڕێگای بەرێوەبەرایەتی کاروباری نەوت نەبێت، ئەویش بەگەڕانەوەم رازی نابێت، ئەمە گەر دوای رەزامەندی وەزیری نەوت و وەزیری پێشووی ئابووری نەبێت، بەڵام وەزیری ئابووری رەزامەندی لەسەر داواکەی من نەداوە بۆ کارکردن لەکۆمپانیای نەوت، چونکە من فەرمانبەرێکی فەسڵ کراوم.

لەجەنجاڵی ئەو یادەوەرییە تاڵانەی کە لەهەشت ساڵەی ئەزمونە تاڵەکەی شیوعیەتمدا هەمە، خەریک بوو ڕووداوێکم بیر بچێتەوە، کە ئەوکات بەگرنگم نەدەزانی. بەڵام ئێستا لەچاوی خەیاڵمدا لەژێر ڕۆشناییەکی نوێ وەک ڕووداوێکی پڕ ناوەڕۆک و پەند دەردەکەوێت. من لەیەکەم ساتەوە دەمزانی شیوعیەت باوەڕی بەخودا نییە. منیش چارەنووسی خۆم بەڕەوڕەوەی ئەو گالیسکەیە گرێ دابوو، کە لەڕێگا دیاریکراوەکەیدا ئەسپەکوێرەکەی شیوعی رایدەکێشا، بەڵام ئەو ڕووداوە زیاتر لەو تێگەیشتنە دڵنیای کردمەوە.

لەهاوینی ١٩٤٨ کە لەپشووی هاوینداب‌ووم، دەستگیرکرام، نزیکەی دوومانگ لەزیندانی سەرای بووم، دوای ئەو دوو مانگە گوێزرامەوە زیندانی گشتی. وەک کەسێک بووم کە لەبنەبانی دۆزەخەوە بۆ ناو دارودرەختەکەی بەهەشت هاتبم.

دەمەو خۆرئاوابوو، ئەوکاتەی ڕۆژێک لەڕۆژەکانی زیندان بێ ئەنجام بەرێ دەکەیت، بێ بەردانێک. بێ سەردانی کەسوکار و دۆستێک. کاتی خۆرئاوابوون بەئازارترین کاتە. خۆر بەسێبەری، ماڵئاواییکردنی ڕەنگێکی سوورتاری ئازاربەخش بەسەر دیواری زیندان جێدەهێڵێ، لەگەڵ خەمبارکردنی دەروون. ئەوکاتە پیاو هەست بەغەریبیەکی بەهێز دەکات بۆ دونیا نادیارەکان. غەریبیەک بۆ ئەو کەنارانەی کە چارۆگە سپییەکان لەخۆرئاوابووندا ڕەنگێکی سورباو دەیانگرێ.

غەریبیەک بۆ ئەو شارە رووناکانەی کە خەڵکی رۆحسوک و خۆشەویستی تێدا دەژین.

لەخۆرئاوابوونێکدا بینیم زیندانییەکان بەدەوری بونەوەرێکی زەبەلاحی سەیر هەندامەوە. سەیرو ریشێکی زۆری هەبوو. ئەوان بەدەوری ئەودا وەک چۆلەکە بوون بەدەوری لەقلەقەوە. باڵای بەرزی بەسەر سەری کەسانی دەوروبەرییەوە، لەدوورەوە دیاربوو. حەپەسابوو وەک ئەوەی لەدونیایەکی سەیردا بژی.

ئەو دەستگیرکراوێکی نوێ بوو، ئەمرۆ لەیەکێک لە بنکەکانەوە هێنابوویان، بەڵام ئەو وەک هەموو بەندکراوەکانی دیکە نەبوو، ئەو رووسی بوو، لەڕووسیاوە دوای چەند ساڵێکی کەم لەشۆرشە سۆسیالیستیەکەی رایکردبوو، بەدرێژایی ئەو چەندین ساڵە لەئێران ژیابوو، دواتریش گەیشتبووە عێراق. ئێستایش ئەوەتا دەستگیر کراوە، چونکە بێ پەساپۆرت هاتۆتە خاکی عێراق. هەموو ئەمانەمان دواتر زانی.

لەنێو دەستگیرکراوەکاندا شێخێکی دەرەبەگ هەبوو، کە بەتۆمەتی کوشتنەوە دەستگیرکرابوو، کاتێک شێخ ئەو زەبەلاحە رووسەی بینی و رەوانەی لای ئێمەی کرد، ئێمەی شیوعی و پێی گوت "تۆ روسی برۆ لای ئەو شیوعیانە ئەوان جەماعەتی روسیان."

روسەکە هاتە لای ئێمە، رایەخێکی حەسیری بەبن هەنگڵیەوە بوو، کە پڕبوو لەکێچ و ئەسپێ. ئێمەش حەواندمانەوە، ئەو خواردنەی هەمان بوو، پێمان دا. دوو سەعاتی بەخواردن بەسەربرد، سەمون و پەنیر و برنج و خورما و کاڵەک و کەباب و هەر جۆرێکی دیکەی خواردنی قوتدەدا، کە لێرەو لەوێ هەبوو. دواتر بەسەر جێگەی پاڵکەوت و

قاچەکانی راکشاند و لەشی خاوبوونەوە و حەسانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە دەبینی.

پرسیارمان لێکرد: بۆچی لەولاتەکەی خۆی رایکردووە. بەهەشتی شیوعیەت کەسێک تێدا راناکات، مەگەر شێت یان سیخوڕ نەبێت. کابرای رووس بەعەرەبییەکی خراپ وەلامی داینەوە: من لە گەنم کارم دەکرد- زانیمان کە جووتیار بووە- دواتر شۆرش بوو. هەموو شتێک گۆڕا. لەوێ خودای گەورە نییە. لەوێ شێخ نییە. هاتنە لام من پێمگوتن من ماندووم دەمەوێ بحەسێمەوە. گوتیان: کاردەکەی. دەخۆی، کار نەکەی دەمری. کارێکی خۆشیان پێدام لەکارگەیەکی دەزوو. سەرەڕای ئەمەش رامکرد.

پرسیارەکەمان دووبارە کردەوە: بۆچی هەلاتی؟ کابرا بێ دەنگ بوو، نێوچەوانی گرژبوو، وەک ئەوەی رووبەڕووی ئازارێکی گەورە ببێتەوە، گوتی "بینیم خەلکیان دەکوشت. بەو چاوانەی خۆم بینیم لەشەودا لێرەو لەوێ دەنگی تەقە بەئاشکرا دەبیسترا، کە قوربانی نوێی لێدەکەوتەوە."

ئۆقرەمان نەما و زانیمان خۆی لەوەلامدانەوەی دەدزێتەوە، ئەو پرسیارەمان دووبارەکردەوە، کەچی وایکردووە لەبەهەشتی خودا لەسەرزەوی رابکات. ئەویش بەپرسیار وەلامی داینەوە: ئێوە بۆ لەبەغدا رادەکەن؟ ئەو وای زانیبوو کە ئێمە جولەکەین و ویستومانە بۆ ئیسرائیل رابکەین. بۆیە دەستگیرکراوین. کاتێک پێمان گوت کە ئێمە موسلمانین و چەند مەسیحیەکیشمان لەگەلدایەو یەک جولەکەمان لەگەل نییە. دلنیابوو و رەنگی هاتەوە بەرخۆی، دەستی بۆ ژێر سەرینەکەی برد، دووکەلە داری دەرهێنا، کە لەشێوەی خاچ بە بەنێکەوە بەسترابوو. خاچەکەی بۆ بەرزکردینەوەو گوتی "لەپێناوی

ئەو رامكرد". لەمەینەتیەكەی ئەو تێگەیشتین. ئەو لەپێناو ئایینەكەی رایكردووە. لەنێوخۆمان كەوتینە پەلاردان، یەكێكمان بەگوێی ئەویتری چرپاندو بەرزیش قسەی كرد، ئەو رووسە بەتەواوی عەرەبی نەدەزانی. ئەو كەسەی ئێمە دەیگوت "هەی گێل. ئایین نانە تا بخورێت. جلە بپۆشرێت. خانووە تێیدا بحەوێیتەوە. تا لەپێناویدا رابكەیت. چیت دەوێ لەژیان زیاتر لەخواردن و پۆشاك و ماڵ؟ شۆرشیش هەموو ئەمانەی بۆ دابینكردی. ئەی دەبەنگ. یەكێكی دیكە كە نوكتەچییەكی سەركەوتووە گوتی "لە ترسی سەمونی ئایین هەڵاتی نەوەك بخورێت."

بەزمی ئەو شیوعیانە سەیرە. خواردن و پۆشاك و ماڵ. هەر ئەوانەیان لەخەیاڵ دایە. ببوورە دەبێ سێكسیشی بۆ زیادبكەین. كەواتە چ جیاوازییەك لەنێوان ئاژەڵ و مرۆڤدا هەیە، هەردووكیان دەخۆن و دەخۆنەوە؟ ئەوان وەڵام بەوە دەدەنەوە، كە مرۆڤ چەندین هونەری لەشێوەی شیعر و موسیقا و وێنە و پەیكەرتاشی و گۆرانی و نواندن هەیە، كە دەتوانی ژیانی پێ بنەخشێنێ. بەڵام پیاو لەخۆی دەپرسێ: كامە شیعر و كامە مۆسیقا و گۆرانی؟

شیعرێك لەنان و پۆشاك؟، مۆسیقایەك لەمانگرتنی كرێكاران لەكارگەی ئۆتۆمبێلی فۆرد بۆ زیادكردنی كرێی رۆژانەیان بەبیست دۆلار لەرۆژێكدا. گۆرانی بۆ كارەساتەكەی كەركوك و ئەو رۆڵە شەرەفمەندانەیەی كە هێزە نیشتیمانپەروەرەكان رۆڵیان تێدا هەبوو، ئەوەی شیوعییەكان لەخەبات و پارتیزانی دەزانن، مەبەستیان زیاتر لەنان و پۆشاك زیاتر نییە.

بەستەزمانە ئەو مرۆڤایەتییە. وادەزانی لەو چەندین سەدەیە مەزن بوو. چ مەزنییەک! شیوعیەت ڕێبازێکە کە چارەگی دانیشتوانی جیهان پەیڕەوی دەکەن؟

چ جیاوازییەک لەنێوان ئەو بابلییە کۆنانە هەیە، کە هەزاران ساڵ بەر لەمەسیحەوە ژیاون لەگەڵ ئەو شیوعیانەی کەلەسەدەی بیستەم دەژین؟

بابلییەکان لەپێناو داواکارییە ماددیەکانی ژیانی ڕۆژانەیان خوداوەندی ئیلۆ و تەمموز و عەشتاریان دەپەرست. قوربانیان بۆ ئەو خوداوەندانە دەکردو لێیان نزیک دەبوونەوە بۆ ئەوەی بارانی زۆر و بەروبومی فەراهەم و کاوڕ و گوێرەکەیان پێ بدات. بەڵام دواتر مرۆڤایەتی مەزنتر بوو، پێغەمبەری نموونەی وەک مەسیح و موحەمەدی تێدا دەرکەوت. ئەو پێغەمبەرانە ویستیان نەمری بەمرۆڤ بدەن. نەمری بۆ روحی مرۆڤ ئەو ئاواتە ئازیزەیە. بۆیە کتێبە ئاسمانییەکان باسی نەمری ڕۆح و هەڵسانەوە و دونیایەکی دیکەیان کردووە. دواتریش فەیلەسوفەکان هاتن. بێگومان بەر لەپێغەمبەرەکانیش فەیلەسوفەکان ئەو قسانەیان بۆ مرۆڤ کردووە. ئەمە وەها بوو تا ئەو جولەکە لاسارە هات. کە کارل مارکسە، مرۆڤایەتی گەڕاندەوە شوێنی جارانی خۆی. لەسەدە سەرەتاکانی. چا نان و پۆشاک و سێکس ئەو شتانەن، کە زەینی ئەو کەسانەی داگیرکردووە، کە باوەڕیان بەفەلسەفە بێباوەڕەکەی مارکسەوە هەیە.

یەکێک لەگۆڤارەکان پرسیاری لەمێژوونووسی گەورەی بەریتانی توینبیی کردبوو، کە ئایا شتێک لەبارەی شیوعییەتەوە دەزانی؟ یان

شتێکی لەبارەیەوە خوێندۆتەوە؟، ئەو وەڵامی دایەوە کە لەبارەی شیوعیەتەوە خوێندنەوەی هەبووە، بەڵام نەوەک لەکتێبەکانی مارکس و ئینگلس و لینین، بەڵکو لەتەورات، کتێبە پیرۆزەکەی جولەکە.

لەڕاستیدا توێنبی لەوەی دەیڵێ چاک بۆی چووە. ئێمە ئەگەر سەیری کۆمیۆنەکانی ئیسرائیل بکەین، دەبینین لەشێوەی چەند گوندێکن کە سیستەمێکی تێدا پەیڕەو دەکرێ لەگەڵ سیستەمی شیوعیدا جمکە. ئایا جولەکە ئەو سیستەمەیان لەکوێ هێناوە؟ ئەوان لەتەوراتیان دۆزیوەتەوە. هەروەک باوکی شیوعیەتیش کە کارل مارکسە لەوێی دۆزیوەتەوە، ئەو جولەکەیە بوو. کەچی بەدرۆ و ریابازی دەیگوت ئایینە جولەکەکەی گۆڕیوەو ئایینی مەسیحییەت پەیڕەو دەکات.

مێژووی عەرەب پڕیەتی لەناوی ئەو جولەکانەی کە بەدرۆ خۆیان وانیشانداوە، کە موسڵمانبوون، تا ئەو کاتەی موسڵمانان لێی دڵنیا دەبن و جا قۆڵیان هەڵدەماڵن، بەدڵی خۆیان تا بۆیان کرابێت هەوڵیان داوە بەزم بەئایین و پەیڕەوەکانی پێغەمبەری مەزن بکەن. چیرۆکی کەعبی ئەحباری جولەکە و خۆدەرخستنی وەک موسڵمانێک و گێڕانەوەی هەندێک فەرموودەی پێغەمبەری مەزنی عەرەبەو ئەو رۆڵە نەگریسەی کە لەسیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامی گێڕای، نموونەیەکی دوور نییە لێمان.

ئێمە کاتێک شیوعییەکانی ناوخۆ بەبرایانی جولەکە ناودەبەین، ئەوا پێگەیان بەرزدەکەینەوە، ئەوان برای جولەکە نین، نەخێر. ئەوان نەگەیشتوونەتە ئەو پایە، بەڵکو ئەوان خزمەتکاری جولەکە و سیخور

بەخۆڕایی و هەندێک جاریش سیخور، بەکرێگیراوی ئەوانن. ئەوان داردەستی جولەکەن.

جولەکەی جیهانی کە ئەو دەسەڵاتە فراوانەی هەیە، توانی دونیا لەدژی هیتلەر قوت بکاتەوە، کە دوژمنی سەرسەختی ئەوانە، تەنانەت یەکێتی سۆڤیەتیش کە هاوپەیمانی ئەڵمانیای هیتلەری بوو، جولەکە توانی بیکاتە دوژمنێکی سەرسەختی هیتلەر، تا کارگەیشتە ئەوەی نووسەری سۆڤیەتی جولەکە ئیلیا ئەهرنبێرگ بڵێ "دەبێ ئەو ئەڵمانانە لەناو بەرین و سەری منداڵەکانیان ببڕین و خوێنیان بخۆینەوە."

رقە نەگریسەکەی جولەکە خۆی دەدەوێ. ئەگینا گوناهی ئەلمانییەک چییە کاتێک هیتلەر تاوانبار و پیاوکوژ بێت؟ ئەی گەلی ئەڵمان خۆشیان قوربانی سەرشێتیەکانی هیتلەر نەبوون؟

ئەستێرەی جولەکە خەریک بوو لەیەکێتی سۆڤیەتدا دەڕژا، کاتێک کە تاوانە چەپەڵەکانی ئەو پزیشکە جولەکانە ئاشکرابوو، کە لەیەکێتی سۆڤیەت ئەنجامیان دابوو، ئەوە سەلمێنرا کە ئەوان نووسەری رووسی بەناوبانگ مەکسیم گۆرکی و چەندین کەسایەتی دیکەیان کوشتووە، بەڵام جولەکە توانیان کەسایەتی خۆیان بگێڕنەوەو متمانەیان بەخۆیان بگەڕێتەوە، ئەوان زەفەریان بەبیریا برد، کاتێک بەکۆمەڵێک تۆمەت تاوانباریان کرد، کە یەکێک لەوانە تۆمەتی (تۆمەت دروستکردن بوو) لەدژی پزیشکە جولەکەکان.

هاوڕێیانی جولەکە باسی ئەوەیان بۆ دەکردین کاتێک کە جەنگی فەڵەستین بوو، ئێزگەی ئیسرائیل وەهای بڵاودەکردەوە، کە ئەمە

جەنگی نێوان پێشکەوتوخوازانی جولەکە و دەرەبەگایەتی کۆنەپەرستی عەرەبە، ئەو حەسقلیانە بەوەمنەتباریان دەکردین، کە ئیسرائیل دەبێتە پەناگەیەکی ئارام بۆ ئازادیخواز و ئەوان هەموو شیوعییە چەوساوەکانی وڵاتانی عەرەب و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست داڵدە دەدەن.

شیوعییەکان ئەو دورشمەی بەرزی دەکەنەوە، لەو وتەیەی مارکسیان وەرگرتووە "مرۆڤ بەنرخترین سەرمایە لەجیهان". سەرەڕای ئەمەش نەیارترین دوژمنی مرۆڤن. بەڵکو ئەوان بەتەواوی مرۆڤ دەهاڕن. روحی دەهاڕن و لەهەموو مافێکی دەربڕینی سۆز و بیری دادەماڵن. ئەوان کاتێک دەڵێن کۆتایی مرۆڤ فانییە و زیندبوونەوە نییە. قسەکردن لەسەر رۆح و بەهەشت و دۆزەخ قسەیەکی بۆرژوازیانەی پڕوپوچە. ئەوا ئەوکات ئەوان بەهای مرۆڤ کەمدەکەنەوەو لەو نەمرییە بێبەشی دەکەن، کە ئایینەکان موژدەیان پێداوە. شیوعیەکان وا لەمرۆڤ دەکەن کە یەکسان بێت لەگەڵ مێروله و مێشووله و هەر بوونەوەرێکی دیکە کە زیندووبوونەوە و رۆژی دوایی نییە. ئەوا بەبیانوی پاراستنی بەرژەوەندی کۆمەڵ، تاک دەهاڕن، بەڵام ئەو کۆمەڵە لەکوێ پێکدێت؟ ئایا لەتاکەکان پێکنەهاتووە؟ ئەگەر ئێمە تاکێک تێکبشکێنین، ئەی مانای ئەوە نییە کە کۆمەڵیش بەو تاکە تێکشکاوانە پێکهاتووەو ئەویش لەئەنجامدا تێکشکاوە؟ ئەو کۆمەڵەش لەخێروبێری بەهەشتی شیوعیەت چی بەدەستهێناوە؟ نانی رەش؟ جلوبەرگی کۆن؟ یان ئەو سەلاجەیەی کە شەش مانگ سەرەی بۆ دەگرێت و جا نۆرەی دێت بیکڕێت؟

تێڕوانینی مادی بەچەمکە باوەکەی بەسەر بیرکردنەوەی هاوڕێیانی شەرەفمەند لەعێراق زاڵە، هەندێکیانم بینی تەلاری گەورەیان کڕیوە، کە تێچووەکەی ٦٠ هەزار دینار دەبێت. ژن دەهێنن و ئاهەنگێک لەیانەی ئەمباسی ساز دەکەن، پێنج سەد کەسی بۆ بانگهێشت دەکەن.

ئەوەیە شیوعیەت و ئەمانە شیوعییەکانی. سوپاس بۆ خوا لەو تاریکاییەی نەجات دام، کە تێیدا گینگلم دەدا. ئەو کاتەی شیوعییەک بووم لەشیوعییەکان.

بەڕاستی پێم خۆشە هەلێکم بۆ بڕەخسێ، قسە لەسەر شیعر بکەم، هەر لەکاتی شۆرشەوە عێراق لەمۆتەکەی سووردا تەژی بووە، تا ئەو کاتەی زەعیمی بێ هاوتا ئاژاوەگێڕ و شێوازەکانی وەستاند، لەو ماوە دووورودرێژەدا هەموو بنەماکانی شیعر و بابەتەکانی شیعر بەرەوپێش نەچووە. تەنانەت تاکە دەنگەکەش لەدەنگە زولاڵەکان کە سەری شیعری عێراقی بەرزکردۆتەوە لەنێو ولاتانی عەرەبیدا وەستا. ژنەشاعیری مەزنی عەرەب خاتوو نازک مەلائیکە؟ کوا دەنگی شاعیری داهێنەر مامۆستا عەلی حیلی؟ ئایا وایلێهاتووە لەبری قەسیدە جۆشدراوەکانی بەئاگر کە لەبارەی جەزائیر و شۆرشی گەلی عەرەب لەهەر شوێنێک نووسراوە، دەبێ بیست قەسیدە بخوێنینەوە کە لەبەرلینەوە هاتووە، یان ٥١ قەسیدەو زێتر کە لەدیوانە سوورە پوچەڵەکان هاتووە؟ تەنانەت منیش لەو ماوەیەدا تەنها یەک قەسیدەم نووسیوە، ئەویش لەبارەی خانمە پاڵەوانی عەرەب جەمیلە بوحێردە، کەچی تاکە دەسنووسی ئەو قەسیدەیەشم لێ ونبووە، لەگەڵ چەندین قەسیدەی دیکەو چەندین وتار کاتێک هاوڕێیان "زۆر بەشەرەف" هێرشیان کردە سەر رۆژنامەی حوریە.

ئێستا هۆکاری ئەوەم بۆ درەکەوتووە، کە بۆچی شیعر لەو ولاتانەی کە حزبە شیوعییەکان حوکمڕانی دەکەن لەسەرەمەرگدایە یان

دەمرێت. شیوعییەت و شیعر دژ بەیەکترن، بەهیچ بارێک ناتوانرێت کۆ بکرێنەوە. ئێستا گۆڤاری الوادی دەرفەتی ئەوەی پێدام، کە قسە لەسەر شیعر بکەم، کە لەیەکێک لەدواژمارەکانیدا ئەو چەند پەرەگرافەی نووسیوە:

مامۆستا بەدر شاکر سەیابی شاعیر نوسینێکی بەناونیشانی شاعیرە شیوعییەکان نوسیوە، کە بەشێکە لەو نووسینەوەی کە بە زنجیرە لەیەکێک لەرۆژنامەکان بەناونیشانی "من شیوعی بووم" بڵاوی دەکاتەوە، کە ئەو بۆچوونە سەیرەی تێدا هاتووە، "بۆ نموونە من شیعری زۆر لەشاعیرانی شیوعیم خوێندۆتەوە، لەوانە نازم حیکمەت و نیرۆدا و راگۆن و ماوتسی تۆنگ و شاعیری سۆڤیەتی سیمۆنۆف، بینیم زۆر بێ مانان، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەیان شایەنی ئەوە نین پێیان بگوترێت شیعر، کەچی وەک ئەندامێکی حزب، پابەند بووم بەبەرگریکردن لەو شاعیرانەو بانگەشەکردن بۆیان، کە گوایە مەزنترین شاعیری دونیان. وەک ئەوەی بڵێم، شاعیرێکی پڕوپوچی وەک نازم حیکمەت مەزنتر بێت لەشاعیری بلیمەتی ئینگلیز ئیلیوت و ئیدیس ستویل کە ژنەشاعیرێکی ئایینپەروەر بوو، چونکە ئیلیۆت شاعیری مەرگ و دەرەبەگایەتی و ئیمپریالزمە، بەڵام خودی خۆم زۆر سەرسام بووم بەئیلیۆت و ستویل، تەنانەت من سەرسام بووم بەشاعیری مەزنی ئەڵمانی رێلکە، کە رەخنەگرانی ئەدەبی شیوعی وەک نموونەی شاعیرێکی رەجعی و رەشبین وەریاندەگرت و گوایە گوزارشت لەئومێدی چینێک دەکات، کە لەناوچووە، ئەویش چینی دەرەبەگە، ئەوە لەحاڵەتێکدایە نەوەک تەنها رەشبینە بەڵکو خوازیاری مەرگیشە، بەڵام کێ دەتوانێ بەوان بڵێت رێلکە لەڕووی شیعر و

مرۆڤایەتی و پێشکەوتوویی، زۆر لەسیمۆنۆڤ مەزنترە، کە گەورەترین شاعیری سۆڤیەتە؟

کاغەزە سورەکە ماوەیەک لەمەوبەر قەسیدەیەکی بڵاوکردەوە، کە وەرگێڕدراوی شیعری شاعیرێکی شیوعی چینی بوو، کە دەڵێ:

جۆخینەکان گەورە دەبن

دەبنە گرد

عەمبارەکان پڕدەبن لەگەنم

بەیانیەک زوو لەخەو هەڵدەستم و

مانگاکەم دەبەمە کێڵگە.

ئەگەر ئەو تێکەڵەیە بەشیعر بزانین، ئەوا سوکایەتی بەشیعر و شاعیران دەکەین، کەچی شیوعییەکان بەشیعرێکی مەزنی دەزانن.

سەیاب دەڵێ "بەڵام من وەک شیوعیەک و ئەندامێکی حزبی شیوعی پابەند بووم بەوەی بەرگری لەو شاعیرە پروپوچانە بکەم". ئایا دەچێتە عەقڵ، کە حزبێک رێز لەخۆی بگرێت شاعێرێکی ئەندامی ناچار بکات بۆ ئەوەی لەبیرکردنەوەی خۆی لابدات، بەتایبەتی ئەگەر ئەو شاعیرە پایەی لەمەعروف رەصافی کەمتر نەبێت، لەو شاعیرتر بێت وەک خۆی وەها وەسفی خۆی دەکات. سەرەڕای ئەمەش لەناو حیزبە شیوعییەکاندا ئێستا شاعیرانێک هەن، کە باوەڕیان بەشیعری سەربەست نییەو کاریان بەو شێوازە نەکردووە، سۆزیان بۆ

شاعیرانی شیوعی نییە، تەنها لەبەرئەوەی کە شیوعین، ئایا حزب دەریکردوون، یان ئاگادارکردنەوەی پێداون؟

سەیر لەبەزمی سەیابی برامان ئەوەیە، کە ئەو دەیەوێت لەگوناهێک نەجاتی بێت، کەچی دەکەوێتە گوناهێکی دیکەوە کە لەوەی دیکەیان کەمتر نییە، ئێستا ئەو پێی وایە کە نازم حیکمەت و ماوتسی تۆنگ و بابلۆ نیرۆدا لەهیچ و پوچەکانن، باشتر بوو سەیاب ئەوەی بگوتایە کە شێوازی ئەوانی لەشیعر نووسین، یان وێنە شیعریەکانی ئەوانی بەدڵ نییە، بەڵام دەڵێ هیچ و پوچن! خوا لێت خۆشبێ بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە ئەدەبیانەت، کاتێک تۆ شیوعی بووی هیچیتر بوو، یان ئەو بڕیارە نوێیانەت کە لەدوای دوژمنایەتی شیوعیەت و شاعیرانی شیوعی دەیدەیت؟

ئەو گۆڤارە دەپرسێ: ئایا دەچێتە عەقڵ کە حزبێک رێز لە خۆی بگرێت شاعیرێکی ئەندامی ناچاربکات بۆ ئەوەی لە بیرکردنەوەی خۆی لابدات؟

منیش بەوە وەڵامی دەدەمەوە: ئایا حزبی شیوعی رێز لەخۆی دەگرێت؟

هەموو رووداوەکان پێچەوانەوەی ئەمەیان سەلماند. حزبی شیوعی کە لەرۆژنامەی ئاشکراکەی خۆی "اتحاد الشعب"دا، چەندین وتار بڵاودەکاتەوە، کە هانی گێرەشێوێنی و تاوان و کوشتنی هاولاتیانی بێگوناهـ دەدات. تاوانی رێگرەکان و دادگا مللییەکانیان لەعەین زالە و شوێنەکانی دیکە بەهۆشیاری بۆ ئەرکی نیشتمانی ناودەبات.دواتریش

لەبەیانێکی بەرفراواندا وەها بڵاوی دەکاتەوە، کە نموونەی ئەو جۆرە رووداوانە تێکگیربوونی تاکەکەسی و هەڵەیە. ئەو جۆرە حزبە ناتوانێ رێز لەخۆی و ئەو جەماوەرە بگرێت، کە گوایە نوێنەری زۆرینەیانە.

دەردی حزبی شیوعی عێراقی هەرلەسەرەتای دامەزراندنیەوەو تا ئێستا بەو هەموو جەنگانە کە لەناو سەرکردایەتییەکەی هەڵگیرساوە، لەو هەموو لادان و ئینشقاقەدا ئەوەیە کە ئەو باوەڕی بەگەلی عێراق نییە.. هەر چەندە بۆی دەگری و بانگەشەی ئەوەش دەکات، کە نوێنەری بەرژەوەندییەکانیەتی و داکۆکی لێدەکات.

ئەو حزبە ئێستاشی لەگەڵدا بێ، خەون بەوە دەبینێ کە لەعێراقدا شیوعیەت بەرپا دەبێت، ئەمیش تەنها لەڕێگای خەباتی گەلەوە نابێت، بەڵکو لەڕێگای سوپای سوورە(مەزنەکەوە)، کە داگیری دەکات، ئەوکاتە سکرتێری حزبی شیوعی وەک سەرۆک و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی وەک وەزیر دادەنرێن.

ئەمە هۆکاری هەموو ئەو ململانێیانەیە کە لەنێوان فەهد و دەیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، نموونەی وەک داود سابغ روویداوە، بۆ ئەوە بووە، کە دەست بەسەر سکرتاریەتی حزبدا بگیرێت. کاتێک فەهد بۆ مۆسکۆ سەفەری کرد، یەکێک لەئەندامانی لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی بۆ خۆی دەستی بەسەر چاپخانە نهێنیەکەی حزبدا گرت و بڵاوکراوەیەکی دەرکرد، کە تێیدا فەهد بەخیانەت تۆمەتبار دەکات. ئەمە ئاماژەیەکە بۆ ئەو ئارەزووەی دڵی سەرکردە شیوعییەکان دەسوتێنێ. بەوەی کە هەریەکەیان دەیەوێت ببێتە سکرتێر، چونکە ئەو

کاتەی کە سوپای سوری پێشەوا دێت، ئەوا ئەو کاتە، ئەو هاوڕێیە زەعیمەی ناو حزب دەبێتە سەرۆک کۆماری عێراقی میللی.

ئەگەر حزبی شیوعی باوەڕی بەگەلی عێراق بوایە، ئەوا بێگومان بەو جۆرە هەست و باوەڕ و ئومێدی وردوخاش نەدەکرد، ئەوان چوون هاوکاری جولەکەی جیهانییان دەکرد، بۆ ئەوەی عەرەب لەوڵاتی خۆیان دەربکرێن و خاکەکەیان بدرێت بەجولەکە. بۆ ئەوەی هەڵوێستەکەیان هاوشێوەی مۆسکۆ بێت. گۆڤاری الوادی ئەوە لەبیر خۆی دەباتەوە، کە شیوعیەکان چۆن سەیری ئەدەب دەکەن، ئەوان وەها سەیری ئەدەب دەکەن، کە بەپلەی یەکەم و تاکە پلە ناوەڕۆکە. ئەی فۆرم، یان شێواز، خەیاڵ، داڕشتن، هەموو ئەمانە بەلای ئەوانەوە خورافاتی بۆرژوازانەی هیچ وپووچە. هەموو بیرۆکەیەک ئەگەر مارکسی لینینی ستالینی نەبێت، ئەوا بیرۆکەیەکی هەیە، هەر کەسێکیش گوزارشتی لێ بکات ئەوا بەهەڵەدا چووە.

کاتێک دەبینی ئەو هەرزەگۆیە کە لەڕۆژنامە خەباتگێڕەکەی (اتحاد الشعب)دا بڵاودەکرێتەوەو لەشیعری هاوچەرخی چینی وەرگیراوە، ئەگەر رۆژنامەکە ئەو هەرزەگۆیەی بەشیعر و تەنانەت بەشیعرێکی چاکی نەزانیبێ بۆچی ئەو زەحمەتیە دەکێشێ بۆ ئەو خوێنەرانەی عەرەبی بڵاودەکاتەوە، کە مێژووە کۆنەکەی شاعیرانی بلیمەتی لەشێوە ئەبوتەمام و شەریف رەزای ناسیوە، ئێستایەکەشی شاعیرانی بلیمەتی وەک ئەحمەد شەوقی و عومەر ئەبو ریشە و نزار قەبانی و نازک مەلائیکە و ئەدونیس و یوسف خال و سلیمان ئەلعیسا و بەدوی جەبەل و چەندانی دیکە بەخۆیەوە بینیوە.

ئێستا مەزنترین شاعیری هاوچەرخ بێ هیچ رکابەرێک ت. س. ئیلیۆتە، بەلام بەبۆچوونی شیوعییەکان ئەو شاعیرێکی کۆنەپەرستەو گوزارشت لەئومێدە سیسەکانی چینی سەرمایەداردەکات، ئەو گوزارشت لەئایین و فەلسەفەی ئایدیالیزم دەکات. کەواتە ئەو بۆچوونەکانی کۆنەپەرستن و هەڵەیە، شیعرەکانیشی هەڵە لەناو هەڵەدا. کەواتە ئەو شاعیرێکی چاک نییە.. نەخێر بەڵکو هەر شاعیر نییە. بەڵکو شوعییەکان زێدە لەمەبەستی خۆیان چوونە پێش و بەوە ئیلیۆتیان وەسفکرد، کە ئەو هونەرێکی سەرفراز نییە لەهۆنراوەکانی.

گۆڤاری شیوعییەکان لەئەمریکا "سوسایتی ئیند سایتس" وتارێکیان لەبارەی ئیلیۆتەوە بلاوکردۆتەوە، ئەو بۆچوونانەی تێدا هاتووە، کە ئاماژەم بۆکرد، بزانین چۆن ئەو گۆڤارە خەباتگێرە رەخنە لەئیلیۆت دەگرێت.

بۆچوونە رەخنەییەکانی ئیلیۆتی وەرگرتووە، ئیلیۆت سەرەڕای ئەوەی شاعیرێکی گەورەیە، رەخنەگرێکی گەورەشە، ئەو گۆڤارە دەیەوێت دژەبۆچوونەکان لەخودی بیرکردنەوەی ئیلیۆت بدۆزێتەوە، کە چۆن دواتر خۆی پەیڕەوی کردووە، لەخودی قەسیدەکانی ئیلیۆتەوە. دەرئەنجامەکە سەرنجڕاکێش بووە، ئەو شاعیر نییە. ئیلیۆت کە وتارێک لەبارەی شیللیەوە دەنووسێ ستایشی هەڵچوونی سۆز دەکات لەشیعرەکانیدا، دواتر دێت وتارێک لەبارەی شاعیرێکی هاوچەرخ دەنوسێ و زاڵبوونی سۆز بەسەر شیعرەکانیەوە بەنەنگ دەزانێ. ئەمەیان بە بۆچوونی گۆڤارە شیوعیەکە دژبەیەکە، چونکە فەلسەفەکەی ئامۆژگاری کردووە، کە شتەکان دوور

لەبارودۆخەکانیان سەیر نەکات، ئەو نازانێ ئەوەی لەسەردەمی رۆمانسی بەجوانی شیعر دادەنرا، ئێستا لەو سەدەیە بەکەماسییەکەی دەزانرێت، زاڵبوونی سۆز بەسەر شیعر یەکێک بوو لەتایبەتمەندییەکانی شاعیرانی رۆمانسی، کەچی ئێستا یەکێکە لەنەنگییەکانی شیعر.

دەمویست چەند نمونەیەک لەشیعری شیوعی کە شاعیرانی شیوعی مەزن نوسیویانە بۆ خوێنەر وەربگێرم، بۆ ئەوەی بزانێت ئەو شیعرانە هیچە یان نا، بۆیە لەکتێبخانەکەم گەڕام کە رۆژانێک بووم بەکتێبیی شیوعیەت لەئەدەب و غەیرە ئەدەب ئاوادان بوو، بەڵام هیچم نەدۆزییەو،ە تەنها دیوانی"دۆستان و دوژمنان"ی شاعیری هاوچەخی سۆڤیەت کونستانتین سیمۆنۆڤ نەبێت. لەگەڵ کتێبێکی دیکە کە ناوی" ١٩ی قەسیدەی ماوتسی تۆنگ"ە، لەژمارەکانی داهاتووی رۆژنامەی حوریە نموونەی شیعری ئەو دووشاعیرە گەورەی شیوعی وەردەگێرم.

ئەو دیوانەی سیمۆنۆڤ لەخانەی زمانە بێگانەکانی مۆسکۆ لە ١٩٥١ چاپکراوە، دیوانەکەی ماوتسی تۆنگیش لەخانەی زمانە بێگانەکان لەپەکین چاپکراوە، بۆیە بوارێک بۆ هاوڕێیانی بەشەرەف نییە، کە بانگەشەی ئەوە بکەن، کە ئیپریالیزمی ئەمریکی و ئینگلیز دەستکاری قەسیدە مەزنەکانی شیوعیەتیان کردووە، کاتێک وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی، من هەوڵیش دەدەم تا بتوانم ئەو قەسیدانە بەجوانترین شێوە وەردەگێڕم.

ئەو سیمۆنۆڤە وەک لەپێشەکی دیوانەکەیدا هاتووە، چەندین جار خەلاتی ستالینی وەرگرتووە، لەساڵی ١٩٤٨یش لەبەر ئەو دیوانەی وەریگرتووە کە ناوی 'دۆستان و دوژمنان' ئەو شاعیرە لەساڵی ١٩١٥ لەدایکبووە، کەواتە تەمەنی بچووک نییە، تا کاتێک شیعرەکانی هیچ بوو هاوڕێیان بیانویان هەبێت

دەمەوێ بەو بۆنەوەیەوە ئەوە بڵێم کە مەزنترین شاعیری هاوچەر لەیەکێتی سۆڤیەت باسترناکە، کە نووسەری 'دکتۆر زیفاگۆ'یە، بەلام بەشێوەیەکی فەرمی وەک شاعێرێکی مەزن نەناسراوە، چونکە قەسیدەکانی لەبارەی خەباتەوە نییە، بەڵکو لەبارەی گوڵ و بولبول و دەریاچەکانە. لەلایەکی دیکەیش ئەو سیخورێکی نەگریسەو بەکرێگیراوی سەرمایەداری شەڕخوازە. ئەمە بەهۆی ئەوەی لەڕۆمانەکەی 'دکتۆر ژیفاگۆ' دەرکەوتووە، کە ئەو پەست و بێزارە لەوەی کە لەبەهشتی شیوعیەتدا دەژی.

خوێنەری ئازیز ژمارەی پێشوو باسی کۆنستانتین سیمۆنۆڤم بۆ کردی، کە لەڕوانگەی فەرمی، واتە ڕوانگەی حزبی بەمەزنترین شاعیری هاوچەرخ دادەنرێت، ئەوەشم پێڕاگەیاندی کە دیوانەکەی (دۆستان و دوژمنان) خەڵاتی ستالینی لەساڵی ١٩٤٨ وەرگرتووە. ئەمڕۆ من یەکێک لەقەسیدەکانی ئەو شاعیرە مەزنەی سۆڤیەتت بۆ وەردەگێڕم، بۆ ئەوەی خۆت بڕیار لەسەر ئەوە بدەی، کە تێڕوانینی شیوعییەکان بۆ شیعر چییە. دیوانەکەی وەک ئەوەی بۆم ڕێکەوت کردووە، لاپەڕە ٢٩ی کەوتە بەرچاوم، کە قەسیدەیەکی تێدایە، بەناونیشانی "وەحشیەتگەرەکان". ئەمەیە وەرگێڕانەکەی، ویستوومە تابتوانرێت بەجوانترین شێوە وەرگێڕانی بۆ بکەم:

لەیەکێتیەک مەزنتر نییە.

ئەتڵەسی فراوان نەبێت کە قوڵترە

درک بەقوڵایی بکرێت

کاتێک کە شەپۆڵە تێکگیربووەکانی دەنەڕێنن

وەک تۆپهاوێژەکان بێپچڕانەوە، کەچی زەریا هەڵدەچێت

دەنگی نامۆکان لەبارەکەوە دێت، لەناو ژاوەژاوی قرپێک

وەک ئەوەی لەگۆڕەپانی زیندانە بەردینیەکە بم

لەسەر پشتی کەشتیەکە بەتەنها دێم و دەچم

ماوەی حەوت رۆژە.

مشتم داخستووە

چاودێری ئەو رژێمە ماندووە دەکەم

ئەوروپا بەسەر گەشتەیەکە و حەمبارەکەی رادەکشێ

ئەوە ئەوروپای (ماکیس) نییە

ئەو ئەوروپایەش نییە لەگۆڕەپانی جەنگدا بەرگری لەئازادی کرد

پێی باشتر بوو بمرێت نەوەک دیل بێت

ئەوەی ئێستا بەسەر کەشتیەکەوەیە

وا پێباشتر بوو ماوەی حەوت ساڵ

لەویلاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بمێنێتەوە

بۆ ئەوەی ئامێری مۆسیقاکە لە رێگادا بخولێنێتەوە

بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی نوخبە ببریسکێنێتەوە

بۆ ئەوەی چۆکدا بداو شەرمەزار بێت، بۆئەوەی سۆزیان بەدەستبهێنێ

بۆیە دەبێتە سەگی پاسەوانیان و دەبێتە بەندەیان

ئەوە ساڵی (١٩٤٦)ە، من لەسەفەرێک دام بۆ وڵاتەکەم.

هێشتا بکوژە بەکرێگیراوەکە بەدەم رێگاوە گوللەی قینی نەتەقاندووە.

وەک ئێستا دەزانرێت

لەگەڵ پرۆژەکەی مارشالەوە (یان ئەویان پلانە(

کە ئەوکات مەسەلەکەی بڵاو نەکرابۆوە

سەرەڕای ئەوەی دەکرێتەوە

هێشتا (سکاست) لەپشت شیشی زیندانەوەیە

)جۆلس موخ) سۆسیالیزم

بیر لە ژیانی تایبەت دەکاتەوە

بەڵام بیرکردنەکەی کاتی بۆمبە فرمێسک رێژەکان

و تۆپهاوێژەکان دێت

هێشتا زووە درک بەوە بکەیت

مانگرتنەکان کە وا زیاد دەبن

بیر لە شتێک ناکەمەوە

تەنها لەو کۆچبەرانە دەڕوانم کە بەبەرچاومەوە

راکشاون

ئەو پیرەپیاوە رەنگ بزرکاوەی

کە لێفە لچک سوتاوەکەی لەخۆیەوە پێچاوە

دوای چەند مانگێکی دیکە دەگەڕێتەوە لای خەونە کۆنەکەی

پۆستی وەزارەت وەردەگێڕێ

جارێکی دیکە فەڕەنسا جوانەکە دەفرۆشێت

ئەو گەنجە ریش تاشراوەش

کە بەرەو تۆرین سەفەر دەکات

جەنتاکانی لەتەنیشت خۆیەوە

لەسەر زەوی کەشتیەکەیە.

کێ تاج لە جەلاد دەباتەوە

وەک ئەوەی پێش ساڵانێک لەمەوبەر روویدا

ئەو پیاوەی کە مەبەستی ئەسینا بوو

لەگەڵ سەگەکەی دەرکەوت

بۆ ئەوەی تۆزێک هەوا هەڵمژێ

کەچی هەزاران سەردەبڕێ

بەتەواوی سەریان دەبڕێ

بەڵام ئەمە بەسیەتی

هێشتا لەساڵی ١٩٤٦ داین

کەشتیەکە لەنێو شەپۆلەکاندا ڕێگای خۆی دەبرێ

لەسەفەرەکەی بەرەو نیشتمان

شتێک زیاتر نییە. بۆچی بایەخ بەمە دەدەیت

کاتێک لەسەر پشتی کەشتیەکە سێ پیاو بەیەک دەگەن:

یۆنانییەک لەپێچکردنەوەی دواوەی کەشتەیەکەدا

پیاوێک کە ئارەق دەڕژێنێت و دەموچاوێکی بێزراوی هەیە

سیمایەکی سەوز دەکەوێتە سەر کورسیەکە

حاڵەتێک لەمە تەنیاتر نییە لەوشکانی و دەریا کە تۆ:

لە نێو وەحشیەتگەرەکان بێت.

ئەمەیە قەسیدەکەی شاعیر سۆڤیەتی خەباتگێر کونستانتین سیمۆنۆڤ، هەر منداڵێک لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی دەتوانێ

بابەتێکی دارشتن لەسەر گەشتی دەریا بنوسێت، کە زۆر لەو قەسیدەیە باشتر بێت، کە ئێمە بەزوڵم بەقەسیدە ناوی دەبەین، بەڵام تۆ وەک شیوعی دەبێت سەرسام بی پێی و بەتوحفەی بزانی؟

چییە؟ ئایا تۆ سەرسام نیت بەو قەسیدەیە؟ ئەی بەکێ سەرسامی؟ بەقەسیدەی شاعیری رەجعەت و ئیمپریالیزم، ئەلیۆت "وێرانەخاک" سەرسامیت؟ ئەمەیان لەقەسیدەکەی گوزارشتی لەرەشبینی و دڵتەنگی کۆنالیستەکان کردووە، کەچی سیمۆنۆڤ وای دەبینی کە رژێمەکەی ئەوان بەرەو نەمان دەچێت و سۆسیالیزم لەهەموو شوێنێک سەردەکەوێت.

سەرسامیت بە ئەلیۆت مانای ئەوەیە کە کەڵکەڵەی بۆرژوازی لەزهن ماوە، ئەمەیە لۆژیکی هاورێیانی شەرەفمەند. دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئەو قەسیدەیەی کە بەرێکەوت لەدیوانە سورەکەم هەڵبژاردووە، لەقەسیدە خراپەکان نییە، بەڵکو رەنگە لەباشترینیان بێت، ئەگەر بتەوێت قەسیدە خراپەکانت بۆ وەربگێرم، ئەوا دەبێت هەموو دیوانەکە وەربگێرم.

ئێستا بەشێک لەپێشەکیەکەی کتێبەکەت بۆ وەردەگێرم کە لەلایەن سکۆرینۆ نووسراوەو تێیدا هاتووە "سیمۆنۆڤ شاعیرێکی شیوعییە، ئەو درک بەوە دەکات، کە شتێک نییە بەئەدەب ناوببرێت، جگە لەئەدەبی حزبی، ئەو ئەدەبە کە سیمایەک جگە لەحزبیبوون بۆ خۆی هەڵدەگرێت، ئەوا لەناوەخندا بۆرژوازییە، شیعرەکانی وەک پێنووسەکەی کێشاویەتی هەموویان قوڵن، بەڵام ئەوەندەی شیعرەکانی کاریگەرن ئەوەندە تێروانین نین.

شیعری سیمۆنۆڤ پڕیەتی لەبیرکردنەوەی پاڵەوانی ئەو قۆناغە نوێیە، ئەویش پاڵەوانی شیوعی کە خەباتەکەی لەپێناو ئاشتی و ئاسودەیی مرۆڤدایە."

ئایا تۆ لەسەرەتای شۆرشەوە ئەو شتانەت نەخوێندۆتەوە، کە ستایلێکی کرێتیان هەیەو شیوعییەکان بەناوی شیعرەوە لەگۆڤار و رۆژنامەکانیان بڵاوی دەکەنەوە، ئایا ئەوەت نەخوێندۆتەوە، کە شاعیرە مەزنەکەیان عەبدولوەهاب بەیاتی لەگۆڤاری ئادابی بەیروتی بڵاوکردۆتەوە دەڵێ:

خوداوەند لەشارەکەی من جولەکەکان دەیفرۆشن.

خوداوەند لەشارەکەی من دەلاڵە

هەڵپەرست نابم بۆ ئەوەی ئەو دێرە بەکاربهێنم و بڵێم ئەمە بەڵگەیە بۆ بێباوەڕی شیوعییەکان و کافربوونیان، بەیاتی مەبەستی ئەوەنییە و ئەو ئازایەتەشی نییە کوفر بکات، بەڵام چی بکات ئەو پیاوە خاڵییە لەرەوانبێژی و بێتوانایە لەزمانی عەرەبی و شێوازی پتەوی عەرەبی، هەرچەندە بڕوانامەی لیسانسی هەیە لەئەدەبی عەرەبی و لەخانەی باڵای مامۆستایانی وەرگرتووە. ئەو لەقەسیدەکەیدا دەیەوێ هێرش بکاتە سەر ئەو کەسانەی کە بانگەشە بۆئایین دەکەن و وەک هۆکارێک بۆ قازانجی دارایی بەکاریدەهێنن و ئەوان وەک دەلال و ئایین بۆ مەبەستەکانی خۆیان بەکاردەهێنن و خۆیان لەپەنای ئایین دەشارنەوە، بەڵام بەیاتی نەیتوانی گوزارشت لەمەبەستەکەی خۆی بکات، یان لەدوودێری دیکەدا کە دەڵێ:

**محطم الاغلال يهوي ساخرا**

**والقيد يحطمه العبيد بصخرة**

ئايا هەڵبژاردنی سەروایەکی گونجاوت بینیوە لەگەڵ کێشەکە؟ دواتریش وەرە ئەو دوو وێنە نایابە ببینە: تێکشکێنەری کۆتوبەندەکە بەسەر کۆتوبەندەکەی بەرزدەبێتەوە تێکدەشکێنێ. هەڵبەتە (یهوی) فعل موزارعی فیعلی (اهوی)!. جا لەسەر لێوەکانی زەردەخەنەی گاڵتە و رقلێبوونەوە کێشراوە، بەڵام بەندەکان بەهەزارانیان یان بەملیۆنان بەدەستەکانیان بەردێک بەرزدەکەنەوە لەکۆتەکەی دەدەن، تا دەشکێ. ئەمەیە شیعر یا نا.

پیرۆزە لەشیوعییەکان، لەشاعیر و ئەدیبەکانیان، پیرۆزیان بێت جولەکە فەیلەسوفەکانیان و بەرتیلخۆرەکانیان کە وەک سیخوڕ لەتەحقیقاتی جینائی کاریان دەکرد بەمووچەیەک کە نەدەگەیشتە ٦ دینار.

تێبینی: کاتێک دووبارە دیوانی (ابارق مهشمه)ی بەیاتیم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت کە نیوەدێڕێکی دیکەم لەسەر یەکێکی دیکە داناوە کە ویستومە لەسەرەوە نموونەی پێ بهێنمەوە. خۆی وەهایە:

**محطم الاغلال يهوي ساخرا**

**عبر الزمان علي الجذوع ببلطة**

شاراوە نییە کە ئەو جوانترە، بەتایبەتی کە تەور پتر لەبەرد شۆرشگێڕترە، بەدرێژایی رۆژگاریش ئەم وێنەیەی ژیان بووە: بەڵێ شیعر دەبێت ئاوا بێت.! چیلکەش لەچاوی حەسود بێ.

وتەی –منجل–ی برا، کە تێیدا باسی هاوڕێی تێکۆشەر ئەبوسەعیدی کردبوو، کە پێشتر ئەندامی حزبی شەعب بوو، دواتر، دوای لەسێدارەدانی فەهدیش بووە یەکێک لەجەمسەرەکانی حزبەکەی فەهد. ئەوەی یادگارییەکانی منی وروژاند، کە لەدەروونم دایە، کە پێشتر بە رەوەکۆترم دەزانی، کە ئێستا بەکۆمەڵە جرجێکی دەزانم. یادگارییەکی بیرخستمەوە، کە لەزیندانی کەرخ روویدا. بێگومان دەهاتمە سەر باسکردنی، بەتایبەتی لەو قسانەمدا، چونکە کات و مێژووی ئێستا هی ئەوەیە، ئەو رووداوەش دڵم پڕدەکات لەبیرەوەری تاڵ، سەیری دەوروبەرم دەکەم، دەبینم کە هەلپەرستەکانی حزبی شەعب وەک ئەوەی ناومان دەبردن، جەمسەرەکانی و ئەبو سەعید ئێستا سەرکردایەتی حزبی فەهد دەکەن، کەچی تا دوا ساتی ژیانی بێڕەحمانە دژایەتیان دەکرد.

باسی ئەو ماوەیەم بۆ کردی، کە وەک بانگخوازێک بۆ شیوعیەت نەوەک مامۆستای ئینگلیزی لەدواناوەندی رومادی بەسەرم برد، ئەمرۆش ئەو قسەیەم تەواو دەکەم و دەڵێم رژێمی پێشوو لەوە دەترسا، کە کەسێکی ئاسایش شلۆق بکات، ئەو کاتە بوو کە یادی راپەرینی ٢٧/کانوونی دووەم، قوتابیانیش لەشەڕی ئەو دەسەڵاتە دواکەوتووە دەترسان نەهێڵێت خۆپیشاندان و مانگرتنەکانیان ئەنجام بدەن، کاتێک یادەکە دێت، بەڵام کاتێک پشووی نیوەی ساڵ هات، یادەکە بەر پشووەکە کەوت و قوتابیانیش پەرتەوازە ببوون.

بڕیارم دا لەو پشووە بگەڕێمەوە شارۆچکەکەم لەبەسرا، هەرواش بوو، لەوێستگەی شەمەندەفەر کاتێک بەلای خەڵکەوە تێپەڕدەبووم، چرپەی ئەوەم دەبیست، کە وەزارەتی مەعاریف وەک مامۆستایەک منی فەسڵکردووە، لەو بڕوایە دابووم، کە ئەو قسانە تەنها پێشبینین و ئەگەر بەڕاستی وەها بووایە بڕیاری فەسڵەکەم پێدەگەیشت.

یەکەم هەواڵ کە لەگەڵ گەیشتنم بۆ گوندەکەم لەئەبوخەسیب پێمگەیشت ئەوەبوو، کە پۆلیس هاتۆتە ماڵی باوکم و بەدوامدا گەڕاوە، باوکم ئامۆژگاری کردم، کە ئاگاداری خۆم بم، چونکە پۆلیسەکان جارێکی دیکە بەدوامدا دێنەوە، بەتایبەتی کاتێک هەواڵی هاتنەوەی منیان بۆ ماڵ بیستوە، رۆژی دواتر کە باران بوو، تازە گەڕابوومەوە ماڵ پێیە خواسەکانم بەقوڕ بوون، من خەریک بووم پێم دەشوشت، کاتێک پۆلیس لەدەرگای ماڵەوەیان دا، بەوشێوەیە بوومە دەستگیرکراوی پۆلیس.

دوای ئەوە رۆژێکم لەزیندانەکانی بەسرادا بەسەربرد، رەوانەی بەغدا کرام و لەگرتووخانەی کەرخ راگیرام، ئەو گرتوخانەیە پڕبوو لەهاوڕێیان و ئەندامی حزبی شەعب و ئەندامانی پارتی کوردی. سەرەڕای ئەوەی کە نزیکەی سێ مانگ لەوێ مامەوە، بەڵام رووداوێکی ئەوتۆ بەسەرمدا تێنەپەڕی، کەمێک نەبێ.

رۆژێکیان بینیم هاوڕێیانی دەستگیرکراو، کز و ماتن، گۆرانی و سرودەکانیان بێدەنگ بوو، لەنوکتە و گەپەکانیان وەستان، کاتێک لەنهێنی ئەوەم پرسی. پێیان راگەیاندم کە هاوڕێیانی نەمر فەهد و حسێن شەبیبی و زەکی بەسیم سبەی بەیانی لەسێدارە دەدرێن،

باسی هاوڕێ جولەکەکە یەهودا سدیقیان نەکرد، کە ئەویشیان لەگەڵ بوو، باسنەکردنی لەبەر ئەوەبوو گوایە خیانەتی کردووە.

خۆم گوشی بۆ ئەوەی دڵۆپێک فرمێسک لەچاوانم بێتە خوارەوە، بەڵام پارچەیەک لەدڵۆپە فرمێسک بۆ ئەو سێ هاوڕێیە مەزنە نەهاتە خوارەوە. لەوکاتەدا ئەلیازەی ڤیرجلم بیرهاتەوە، کاتێک باس لەئەنیس و هاوڕێکانی دەکات، دەعبایەکی دەریا، هەندێک لەهاوڕێیانی دەڕفێنێ، دوای ئەوەی ئەنیس و هاوڕێکانی دەگەنە کەنار و دەخۆن و دەخۆنەوە و ماندوویان دەحەسێننەوە، هاوڕێیانیان بیر دەکەوێتەوە، بۆ هاوڕێیانی مردوویان بیردەکەوێتەوە دەگرین. ئەمەیە راستگۆیی لەشیعر، ئینسان ناتوانێت بگریت ئەگەر خۆی لەمەینەتی دابێ، کاتێک خۆی و ژیانی و بوونی لەژێر هەڕەشەدا بێت، گریان جۆرێکە لەجۆرەکانی سەرگەرمی، کە کەسی مەینەتبار ناتوانێ ئەنجامی بدات، من لەزینداندا لەمەینەت دابووم، بۆیە نەمتوانی بۆ هاوڕێیانی نەمر بگریم لەگەڵ ئەوەشدا قەتیسبوونی فرمێسک لەناخمدا تەنها ئەوە نەبوو کە من ناتوانم بەسەرگەرمی گریان ئەنجام بدەم، بەڵکو هۆکارێکیش ئەو ئومێدە بوو کە لەقوڵایی ناخمەوە هەبوو، کە گوایە جەماوەری زەحمەتکێش و تورە رێگە نادات سەرکردەکانی لەزیندان بێت و ئەوان ئەمشەو تا بەیانی هێرش دەکەنە سەر زیندان فەهد و هاوڕێکانی لەپەتی سێدارە رزگار دەکەن.

حزبی شیوعی بەوشێوەیە ئێمەی فێرکردبوو، کە هەتا دوایین سات باوەڕمان بەجەماوەر بێت، بەڵام بەداخەوە خۆی وەک پێویست باوەڕی بەجەماوەر نەبوو. ئەو باسی گەل و خەباتەکەی دەکات و

کەچی چاوی لەسنوورەکانە بۆ ئەوەی سوارچاکەکانی سوپای سوور دەرکەوێت بۆ رزگارکردنی عێراق و دانانی سکرتێری حزبی شیوعی وەک سەرۆک کۆمار و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیش وەک وەزیر.

دوای ئەوەی فریادرەسی گەورە لیوا عەبدولکەریم قاسم ئەو زللە نایابەی لەرووی ئاژاوەگێران دا، دوای ئەوەش کە جەماوەر پەرتەی لەحزب کرد- کە گەورەترین جەماوەر بوو- لەدوای ئەمەش رۆڵەکانی شیوعی نموونەی گەنجانی دیموکراسیخواز و رابیتەی داکۆکیکردنی لەئافرەتان لەحزب کشانەوە، دوای هەموو ئەمانە ئەندامانی حزبی شیوعی هێشتا باوەڕیان بەزیندووبوونەوەی سەرفرازی شیوعی هەیە.

برای خێزانەکەم کە پاڵەوانی دوای چواردەی تەممووزەو هاوڕێیەکی خەباتگێڕە لەڕۆژگاری مەینەتی شیوعییەکاندا هەڕەشەی لێکردین و گوتی "چاوەڕێ بکەن..چاوەڕێ بکەن. دوای پێنج رۆژ تەنها، شەقامەکان پڕ دەبێ لەلاشەی قەومییەکان. دیارە خەونی بەپلانە داڕێژراو و ناسراوەکەی شیوعی دەبینی کە پلانی کوشتن و سوتاندن و راکێشی لاشەی مردووانە.

لەکپ و ماتەمی گرتووخانەکەدا، دەنگ و سەدای گۆرانی و چەپڵە و سەما بەرزبۆوە. هەواڵ چییە؟ ئایا گەلی عێراق دەرگاکانی زیندانە گەورەکەیان شکاند؟ یان هێزەکانی ئاشتی لەجیهان بەسەر سەربازگەی ئیمپریالیزمدا سەرکەوتن؟ نەخێر. ئەوە کەسانی سەر بەحزبی شەعبن کە لەژوورەکەی تەنیشتمانەوەن، ئاهەنگ بەبۆنەی

لەسێدارەدانی فەهد دەگێڕن، کە دوژمنی سەرسەختیان بووە، کە ئەمەش قێزەونی ئەوانە لەدوایین قێزەونەکانیان.

خوا بارودۆخەکان دەگۆڕێ. سەرکردایەتی حزبی شەعب هەلپەرست و سیخوڕ و بەکرێگیراون، وەک ئەوەی ئێمەی شیوعی ئەوکات ناومان دەبردن. ئێستا سەکردایەتی حزبەکەی هاوڕێی نەمر فەهد دەکەن، کە ئێستاش حزبی شیوعی شانازی پێوەدەکات و وێنەگەورەکراوەکەی لەئیدارەی رۆژنامەی ئیتحادی شەعب هەڵوسراوە، هەروەها لەکۆبۆنی وەرگرتنی کۆمەک و موچە وێنەکەی فەهد چاپکراوە.

یەکێک لەو رووداوانەی کە بەلای منەوە ئێستا گرنگە، ئەو موحازەرانە بوو، کە لەزیندان لەلایەن مامۆستا (جیم) و ئەبو ئیبراهیم پێشکەشمان دەکرا، ئەو کات مامۆستا جیم ئەندامی حزبی شەعب بوو، بەڵام لەکەسە باشەکانی ئەوان بوو.

چەندین کتێب لەبارەی چەپەوە لەلایەن مامۆستا(ج) هەبوو، وەک بیرم بێ یەکێکیان پەروەردەکەی سەلامە موسا بوو، ئەو چەند بەشێکی لەو کتێبانە بۆ دەخوێندینەوەو سەرنجی خۆی لەبارەیانەوە دەدا، سەرنجەکانی پڕبوون لەناهەقی دەرهەق بەقورئانی پیرۆز و ئایینی چاکە و پێغەمبەری مەزن و عەرەب و مێژووەکەی. ئەبو ئیراهیمیش لەمێژووی عەرەبدا تەنها حەجاجی دەناسی. لەپاڵ ئەو نکۆڵیکردنە لەقەومیەت. کەچی دەمانبینی ئەندامی پارتی شانازیان بەقەومیەتی خۆیان دەکردو باوەڕیان پێ هەبوو و دەستیان پێوەگرتبوو.

شیوعیەکان کاتی خۆی پاساویان بۆ رقلێبوونەوە لەقەومیەتی عەرەبی هەبوو، کاتێک خائینێکی وەک نوری سەعید سەرزار وبن زاری قەومیەت بوو، ماڵی هاشمیەکانیش بنەمایەکی سەرەکی قەومیەت بوون، بەڵام ئێستا قەومیەتی عەرەبی سەلماندی کە تاکە هێز دژایەتی زایۆنیزم و ئیمپرالیزمی پێدەکرێت و سەریش دەکەوێ، ئەمەش دوای ئەوە بوو دوو دەوڵەتی لەچوار دەوڵەتە زلهێزەکە هێنایە سەرچۆک و ئیسرائیلیشی بەدواوە هات، لەکاتێکدا زەمبی ئەو نەتەوە نەمرە تەنها هوتافی "الله اکبر، الله اکبر" بوو، لەو کاتەدا چ پاساوێک بۆ شیوعیەکانی شعوبییەت دەمێنێتەوە، کە نۆکەری جولەکە بن و بەکرێگیراوی قەیسەرە نوێیەکان بن، کە دوژمنایەتی خۆیان بۆ ئێمە دەرخست. پێشتریش بۆ ریابازی و هەلپەرستی بۆ بەرژەوەندی و بەدرۆ سەگوەڕیان کرد، دواتر هەقیقەتی ئەوان ئاشکرا بوو، کە دژومنی قەومی عەرەبن زیاتر لەجولەکە

دوێنێ بەشەقامی ئەبونەواسدا دەڕۆیشم، رێکەوتی دوو هاوڕێی زۆر بەشەرەف بووم، ئەوان منیان ناسییەوە، یەکیان قسەی لەگەڵ ئەویتریان دەکرد، بەدەنگێکی بەرز تا من گوێبیستی بم، دەیگوت: بۆتە قەومی، نەفرەت لەخۆت و باوکی قەومیەتت بێ. ئای کە قێزەوەنە، جنێو بەنەتەوەکەی بدا، دژایەتی بکات، تەنها لەبەر ئەوەی بەڵێنی پێدراوە چەند سەد فلسێک لەداهاتی رۆژانەی زیاتر دەبێ، ئەمە مرۆڤێکی چەپەڵەو بەندەیەکی بەکرێگیراوە، شایەنی ئەوە نییە لەسەر خاکی نیشتمانەکەی بژی، کە ناپاکی لەگەڵ ئەو خاکە دەکات، لەپێناو پارووێک زیاتر لەوەی کە دەخورێ، گەزێک قوماش زیاتر لەوەی کە

دەپۆشرێت و لەپێناو پێکێک عەرەق یان بیرە زیاتر لەوەی کە دەخورێتەوە.

خۆزگە ئەو بەڵێنە شیرینانە بەجێ دەهات، کە شوعییەکان دەیدەن و هاوشێوەی کۆترە ئاشتییە کانزاییەکان بەسنگی خۆیانەوە هەڵواسیوە. هەر بەو بۆنەوە، ماوەیەک بوو شیوعییەکان خۆشەویستی زەعیم و دڵسۆزییان بۆ کۆمار بۆخۆیان قورخ کردبوو، ئەو رۆژگار یەکێکیان بۆینباخێکی دەبەست وێنەی زەعیمی تێدابوو، لەلای راستی چاکەتەکەشی چوارچێوەیەکی کانزایی دەبەست، کە وێنەی زەعیمی لەسەر بوو، لەلای چەپیشەوە قوماشێک کە هەر ئەویش وێنەی زەعیمی بەسەرەوە بوو، ئەی بۆ ئێستا هیچ وێنەیەک لەوێنەکانی زەعیم بەسەر سنگیانەوە نییە؟ بۆچی؟ لەبەر ئەوە بوو، چونکە ئەو بۆ گەل و جیهانی دووپاتکردەوە، کە تەنها باوەڕی گەلە مەزنەکەی هەیە، ئەو دوژمنی ئاژاوەگێڕەکانە و سەری ئاژاوەگێڕەکانی پاندەکاتەوە؟

دوای ئەوەی بڕیاری فەسڵکردنم لەپیشەی مامۆستایی بۆ دەرچوو، منیش لەگرتووخانە دەرچووم و گەڕامەوە گوندەکەم لەئەبوخەسیب. ئەو تێکشکانە گەورەیەی کە حزبی شیوعی بە لەسێدارەدانی سەرکردە گەورەکانی بەخۆیەوە بینی بوو، لەگەڵ ئەو گورزە جەرگبڕەی کە مالک سەیف لەحزبی دابوو، سێبەری ئەو دوو شکستە بۆ سەر گوندەکەشم کشابوو، عەبدولمەجیدی مامم دەستگیرکرابوو، ئەو کە موعتەمەدی ئەبوخەسیب بوو، بڕیاری زیندانی پێنج ساڵی بۆ درابوو، هێندەی نەبرد کاتی دادگایی کردنم هات لەمەجلیسی عورفی لەبەغدا، بەکەفالەی ٥ هەزار دینار ئازاد کرام، کەفیلەکەشم باوکم بوو، کە هەموو زەوییەکەی هەیبوو، بەهاکەی نەدەگەیشتە ئەو ٥ هەزار دینارە.

کاتێک گەڕامەوە گوند، بینیم مستەفای برابچووکم لەبری مامە بەندکراوەکەم بەرپرسیارێتی حزبی لەئەستۆ گرتووە، ئەو لەچواری دواناوەندی بوو، نەدەهاتە گوند تەنها هەفتەی جارێک نەبێت، بڵاوکراوە و بەیاننامەی حزب و کتێبە مارکسیەکانی بۆ دەهێناین.

هەر بۆ ئەمەش من ڕێکخەری راستەقینەی جووتیارە حزبییەکان بووم، ئەرکیشمان ئەوە بوو لەو ماوە دژوارەدا لەمێژووی حزبە زیندووەکەماندا ئەندام و لایەنگرانی بپارێزین و نەهێڵین لەبەر هۆکاری ترس و نائومێدیی لەچەنگە سوورەکەمان دەربازیان بێت. منیش وام لێهاتبوو لە بەڵێندان بەخشندەبووم، تەنانەت بەهاوکاری چەند ئەفەندییەکی حزب نەخشەیەکمان بۆ بێستانەکانی گوند کێشابوو و بێستانەکانمان لەسەر نەخشەکە بەسەر جووتیارەکان دابەشکردبوو، بۆ نموونە ئەو بێستانەی کە بە(خریبە) ناودەبرا و هی محەمەد سەعید عەبد بوو، دابوومان بەئەندامێکی حزب کە حەمەد

بوو، که لەهەمان بێستان کاری دەکرد، بۆ هەرشوێنێک دەچووین ئەو نەخشە زیندووەمان لەگەڵ خۆمان دەبرد، بەجووتیارەکانمان نیشان دەدا بۆ ئەوەی باوەڕی ئەوەیان بۆ زیادبکەین، که ئێمە راستگۆین لەبەجێگەیاندنی بەڵێنی دابەشکردنی زەوی بەسەریاندا. بینینی نەخشەکەش بەلای ئەوانەوە بەسبوو بۆ ئەوەی بەڕاستگۆ لەئێمە بگەن، ئەوان مرۆی عەقڵ سادە و خۆیشیان سادەن، باوەڕ بەپیتی نووسراو دەکەن وەک ئەوەی که باوەڕی بەقورئانی نێردراو بکەن، بۆیە خوێنەری خۆشەویست نموونەیەکت لەسەر ئەو بابەتە بۆ دەهێنمەوە:

لەساڵی ١٩٤٦ لەسودان گۆڤارێکی شیوعیەت دەردەچوو بەناوی (ام درمان) رێکخەری حزبمان ئەحمەد علوان تەمیمی چەند دانەیەکی ئەو گۆڤارەی بۆ دەهێناین، جارێکیان ژمارەیەکی ئەو گۆڤارەی بۆ هێناین، که وێنەی بەرگەکەی دوو دەستی رەش بوو -هەڵبەتە دەستی سودانی بوو- ئەو دەستە زنجیرەکانی شکاندبوو، حەمەد ئەو گۆڤارەو وێنەکەی بەرگی بینیبوو، سەرنجێکی لەسەر وەرگرتبوو، بەڵام ئەو سەرنجەی لەناخی خۆی حەشار دابوو، تا لەدانیشتنێکی مەی خواردنەوە بەسەرخۆشی نەیدرکاند، نەمانزانی ئەو سەرنجە چییە، حەمەد ئەو شەوە هەرچی هەبوو ئاشکرای کردو گوتی: ئایا من لەخێر و شەڕدا لەگەڵتان شیوعی نەبووم؟ ئایا هەموو عەرزوحاڵەکانم بۆ ئیمزا نەکردوون؟ ئەی بۆ ئیمزای من لەگۆڤارەکە بڵاوناکەنەوە، ئیمزای سەید دەرویش بڵاودەکەنەوە؟ ئەو سەید دەروێشەی که حەمەد باسی دەکرد پیاوێکی رەش پێست بوو، یەکێک بوو لەکرێکارانی گوند، که توانیبوومان بیهێنینە ریزەکانی خۆمان.

حەمەد وا تێگەیشتبوو که دوو دەستە رەشەکە که بەقەبارەی سروشتی خۆی لەسەر بەرگی گۆڤارەکە کێشرابوو دەست یان پەنجەمۆری سەید دەروێشە، ئەو نازانێ که پەنجەمۆر تەنها بەپەنجە

دەکرێت و نەوەک بە هەموو دەست ئیمزا بکرێت وەک ئەو ناوی نابوو.

 راستی ئەوەیە کە لەدابی شیوعییەکان ئەوەیە کە کاتێک روو لەلێژی دەکەن، لەپێدانی بەڵێن بەخشندەتر دەبن و لەگەڵ نەیارەکانیشیان توندتر دەبن.

ئەی ئەو توندوتیژیە قێزەونەت نەبینی لەکوشتن و سوتاندن و تاڵان کە ئەنجامیان دا، لەکاتێکدا نەتەوایەتی عەرەبی دەژیایەوەو سەری بەرزدەکردەوە، رەوتە سوورەکەی شیوعیەت ئەو کاتە، ئەوان کە مارکسین درکیان بەوە نەکردووە، کەچی لەفەلسەفەی ماددی دیالیکتیکی ئەوان هاتووە، کە دەڵێ هەندێک شت بەچەسپاوی دەرکەوێ، کەچی لەڕاستیدا بەرەونەمان دەچێت، بۆیەش سەرفرازیە سوورەکەی ئەوان، کە بەچەسپاوی دەردەکەوێت، بەڵام لەڕاستیدا بەرەو نەمان دەچێت، کەسی سەرکەوتوو باوەڕی بەخۆی هەیەو لێبوردەو بەڕەحمە، بەڵام کەسێک کە باری لێژبووە، دەبێتە دڕندەیەکی ترسناک هێرش بۆ نەیارەکانی دەبات و روحیان دەکێشێ و هەموو جۆرەکانی تاوان ئەنجام دەدات. ئەو تاوانەی کە نازییەکان لەسەرەولێژبوونیان ئەنجامیان دا، زۆر و زەوەند و فراوانتر بوو لەو تاوانەی کە لەو کاتە ئەنجامیان دەدا، کە ئاڵای سەرکەوتنیان بەسەردا دەشەکایەوە.

رۆژێکیان براکەم کە موعتەمەدی شیوعی بوو، هەواڵی ئەوەی پێدام، کە ئەو ئێوارەیە لەناوەندی قەزای ئەبوخەسیب دەچێتە گەراج، بۆ ئەوەی هاوڕێیەک بهێنێت، کە لەبەسراوە هاتووە، حزب دەیەوێت ئەو هاوڕێیە گرنگە بنێرێتە ئێران بۆ ئەوەی چاپخانەیەک بکڕێت، لەبێستاندا شوێنێکی خەوتنمان بۆ ئەو میوانە دانا، تا تاریک داهات و سەعاتێک یان دووان بینمان هات، کە جانتایەکی بەدەستەوە بوو.

بەیانی رۆژی دواتر من بەتایبەت چوومە لای ئەو هاوڕێیە مەزنەو هەندێک قسەمان لەگەڵ یەکتر کرد، بەهۆی ئەو قسانەی لەدەمیەوە دەردەچوو، زانیم کە ناوی حسێن عەلییەو خەڵکی نەجەفەو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقییە، ٧٠٠ دیناری پێیە، ئەو پارەیەش زۆر زۆرە لەکاتێکدا کە جوڵانەوەی شیوعیەت لەداڕوخاندایە، ئەو هاوڕێیە هەندێک ناونیشان و نامە و بەیاننامەی حزبیشی پێبوو.

پێم راگەیاند کە ئێمە هەموو هەوڵێک دەدەین بۆ ئەوەی بەسەلامەتی بیگەینینە ئێران، بەڵام دەبێت پیاو حسێب بۆ هەموو پێشهاتەکان بکات، لەوانەیە بگیرێت، لەبەر ئەوە باشترە ئەگەر ئەدرەسی کەسانی عێراقی لەلایە، ناوەکان بشارێتەوە، لەهەر شوێنێک کە دەیەوێت لەو بێستانە فراوانە، کاتێک گەڕایەوە با بۆخۆی بباتەوە، ئەگەریش متمانەی بەمن هەیە من ئامادەم شتەکانی بۆ بپارێزم دواتر بەدەستی خۆی دەیدەمەوە، بەڵام بەدرۆ نکوڵی لەوەکرد کە هیچ ئەدرەسێکی لابێت. سێ رێگاشم پێگوت بۆ شاردنەوەی نامەی حزب ئەگەر بچووک بێت، یەکەمیان قوفڵی جانتایە کە لەناوی دادەنێیت، دوای ئەوەی ناوەکەی بەتاڵ دەکەی، یان لەپەمپی قەڵەم پاندانی دەپێچی. نکوڵیشی لەوەکرد کە لەحەوت سەد دیناری زیاتر لا بێت. ئێمەش ئامۆژگاریمان کرد کە ئەگەر پۆلیس هاتە سەر رێگای لەسەد فلس زیاتر بەرتیل نەدا زۆرترینیش روبعە دینارێکە، ئەویش پێکەنی و گوتی بێگومان ئەمە پارەی گەلە، من چۆن ژیانی خۆم دەپارێزم دەبێت ئەو پارەیەش بەهەمان شێوە بپارێزم.

سەرتاشی گوندەکەمان بەڕەگەز ئێرانییەو ئەندامی حزبی شیوعی عێراقی بوو، رازیمان کرد ئەو هاوڕێ مەزنەمان بباتە ئێران، هاوڕێ و سەرتاشەکە رۆیشتن، ئێمە رۆژێک بەتەواوی چاوەڕوانمان کرد،

ڕۆژی دواتر گوێمان لەوە بوو کە پۆلیس هاوڕێ حوسێن و سەرتاشەکەی دەستگیر کردووە.

پۆلیسی سنوور ئەو بەلەمەی وەستاند بوو کە هاوڕێیەکەمانی هەڵگرتبوو، سەرنشینەکانیان دابەزاندبووە وشکانی، هاوڕێ پاڵەوانەکەمان ڕووخساری زەردببوو، ترسی بەسەر نیشتبوو، لەرزی بوو. جا دەستی درێژ دەکات پارەیەکی کاغەز کە دە دینار بووە دەداتە پۆلیسەکە، پۆلیسیش گومانی لێدەکات، بەڵام وەک شیوعییەک نا، کە بە کاری ترسناک هەڵسابێت، وەک جولەکە گومانی لێدەکات کە بەقاچاخ عێراق بەجێبهێڵێت، ئەو پارەیەی کە پۆلیس پێشبینی دەکات ١٠٠ فلسە، من چەندین جار تاقیمکردۆتەوە، یان ڕوبعە دینارێکە لەچاکترین حاڵەتدا، بەڵام کە دە دیناری داوە، ئەمە شتێکی لەدواوەیە، بۆیە پۆلیسەکە دەیەوێت هەلەکە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی بەرتیلی زیاتر وەربگرێت، پێی دەڵێ ئەوەی قبوڵ نییەو دەبێت بیپشکنێ، حوسێنیش لەنامەکانی حزب و ئەدرێسەکان دەترسێ، ئەوانە و چەندین بڵاوکراوەی دیکەی حزبی شیوعی دەردەهێنێت و دەیخاتە ناو ئاوەکە، لێرەوە هەڵوێستەکە دەگۆڕێ، پۆلیسەکە بەدوای کاغەزەکانەوە دەچێتە ناو ئاو و شتەکان دەخوێنێتەوە، ئینجا دەزانێ ئەو لەبەردەم شیوعیەکی عێراقییە، بۆیە پارە قبوڵ ناکات و دەڵێ ڕێگا بەحوسێن نادەم بڕوات، ئەگەر ١٠٠ دیناریشی بدەنێ.

حسێن و کابرای سەرتاش برانە شوعبەی خاسەو دواتریش بۆ تەحقیقاتی جینائی، حوسێن وەک عادەتی ئیعترافی کردبوو، شوێنی خۆحەشاردانی سکرتێری ئەوکاتەی کەشف کردبوو، کە حەمید عوسمان بوو، ناوی براکەی منیشی دابوو، کە گوایە لەڕۆیشتنی بۆ ئێران هاوکاری کردووە. بەمەش لاپەڕەیەکی دیکە لەلاپەڕەکانی قارەمانێتی شیوعیەت لەعێراق ئاشکرادەبێت.

دوای ئەو پاڵەوانێتیە شیوعیانە ناسراوەی کە هاوڕێ حوسێن عەلی نەجەفی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی نواندی، حوکمی زیندانیکردن بۆ براکەم دەرچوو، کە بەرپرسی حزب بوو لەئەبو خەسیب، جا هاوڕێ لەتیفینۆف هاتە مەیدانەکە، چونکە لەو زیاتر کەسێکی دیکە نەبوو، من بەکەفالەتەوە بەسترابوومەوە، مام و براکەشم لەزیندان بوون، لەهەمانکاتدا هاوڕێیەکی دیکەیش لەو هاوڕێیانەی کە تاوانبار بوون، پەنای بردبووە بەرفیرار بوون.

راستیەکەی من هەستم بەخەمێکی قوڵکردو لەدەروونەوە شیوەنم بۆ خۆم و گوند و رۆڵەکانی، تەنانەت بۆ حزبی شیوعیش دەکرد، کاتێک لەتیفینۆف لەئەبوخەسیب بووە موعتەمەدی حزبی شیوعی عێراقی، بۆیە بەبەرخۆمەوە ئەو بەیتەم دەگوتەوە:

لقد هزلت حتي بدا من هازالها

كلاها، وحتي استامها كل مفلس

دواتر ئەو هەواڵە نهێنیانەی حزب لەتیفینۆف دەیزانی بڵاودەبووەوە بۆ هەر کەسێک کە خوازیاری بووایە، یان ئەو هەواڵانەی نەویستایە، ئەویش لەڕێگای کوڕەکەی لەتیفینۆف بوو، کە تەمەنی حەوت ساڵان بوو، یان لەڕێگای هاوسەرەکەی لەتیفینۆف بوو.

هێنده لەگوند نەمامەوە، ماوەیەکی کورت نەبێ، زوو کارێکم دۆزیەوە لەکۆمپانیای نەوتی بەسرا، بۆیە گواستمەوە شار، هەر زووش حزب شوێنە نوێیەکەمی زانی و راوی کردم، رۆژێکیان لەکاتی کارکردن چوومە یەکێک لەعەمبارەکانی کۆمپانیا، یەکێک لەنووسەرەکان رایگرتم و دەستی دەلەرزی و دەموچاوی زەردهەڵگەرابوو، دەستی هێنا ژمارەیەکی القاعده و چەند بڵاوکراوەیەکی دیکەی پێدام، منیش کاتێک بینیم کە ئەو زۆر دەترسێ، ئامۆژگاریم کرد کە چۆن بڵاوکراوەکانی حزب بەسەلامەتی بەمن دەدات، ئامۆژگاریەکەش ئەوەبوو کە بڵاوکراوەکە لەناو پاکەتێکی بەتاڵی جگەرە دابنێت و ئینجا پێم بدات، ئەگەر لەبەر چاوی خەڵکیشەوە بێت. بەڵام ئەو هێندە ترس بەسەریەوە زاڵ ببوو، دەشڵەژا و تێکدەچوو ئەگەر پاکەتێکی راستەقینەشی پێبدام. کە هیچ گومانێک ناوروژێنێ.

بیرم دێ جارێک کە ئەو بڵاوکراوەی دەدامێ لەناو پاکێت دابوو، پاکەتی لۆکسی، بەمن دەڵێ ئەمە جگەرەیەکی تورکی نایابە، ١٥مانگ دەرچووەو ژمارەی تایبەتە. ئایا بونەوەری لەو ترسنوکتر و دەبەنگترت بینیوە؟ کەچی وام بیستوە، کە ئەو بۆتە پاڵەوانێک لەپاڵەوانە ئازاکانی دوای ١٤ی تەمموز، ئەو لەکردەوەکانی راکێشانی لاشەکان و دوژمنایەتەیەکانی بەسرا کە شیوعیەکان پێی هەڵسابوون بەشداری کردووە.

براکەم لەدوای ١٤ی تەممۆزەوە زۆر ترسنوکمان لێ بوو بەپاڵەوان، زۆر سیخوڕمان لێ بوو بەخەباتگێر، بەرتیلخۆرمان لێبوو بەهاوڕێی شەرەفمەند، هەلپەرستمان لێبوو بەسەکردەی حزبی فەهد.

هاوڕێ سەلام عادل ئەو بەرپرسی لیژنەی محەلی بوو لەبەسرا، ئەوکات بۆ خزمەتکردنی سەلام یەکێک لەهاوڕێیە پڕوپووچەکان دانرابوو، کە دوای ١٤ی تەمموز بەقودرەتی قادر بووە یەکێک لەو

پاڵەوانانەی کە بەهەموو عێراق دەخولێتەوە بەناوی نوێنەرایەتی شیوعی. سەلام ئەو هاورێیەی ناردبووە لای شیوعیە کرێکارەکان لەکۆمپانیای نەوتی بەسرا، بۆئەوەی پێیان رابگەیەنێ کە حزب دەیەوێ ئەوان مانگرتنێک ئەنجام بدەن، بەهەر هۆکارێک بێت، ئەگەر دروستکراویش بێت.

بۆیە شیوعیەکان چەند هۆکارێکی بێ مانایان دروست کردبوو دەستیان کرد بەمانگرتن، کرێکارەکانی دیکەیش بەدوای ئەوانەوە بوون، ئێمە وادەزانین کە ئاژاوەگێڕی شیوعیەکان وەک شتێکی نوێ بۆمان دەردەکەوێ، ئەویش دوای ئەوەی کارە ترسناکەکانیان لەسەرتاسەری عێراق ئەنجام دا، لەخەبەردانی درۆ لەهاوڵاتیان بێ گوناە کە لەگەڵ حزب ناڕۆن، لەڕووداوی دەستدرێژیکردنە سەر هاوڵاتیانی باوەڕدار بەنەتەوە و ئایینەکەیان، راکێشانی لاشەیان و سوتاندنی ماڵەکانە و کوشتنی منداڵ و ژنەکانیان و خاوە وەرگرتن لەبازرگان و خاوەن هوتێلەکان و کۆکردنەوەی کۆمەکەی بەهێز بۆ حزبی مەزن، هەموو ئەوانە دوایین شت ئەوەی لەمۆتەکەی سوری ترسناک، کە ژیانی عێراقییەکانی ژەهراوی کردو شایی لێکردن بە شین.

بەڵام براکەم ئەو سیفەتە لەسیفەتی شیوعییەکانە هەر لەسەرەتاوە هەیانبووە، بەڵام ئەو کپکردن و نکۆڵیکردنەی کە رووبەڕوویان بۆتەوە وایکردووە کە ئەو سیفەتانە لەناخیان دیارنەبێت.

بەیانیەکیان کە ئێمەی نووسەرانی کۆمپانیای نەوتی بەسرە بەرەو دەوام دەڕۆیشتین، لەڕێگاوە ئاپوورەی کرێکار و خەڵکی دیکەو ئۆتۆمبێل و پۆلیسمان بینی، پرسیارمان لەبارەی مەسەلەکە کرد، زانیمان کە کرێکارانی مانگرتوو، بەوە نیگەرانن کە نووسەران بەشدارییان لەخۆپیشاندان نەکردووە، بۆیە رووبەڕووی یەکێک لەو

ئۆتۆمبێلانە دەبنەوە، کە نووسەرێکی هەڵگرتووە، ئۆتۆمبێلەکە وەردەگێڕن و بەلێدان و شەقیش نووسەرەکە بریندار دەکەن، ئێمە وامان زانی کە حیکمەت لەوەدایە بەسەلامەتی بگەڕێینەوە ماڵەوە و بەناچاری بەشدار لەو مانگرتنە بکەین، بەمشێوەیە مانگرتنی نووسەرانی کۆمپانیا دەستی پێکرد، بەخواستی خۆیان نەبوو، بەڵکو خۆ دوورگرتن بوو لەبەڵای هاوڕێیان.

بڕیاری ئەوەمان پێگەیشت کە نووسەران لەسەریانە لەفلانە کاتژمێر لەباخچەی (ام البروم) کۆببنەوە، نازانم بڕیارەکە لەکوێوە دەرچووبوو. ئێمە کۆبووینەوە، لەکەشی کۆبوونەوەکە کە چەندین سەرکردەی کرێکاران تێیدا ئامادەبوون، بۆم دەرکەوت حزبی شیوعی خوازیارە ئەو مانگرتنە بکرێت، بۆیە سۆزی شیوعیەتم پاڵی پێوەنام کە قسە لەگەڵ نووسەران بکەم و بۆ مانگرتن هانیان بدەم، ئەوانیش پێشوازییان لەبانگەوازەکەم کردو بڕیاریان دا بەیانی مانگرتن ئەنجام بدەن، لیژنەیەک بۆ سەرپەرشتی مانگرتنی نووسەران پێکهات، کە من یەکێک بووم لەئەندامەکانی.

مانگرتنەکەی کرێکاران ماوەیەکی زۆری خایاند، شیوعیەکان لەچەندین دەروازەوە دەچوونە ناو مانگرتنەکەوە، تەنانەت وای لێهات کە ڕەنگی تایفەیەکی دیارکراوی وەردەگرت، کۆمەکیەکی زۆریشی لەسەر ئەو بنەمایە بۆ کۆکرایەوە.

بارودۆخی کرێکارەکان لەوپەڕی شپرزەیی دابوو وزۆر بێ دەرمان بوون، ئێوارەیەکیان کرێکاران لەبەردەم قاندرمەی باڵەخانەیەک کۆدەبنەوە، کە وابزانم بارەگای یەکێک لەسەندیکاکان دەبێت، ئەوان بیر لەبرسیەتی منداڵەکانیان دەکەنەوەو ژانەسەریانە لەبەر ئەوەی دوو ڕۆژ دەبێت جگەرەیەکیان نەکێشاوە، کەچی دەبینن یەکێک لەشاگردی چێشتخانەکان بۆ باڵەخانەکە سەردەکەوێت، کە تێیدا

سەرکردەی کرێکارەکان کۆبوونەوە دەکەن – کە شیوعیەکانن- ئەو شاگردە لەگەڵیکی بەدەستەوە دەبێت، کە پڕیەتی لەمریشکی سەر برنج، لەگەڵ پاکەتێکی ئینگلیزی گریڤن ئەی. کاتێک کرێکارەکان ئەو زێدەخەرجیەی هاورێیان دەبینن، دەماغیان دەفڕێ، چونکە خۆیان کە سەدان کرێکارن پارەی کولێرەیەک و جگەرەیەکیان لانییە، چەندین پەلاریان لەو مریشک و پاکەتە ئینگلیزیە دا کە چاو بۆ ئەو پەلارانە پڕ لەفرمێسک دەبێت.

یەکێک لەهاورێیانی شیوعی سەرپەرشتی مانگرتنی کرێکارانی دەکرد، من نامەوێ ناوی بهێنم، نەوەک سکاڵام لەسەر تۆمار بکات و داوای قەرەبوکردنەوەی لەکەدارکردنی شەرەفی بکاتەوە، با هێمای هاورێ ژمارە ١ ی بۆ دابنێین، شەوێک لەو شەوە ترسناکانەی مانگرتنەکە ئێمە نوێنەری نووسەران پێمان و دەنگمان چووبوو لەهاتوچۆ، لەمالی مستەر تیسۆ بەڕێوەبەری کۆمپانیا بۆ موتەسەرفیەتی بەسرا، لەوێشەوە بۆ مەکینە کە ئەو شوێنی کۆگاکای کۆمپانیای نەوتی بەسرایە بۆ بینینی مستەر بکیس کە سەرۆکی هۆبەی کۆگاکانە، لەویشەوە بۆ لای فلانە پارێزەر، جا لەیەکێک لەو شەوانە من و چەند نوێنەرێکی نووسەرانی کۆمپانیا هاورێ ژمارە ١ مان بینی کە لەسەرخۆشیان بەلادادەهات و وەک ئەوەی تووشی سەرسوڕان بووبێت، یەکێک لەتاکسیەکانی راگرتبوو، لەسەر شۆستەکە خۆی خوارکردبووەوە بەزمانێک کە بەمەی قورس ببوو تەتەڵەی دەکردو دەیگوت: بۆ مەنزول. مەنزول قەحپەخانە گشتییەکە بوو لەبەسرا.

ئایا بۆ ئەو مەبەستە کۆمەکی کۆکراوەتەوە؟ بۆئەوەی هاورێ ژمارە ١ پێی سەرخۆش بێت، یان لەوانەیە ژنەکەی بەگۆرەوی نایلۆنی بدات و ئەویش بەسۆزانییەکانی بدات؟ ئەمەیە خەبات.

شوفێرەکانی کۆمپانیا ئەوانەی کە مووچەکانیان لەچل دینار کەمتر نییە، پێیان ڕاگەیاندین کە ئەوان دەگەڕێنەوە، سبەی بەیانی دەگەڕێنەوە سەر کارەکانیان. چی بکەین؟ ئەگەر شوفێرەکان بگەڕێنەوە سەرکار ئەوا سەرەتایەک دەبێت بۆ سەرنەکەوتنی مانگرتنەکە. ئێمە کە نوێنەری نووسەرەکان بووین بڕیارمان دا فێلێک لەبەرپرسانی کۆمپانیا بکەین، بۆ ئەوەی ڕازیان بکەین، هەندێک داواکاری کرێکارەکان بەجێبگەیەنن بەر لەوەی سبەی بەیانی مانگرتنەکە تووشی فەشەل بێت و کرێکارەکانیش هیچیان دەستنەکەوێت. پەیوەندیمان بەبەرپرسانی کۆمپانیا کردو پێمان ڕاگەیاندن کە کرێکارەکان بەنیازن هەندێک کاری توندڕەوانە ئەنجام بدەن، لەوانەش مەبەستیان سوتاندنی کۆگای کۆمپانیا بێت لەگەڵ عەمباری نەوتەکە. بۆیە لەبەرژەوەندی کۆمپانیادایە، هەندێک داواکاریان بەجێبەگەیەنێت دوای هێنان و بردنێکی توند. بەرپرسانی کۆمپانیا ڕازی بوون بە بەجێهێنانی ئەو داوایانەی کە کرێکاران مانگرتنیان لەپێناو کردبوو، تەنها داوایەک نەبێت کە لەبنەڕەتدا ئەو داوایە لەنێو داواکارییەکان نەبوو. ئەویش ئەوەبوو کە ڕۆژانی مانگرتنیان وەک ڕۆژی کارکردن بۆ حسێب بکرێت و موچەکانیان پێ بدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا وەڵامدانەوەی کۆمپانیامان بۆ داواکاری کرێکار بەسەرکەوتنێکی گەورە زانی بۆ کرێکارانی مانگرتوو. ئێمە چووین موژدەی ئەو ئەنجامانمان بەکرێکاران گەیاند، بەڵام تووشی شۆک بوین کاتیک بینیمان هاوڕێ ژمارە ١ پرتەو بۆڵەمان بەسەر دەکات و بەسەرمانەوە هەڵدەچێت و بەناپاکی و دەستبەرداربوون تۆمەتبارمان دەکات. مشتومڕ لەنێوانمان دروست بوو، تا قسەکانمان گەیشتە بەرژەوەندی کرێکارەکان، لێرەدا ئەو هاوڕێیە چووە سەرتەختێکی چایخانەو بەزمانێکی وتارخوێندنەوەو بەدەست بەرزکردنەوە هاواری دەکرد: مافی کرێکاران و بەرژەوەندی کرێکاران؟ کێ بەرگرییان لێ دەکات ئێمە نەبێت؟ ئێمە ئامادەین بچینە

ژێر پەتی سێدارە لەپێناو بەرژەوەندی کرێکاران، بەراستیش وامان کردووە.

ئەمەیە پاڵەوانێتی ئەی هاوڕێ؟ ئایا دەزانی چارەنووسی ئەو هاوڕێ خەباتگێڕە چی بوو. پۆلیس دەستگیری کرد، دوای یەکەم لێدان هەموو شتێکی درکاند. جارێکیان حزبی شیوعی بەیاننامەیەکی دەرکردبوو تێیدا لێکدانەوەی بۆ هۆکارەکانی ئەو ئیعترافانە کردبوو، گوایە ئەوانەی ئیعتراف دەکەن لەچینی بۆرژوازن، نموونەی ئەفەندییەکانن، کە بەناچاری دێنە ناو حزبی شیوعی، چونکە حزبێکی دیکە نییە نوێنەرایەتیان بکات، ئەی حزبی بەکرێگیراو چی لەبارەی ئیعترافی هاوڕێ ژمارە ١ دەڵێ، کە کرێکارێکە لەزەحمەتکێشەکان و ئەفەندی نییە؟

لەنووسینەکانی پێشوومدا زیاتر لەجارێک باسی رۆمانێکی نووسەری بەناوبانگی ئینگلیز جورج ئۆرویلم کرد، کە ناوی ناوە ١٩٨٤، رەنگە خوێنەر بپرسێت کە ئەو رۆمانە چییە، منیش بیرۆکەیەکی سادەم لەبارەی ئەو رۆمانەوە پێ دەدا، بەڵام دوای ئەوەی لەگێڕانەوەی ئەو یادەوەرییە تاڵەی شیوعیەت دەبوومەوە. من ئەو کتێبەم لەبرادەرێک خواستووە، بەنیازم بەو نزیکانە بۆی بگەڕێنمەوە، لەبەرئەوەی پێویستیشە لەکاتی نووسین لەبەردەستم بێت، کاتێک ناوێک لەناوەکانم، یان مێژوویەک لەمێژووەکانم بیرچوو، بۆ کتێبەکە بگەڕێمەوە، هەربۆیەش بڕیاری ئەوەم دا کە ئێستا لەبارەی ئەو رۆمانەوە بنووسم.

ئەو رۆمانە، بەیەکێک لەتوندترین ئەو کتێبانە دادەنرێت، کە ئابڕووی شیوعیەت و شیوعییەکانی بردووە، کەچی نووسەریش یەک وشەی ئەوتۆت پێنادا کە بڵێت مەبەستم شیوعییەکانە، بەڵام تۆ دوای خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەکی سەرەتا هەست دەکەیت مەبەست شوعییەکانە.

شیوعییەکان دوای ئەوەی هەستیان بەخۆیان کرد، هێرشیان کردە سەر رۆمانەکە و نووسەرەکەی، دەستیان کرد بەجنێوی باو وەک سیخوڕی ئیمپریالیزم، سیخوڕی دۆلار، سیخوڕی قین لەدڵ.

کاتێک ئەو ڕۆمانەم خوێندەوە، کە دەستە تیرۆرستییەکانی شیوعی لەوپەڕی بەرزی دابوو، بەوە سەرسام بووم، کە چۆن نووسەر توانیویەتی بەو وردەکارییە جوان و نایابە باسی وڵاتێک بکات، کە شیوعیەت حوکمڕانی دەکات، نووسەر خۆشی لەوڵاتێک دەژی، کە شیوعیەت بۆ خۆی بەخاکێکی بەپیتی نازانێ، سەرەڕای ئەو دیموکراسییەی کە بۆ هەموو لایەنێک دەستەبەرکراوە، بۆ پارێزگاران و لایەنگرەکانیان، بەشیوعییەکان و لایەنگرەکانیانەوە.

بەڵام هەندێک ئینگلیز و ئەمریکی کە قسەم لەسەر ئەو بابەتە لەگەڵیان کرد، بیانویان دەگرت و دەیانگوت بابەتەکە پەیوەندی بەوە نییە، کە خەیاڵی نووسەر سنووربەزێنە، بابەتەکە لەمە ئاسانترە، هەرکەسێک ئەگەر بۆ ماوەی هەفتەیەکیش بێت لەئەورووپای شیوعیەت بژیت، وەک ئۆرویل لەوەزعی ئەو وڵاتە دەگات، کە تووشی شیوعیەت بووە.

ئێستا ئێمە لەساڵی ١٩٨٤ داین، جیهان بۆ سەر سێ دەوڵەتی شیوعی دابەشبووە: روسیا و چین و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە ئەوەیان ئیمپراتۆریەتی بەریتانی قوت داوە، نووسەر بەڕێکخستن ناو لەو دەوڵەتانە دەنێ ئۆراسیا و ئیستاسیا، بەڵام ناو لەویلایەتە یەکگرتووەکان نانێ، ڕووداوەکانیش هەموویان لەدوورگەکانی بەریتانیا دەستپێدەکات بەتایبەتی لە لەندەن.

ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی ساردی مانگی نیسانەو کاتژمێر یەکی نیوەڕۆیە، پاڵەوانی ڕۆمانەکە کە ونستۆنە گەڕایەوە شوقەکەی، دیوارەکانی باڵەخانەکە بەدیواری ئاودەستەکانیشەوە بەوێنەی براگەورە داپۆشراوە، کە ڕێبەری حزب و هەڵبەتە ڕێبەری دەوڵەتیشە، لەژێرەوەی هەر وێنەیەکیش نووسراوە: براگەورە چاودێریتان دەکات. ئەوە هەفتەی قینە. دەنگێک دێت کە باسی بەرهەمی ئاسن دەکات. ئەو دەنگە لەتلسکرینەوە دێت، ئەوەیان ئامێرێکە هاوشێوەی تەلەفزیۆن کە

فرمان و ڕێنمایی و بەیاننامەکان بڵاودەکاتەوە، لەگەڵ پەخشکردنی مۆسیقای جەنگ. لەهەمان کاتیشدا لەتوانایدا هەیە کە هەر وشە، جوڵە، یان هەر ئاماژەیەکی سیمای هاوڵاتی بگرێت و ڕەوانەی فەرمانگە بەرپرسەکانی بکات، کە کاریان چاودێریکردن و سیخوڕیکردن بەسەر خەڵکەوە (پۆلیسی هزر) جا تۆ ناتوانی تلسکرین بکوژێنیتەوە، ڕەنگە بتوانی تۆزێک دەنگی کەم بکەیتەوە. هیچ ماڵێکیش نییە لەباڵەخانەکە ئەو ئامێرە سیخوڕەی تێدا نەبێت.

ونستۆن فەرمانبەرێکە لەوەزارەتی هەقیقەت. کاری ئەو وەزارەتە ئاوەژووکردنی هەقیقەت و ساختەکردنی مێژووە. سەرەڕای پێدانی زانیاری هەڵە بەگەل، ئەمەش بەگوێرەی بەرژەوەندی حزب و تواناکانی. ئەو کارەی ونستۆن ئەنجامی دەدات، خۆی لەخۆیدا کارێکی سەیرە. هەندێک لەسەرۆک و وەزیر و بەرپرسان ئەوانەی کاتێک لەکاتەکان کاری گرنگیان ئەنجام داوە. بێگومان ڕۆژنامەکان قسەیان لەبارەی ئەو کارانەوە کردووەو ستایشی ئەوانی کردووە. ڕەنگە ئێمە زێدەڕۆیی بکەین کە بڵێین ڕۆژنامەکان، چونکە ڕۆژنامە نییە. تەنها یەک ڕۆژنامە هەیە ئەویش تایمزە. جا کاتێک براگەورە لەیەکێک لەوپیاوە توڕە دەبێت. پێویست دەکات کە ئەو ناپاک و لاسارانە لەسەر تواناکەیان بەدیار بخرێن. ئەوکات وەزارەتی هەقیقەت کۆپییەک لەو ڕۆژنامەیە دەپارێزێت، کە ڕۆژگارێک دەرچووە ئەو پیاوانە پاڵەوانە، وەزارەت ئەمە لەناودەبات و کۆپیەکی نوێ دروست دەکات و دوژمنانی براگەورە بەوشێوەیە دەردەخات، کە وەکو دەیەوێت و جا وێنەیەکیش لەو ڕۆژنامەیە دەپارێزێت، مێژوونوسان پشت بەو ڕۆژنامەیە دەبەستن و مێژووش بەپێی ئەو کۆپیە دەنووسرێتەوە، کە هەمان ژمارەو مێژووی ڕۆژنامە لەناوبراوەکەی هەڵگرتووە.

یان لەهەندێک باردا براگەورە یان حزب پێشبینی ئەوە دەکات، کە بەرهەمی کشتوکاڵ لەو ساڵەدا زۆروزەوەند دەبێت، کەچی دەرئەنجامەکە پێچەوانە دەبێتەوە، بەڵام چۆن دەکرێت حزب و براگەورە هەڵە بکەن؟ کەواتە دەبێت ئەو ژمارەیەی تایمز لەناو ببرێت و لەشوێنی ئەو کۆپییەکی دیکە چاپ بکرێت و کە هەمان مێژووی لەسەر بنووسرێت و پێشبینیەکە پێچەوانە بکرێتەوە لەشێوەی: ئەمساڵ بەروبوومی کشتوکاڵ خراپ دەبێت.

حزب سێ دروشمی هەیە: جەنگ ئاشتییە. ئازادی کۆیلایەتییە. نەزانی هێزە. ژیانیش بەپێی ئەو دروشمانە دەڕوات.

یەکێک لەوەزارەتەکانی دیکەی ئەو سەردەمە وەزارەتی ئەڤینە، کاری ئەو وەزارەتە بەرەنگاربوونەوەی ئەڤین و سێکسە و ئەڤینداریی و سێکسیش قەدەغەیەو زەواجی فەرمی نەبێت. تەنها لیژنەی مەرکەزی حزب نەبێت، کە هەموو شتێک بۆ ئەوان ڕێگەپێدراوە. تەنها لەو لایەنەوە بارودۆخی رۆمانەکە لەگەڵ بارودۆخی هاوڕێیانی عێراق جیاوازە: هاوڕێیانی عێراق فیداکاری ئەڤین و سێکس و ئازادی سێکس و هەموو جۆرەکانی دیکەی بەدڕەوشتین. هەرزەکار لەوڵاتی ئێمە کە تەنانەت ئارەزووی ئاژەڵی مێ دەکات لەماکەر و چێڵ، ئامادەیە کە هەزاران لەکەسوکاری بفرۆشێت بۆ ئەوەی ئەڤینێکی هەبێت، چۆن نابێتە شیوعی کاتێک حزبی شیوعی ئەو هەموو هاوڕێیە ژنەی هەیە شیوعییەت و ڕێنماییەکانی تێکی داون، بەوەی کە هەموو رەوشتەکان کە ئێمەی دەیزانین ئەفسانە و فێڵی بۆرژوازیەت و دەرەبەگی ڤێزەونە؟

فەلسەفەی شیوعییەکانی بەریتانیاو هەموو شیوعییەکان لە ١٩٨٤دا ئەوەیە: تۆ کە کردەیەکی سێکسی ئەنجام دەدەیت، واتە وزەیەک

خەرج دەکەیت، بۆتۆ چاکترە ئەو وزەیە بۆ خۆپیشاندان و هوتافکێشان لەپێناو ژیانی حزب و براگەورە خەرج بکەیت.

لەلاپەڕە نۆی کتێبەکەوە دەزانین کە پاڵەوانەکەمان پیلانگێڕ و ناپاکە. ئەو یاداشتە تایبەتەکانی دەنوسێتەوە، ئەمەش تاوانێکە، لەلایەن پۆلیسی هزرەوە لێخۆشبوونی نییە، جا ئەو یاداشتە هەر چۆنێک بێت، تەنانەت ئەگەر لەشکۆمەندی براگەورەش دابێ، تۆ ئەگەر یاداشت بنوسیتەوە مانای ئەوەی تۆ هەست بەتاکێتی خۆت دەکەیت، هەموو مەترسییەکیش لەمەدایە، تۆش تەنها شتێک نیت، بەڵکو گەردیلەیەکی لەو قەوارە مەزنەی حزبی و دەوڵەت، بێ ئەوانە شتێک نیت، لەکۆگایەک توانی ئەو پەڕاوە بەدەست بهێنێت، ئەمەش موعجیزەی راستەقینەی تەمەن بوو، چونکە پەڕاوی یاداشت شتێکە نافرۆشرێت، کەس بەکاری ناهێنێت.

ئێستا با بزانین ونستون لەپەڕاوی یاداشتەکانی لەچواری نیسانی ١٩٨٤دا چی نوسیوە، ئەوە ئەو ئاکارەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە هاوشێوەی ئاکاری ئاژاوەگێڕ و بەکرێگیراوەکانی عێراقە کە لەزەتیان لەوە دەبینی یاری بەتەرمی منداڵان بکەن لەکەرکوکن یان سکی ئافرەتی دووگیان بدڕن و کورپەلەکە دەربێنن و بەپیلا و بزمار وردی بکەن، بەڵێ ئەمە برادەرێکی موسڵاوی بۆی گێڕامەوە، کە بەچاوەکانی خۆی بینیبووی، کە ئەمەیان لەڕەحمی پاکیزەیەکی قەومی دەرهێنا بوو، دوای ئەوەی لەداریان بەستبۆوە، دواتریش بەجێیان هێشتبوو تا مرد وەک مەسیحێکی خوێن لێچۆڕاوی نوێ.

شەوی رابردوو بۆ سینەما چووم، هەموو فیلمەکان لەبارەی جەنگن، فیلمێکی زۆرباش بوو لەبارەی کەشتییەکەوە بوو، کە پڕ بوو لەپەنابەر لەشوێنێکی دەریای ناوەڕاستەوە بۆمباران دەکران، بینەران زۆر بەو دیمەنە دڵخۆش بوون، کە پیاوێکی ناقۆڵا و قەڵەو

دەردەکەوت مەلەوانی دەکرد، بۆ ئەوەی لەو هەلیکۆپتەرە نەجاتی بێت، کە راوی دەنان، وەک لەسەرەتا دەتیبینی هاواری دەکرد و پەلەقاژەی بوو، هانکەهانکی بوو وەک ئەسپی دەریا وابوو، دواتر بەهۆی چاویلکەکەمەوە تۆپهاوێژی هەلیکۆپتەرەکەم بینی، دواتر پیاوەکە کون کون بوو، دەریاکەی دەورووبەشی سوور بوو، دواتر پڕ بوو لەئاو و نقوم بوو، کاتێک پیاوەکە نقوم بوو بینەران بەپێکەنینەوە هوتافیان دەکێشا، دواتر بەلەمێکی فریاکەوتن دەرکەوت، کە پڕ منداڵ بوو و هەلیکۆپتەرەکەش بەسەرەوە بوو، ئافرەتێکی رووت لەپێشەوەی بەلەمەکە دانیشتبوو، منداڵێکی بەدەستەوە بوو کە تەمەنی سێ ساڵ دەبوو، ئەو منداڵە دەیزریکاند و لەترسان سەری لەناو مەمکی دایکی دەشاردەوە، وەک ئەوەی سنگی کون بکات بۆ ئەوەی خۆی حەشار بدات، ژنەکەش بەقۆڵەکانی منداڵەکی تەوقکردبوو و منداڵەکەی ئارام دەکردەوە، خۆشی دەموچاوی لەترسان شین هەڵگەڕابوو، هەموو کاتەکە منداڵەکەی دادەپۆشت وەک ئەوەی وا بزانێ کە قۆڵەکانی منداڵەکە لە گوللەکان نەجات دەدەن، دوار هەلیکۆپتەرەکە بۆمبێکی بیست کیلۆگرامی هەڵدایە ناویان، بروسکە ئاگرێکی ترسان دەرکەوت و بەلەمەکە ورودو خاش بوو، لەوێ دیمەنێکی سەرنجڕاکێش دەرکەوت، وێنەی دەستی منداڵێک کە زۆر بەرزبووەوە، لێرەوە لەکورسییەکانی حزب بەوە دەنگی چەپڵەلێدان بەرزبووەوە، بەڵام ئافرەتێک لەبەشی لەشفرۆشەکان هەرایەکی نایەوە، کە هاواری دەکرد نابێت ئەو دیمەنە بەمنداڵان نیشان بدرێت، ئەمە دروست نییە، پولیس ئەو ژنەیان لەهۆڵەکە وەدەرنا، کە ونستون ئەو رووداوەی یاداشت دەکرد رووداوێکی دیکە خەیاڵی داگیرکردبوو، ئەو رووداوەش وایلێکرد کە بەپەلە بچێتەوە ماڵ بۆ ئەوەی یاداشتەکانی بنووسێتەوە.

لەبەشی تۆمارەکان کە ونستون تێیدا کار دەکات کاتژمێر نزیک دەبوو لە یانزە، کورسییەکانیان لەشوێنەکانی خۆیان هەڵدەگرت و دەیانبردە بەردەم تلسکرینەکە لەناوەڕاستی هۆڵەکە بۆ بینینی بەرنامەی (قین لەدوو خولەکدا) ونستون لەڕیزی ناوەڕاست شوێنێکی بۆ خۆی گرت، دوو کەس هاتنە ژوورەوە، ئەو دەیانناسی، بەڵام هەرگیز قسەی لەگەڵ نەکردوون، یەکێکیان کچێکە زۆر لەڕێرەوەکانی فەرمانگە بینیویەتی. هەرچەندە ناوی نازانێ، بەڵام دەزانێ ئەو لەبەشی چیرۆک و رۆمانەکان کاردەکات، لەوانەیە کارێکی میکانیکی بکات، زۆرجار دەست و جلەکانی بەچەوری بنیوە، لەوانەیە کار لەئامێرەکانی چاپکردنی رۆمان بکات، ئەو کچێکی دەموچاو لاوازە، بەڵام بوێرە و جوڵەی وەرزشییە و تەمەنی نزیکەی بیست و حەوت ساڵ دەبێت.

ئەی خوێنەر، هەفتەی رابردوو باسی ئەوەم بۆ کردی، کە پاڵەوانی رۆمانەکەمان ونستۆن لەڕیز دانیشتووانی بەردەم تەلسکرینەکەوە دانیشتبوو، بۆئەوەی سەیری بەرنامەی رق بۆ دوو دەقیقە بکات، ئەو کاتە دوو کەس هاتنە ژوورەوە، یەکێکیان کچێک بوو کە وەک دەردەکەوت لەبەشی چیرۆک و رۆمان کاری میکانیکی دەکات، پشتێنێکی پەمەیی لەکەمەری بەستبوو کە هێمای کۆمەڵەی دژەسێکس بوو. ئەو جارێکیان نیگایەکی بۆ کردبوو، ئەو کاتە هەردووکیان بەڕێرەوێک لەڕێرەوەکانی وەزارەت تێپەڕیبوون، هەرچەندە نیگایەکی خێرابوو بەتیلەی چاو کەچی کاری کردبووە دڵی ونستۆن و دڵی پڕکردبوو لەترس. وای بەخەیاڵدا هات، کە ئەو کچە لەوانەیە سیخوڕێک بێت لەسیخوڕەکانی پۆلیسی هزر.

ئەویتریشیان پیاوێک بوو، کە ناوی ئۆبرینە. ئەو ئەندامی حزبی ناوخۆیە، یان کۆمیتەی ناوەندی حزبە، پۆستێکی گرنگی هەیە. بێدەنگی باڵی بەسەر دانیشتووان کێشا و سەیری ئەو جلڕەشانەیان دەکرد، کە ئەو کەسانە لەبەری دەکەن لەحزبی ناوخۆدان. ئۆبرین بەشێوازێکی تایبەت چاویلکەکەی لەسەر چاوەکانی رادەگرت، کە شێوازێکی زۆر بەئەدەبەوە بوو. ونستۆن لەوساڵانەدا دەیان جار ئۆبریی بینی بوو. هەستی بەکێشکردنێکی توند دەکرد بۆ لای ئەو. ئومێدێکی پڕ بەدڵی هەبوو، کە باوەڕی حزبی ئۆبرین کامڵ نییە. بۆ ئەمەش ئاماژەیەک لەسیمایدا هەیە، لەوانە کەسێک بێت بتوانرێت

قسەی لەگەڵ بکرێت، ئەگەر بتوانی بەڕێگایەک فێڵ لەتەلسکرینەکە بکەیت و بەتەنیا لەگەڵی بمێنێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ونستۆن نەیتوانی لەدروستی ئەو ئومێدە دڵنیابێتەوە. ئوبرین کورسیەکی لەهەمان ریز بۆ خۆی دانا، کە ونستۆن تێیدا دانیشتبوو، تەنها دوو کورسی نێوانیان جیادەکاتەوە، ئەوکاتە بەرنامەی رق لەتەلسکرینەکەوە دەست پێدەکات.

وەک نەریتە روخساری ئیمانوئێل گۆلدشتاین دەرکەوت، کە دوژمنی گەلە، رۆژانێکیش ئەو یەکێک بوو لەسەرکردە دیارەکانی حزب و لەئاستی براگەورە بوو، بەڵام دواتر چەند کارێکی دژەشۆرشی ئەنجام دا، بڕیاری کوشتنی بۆ درا، کەچی بەڕێگایەکی نارۆشن رایکردو ونبوو. بەرنامەی رق لە رۆژێکەوە بۆ رۆژێکی دیکە جیاوازی هەیە، بەڵام گۆلدشتاین کەسی سەرەکی ناو هەموو بەرنامەکانی رقە. ئەو ناپاکێکی گەورەیەو یەکەم کەسە، کە بێگەردی حزبی پیس کردووە. هەموو ئەو تاوانانەی کە دواتر دژی حزب ئەنجام دراون لەناپاکی و کاری تێکدەرانەو بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە و لادان، هەموویان راستەوخۆ بەپێی رێنماییەکانی گۆلدشتاین بووە. هێشتا لەژیان ماوەو کارە پیلانگێڕییەکانی ئەنجام دەدا. لەوانەیە ئێستا ئەو لەو دیودەریاکەوە بێت و لەلایەن گەورە بێگانەکانیەوە بپارێزرێت. لەوانەشە هەر لەناو ئینگلتەرا خۆی حەشاردابێت. روخساری ئەو وەک لەشاشەکە دەردەکەوت لەشێوەی بەرخ بوو، دەنگیشی هەر لەشێوەی دەنگی بەرخ بوو.

گۆلدشتاین دەستی دەکرد بەهێرشە ژەهراویە باوەکەی بۆ سەر دروشمەکانی حزب و پرەنسیپەکانی. هێرشەکانی زێدەڕۆیی تێدابوو، باسی لەچەند خاڵێک دەکردو چەند تاوانبارکردنێک لەقسەکانی هەبوو کە منداڵیش درکی بەوە دەکرد ساختەن. ئەو سوکایەتی بەبراگەورە دەکرد، تانەی لەدیکتاتۆریەتی حزب دەدا و داوای هاوپەیمانێتی ئاشتی

دەکرد لەگەڵ ئۆراشیا، بانگەشەی بۆ ئازادی قسەکردن و ئازادی ڕۆژنامەگەری و ئازادی کۆبوونەوەو ئازادی بیرکردنەوە دەکرد. بەهەڵچوونێکی هیستریاوە هاواری دەکرد، کە شۆرش خیانەتی کردووە، جا لەترسی ئەوەی نەوەک یەکێک بەقسەکانی گۆلدشتاینەوە هەڵخەڵەتێت، تۆ لەشاشەکەوە لەپشت سەری ئەو چەند ریزێک لەسوپای ئۆراشیاوە دەبینی، کە بەدوای یەکەوە دەڕۆیشتن.

بەرلەوەی سێ چرکە لەماوەی بەرنامەکە تێپەڕێت، لێرەو لەوێ لەڕیزی بینەران هاواری رق و کینە بەرزدەبووەوە، سەرەڕای ئەوەی هەزار جار لەڕۆژێکدا لەسەر سەکۆ و تەلسکرین و رۆژنامە و کتێبەکان هەڵمەتی گەورە دەکرێتە سەر گۆلدشتاین، کەچی ئەو شتێکی لەهێزەکەی کەم نەکردووە.

رۆژێک نییە کە پۆلیسی هزر چەندین سیخوڕ و تێکدەر نەگرن، کە کار بەئاماژەکانی گۆلدشتاینەوە دەکەن، ئەو سەرۆکی سوپایەکی گەورەی وەهمییە، سەرۆک تۆڕێکی نهێنییە، کە دەیەوێت بەپلانگێڕییەکانیەوە رژێمەکە لەناو ببات، وەک گریمانە دەبێت ناوی ئەو بزووتنەوەیە برایەتی بێت، پروپاگەندەیەکی گرنگیش هەیە، کە گوایە کتێبێکی ترسناک هەیە، کە لەنووسینی گۆلدشتاینە، ئەو کتێبە بێ ناونیشانەو خەڵک هەر بە (کتێبەکە) ناوی دەبەن.

لەخولەکی دووەمی بەرنامەکەدا توڕەیی گەیشتە ئاستی شێتی، خەڵکەکە لەشوێنی خۆیان هەڵدەسانەوەو بەوپەڕی دەنگی خۆیان هاواریان دەکرد، کچەی پشتێن پەمەیی کە لەدوای ونستۆن دانیشتبوو، لەڕقەوە هاواری دەکرد: ئەی بەراز، ئەی بەراز، ئەی بەراز. فەرهەنگێکی مەزنی هەڵگرت و بەشاشەکەی کێشا. ونستۆنیش خۆی بینیوە کە لەگەڵ خەڵکەکە هاواری دەکردو بەتوندی پاژنەکانی بەکورسیەکە دەکێشا.

کەسێک نەبوو بتوانێت بە بەرنامەی رق کاریگەر نەبێت و ئالۆدەی نەبێ، ترس و حەزکردن بەتۆڵەکردنەوە و ئارەزووی کوشتن و ئەشکەنجەدان، تێکشکاندانی دەموچاو بەچەکوش وەک کارەبا بەناو خەڵکەکە دەڕۆیشت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو رق و کینەیەکە مرۆ هەستی پێدەکات، دەتوانرێت لەبابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە بگوازرێتەوە. بەوشێوەیە رقی ونستون ساتێک لەساتەکان لەدژی گۆڵدشتاین نەبوو، بەڵکو لەدژی براگەورە و حزب و پۆلیسی فیکر بوو، بۆ ساتێک کە دڵی لەلای ئەو تاکە تارمەیەی شاشە بوو، کە بۆتە تاکەپاسەوانی راستی بۆ هەقیقەت و عەقڵ لەدونیای درۆدا، ساتێکی دیکە رقەکەی بۆ براگەورە دەبێتە بەندایەتی. ونستۆن توانی رقەکەی لەروخسارەکەی سەر شاشەوە بۆ کچە پشتێن پەمەییەکە بگوازێتەوە، کە لەدوای دانیشتبوو، لەخەیاڵی ونستۆن وێنەیەکی زیندو و جوان درەوشایەوە، وێنەکەش ئەوەبوو کە بەگۆچانێکی پلاستیکی تا مردن لەو کچە دەدات، لەدارتێلێک بەڕووتی دەیبەستێتەوەو بەقەد هەموو جەستەی تیربارانی دەکات، لاقەی دەکات و لەوپەڕی چێژوەرگرتن پێستی لێدەکاتەوە، ونستۆن درکی بەوەکرد، کە بۆچی رقی لەو کچەیە؟ لەبەر ئەوەی جحێڵ و شۆخە، کەچی بێ سێکسە. دەیویست لەگەڵی بخەوێ، بەڵام نەیدەتوانی.

رق گەیشتە ئەوپەڕی دەنگی گۆلدشتاین بووە دەنگی راستەقینەی بەرخ، دواتر روخساری براگەورە دەرکەوت، خەڵکەکە دەستیانکرد بەهوتافکێشان بەدووبارەکردنەوە دەیانگوت: براگەورە براگەورە. ونیستۆنیش وەک خەڵکانی دیکە بەشداری لەهوتافکێشانەکە کرد، لەوەیان چارەیەک نەبوو، کاتێک هەستت دەشاریتەوەو بەسەر گوزارشتەکانی سیمات زاڵ دەبێ، ئەوە دەکەیت، کە خەڵک دەیکات، ئەمە پەرچەکردارێکی غەریزییە.

ئوبرێن هەستایەوە، چاویلکەکەی لەچاوکردەوەو خاوێنی کردەوە، خەریک بوو بەشێوە تایبەتەکەی لەشوێنی خۆی دادەنایەوە، لەچرکەیەکدا چاوی بەچاوی ونستۆن کەوت، ونستۆن زانی کە ئوبرین بیر لەهەمان شت دەکاتەوە، کە ئەو بیری لێدەکاتەوە، پەیامێک لەنێوانیان دروست بوو، کە ناتوانرێت هەڵەی تێدا بکرێت، وەک ئەوەبوو کە ئوبرین بەچاوەکانیەوە پەیامەکەی بگەینێ.

کاتێک ونستۆن هەڵسایەوە، ئەو کاغەزەی پێشی بینی، بۆی دەرکەوت ئەو کاتە بێئاگا شتێ لەسەر نوسیوە، کە سەیری تەلسکرینی کردووە، قەڵەکەمەی لەخۆیەوە لەسەر کاغەکە بەپیتی گەورە نوسیویەتی:

بڕوخێ براگەورە

بڕوخێ براگەورە

بڕوخێ براگەورە

تا نیوەی لاپەڕەکە پڕکراوەتەوە.

کاتێک لەماڵەوە لەژوورەکەی بوو، دەرگاکەشی داخرابوو، گوێی لەدەنگی دەرگابوو، مسز باسۆن بوو، کە ژنەکەی دراوسێیانە، بەونستۆنی وت: هاوڕێ گوێم لەدەنگت بوو کە هاتیەوە ماڵ، ئایا دەتوانی بێیتە ماڵەوەو سەیری بەلۆعەی چێشتخانە و ناندینەکەمان بکەیت، کارناکات.

مسز باسۆن تەمەنی لەسییەکان بوو، بەڵام زۆر گەورەتر دەردەکەوت. ونستۆن بەلۆعەکەی چاککردەوە و دەستی دەشوشت، کاتێک گوێی لەهاوارێک بوو: دەستەکان بەرزبکەوە. بینی کوڕێکی تەمەن نۆسالانە، دەمانچەیەکی منداڵانی بەدەستەوەیە، خوشکەکەشی کە دوو ساڵ لەویان بچووکتر بوو، پارچە دارێکی بەدەستەوە بوو

هەمان هەڵسوکەوتی براکەی دەکرد، هەردووکیان شۆرتی ڕەنگ شین و کراسی ڕەنگ خۆڵەمێشی و کڵاوی سوریان لەسەربوو، ئەمە جلوبەرگی سیخورەکان بوو، کە ئەویش ڕێکخراوێک بوو لەڕێکخراوەکانی حزب، کوڕەکە هاواری کرد: تۆ ناپاکی، تۆ تاوانباری هزری. تۆ سیخوری گۆلدشتاینی، تەقەت لێدەکەم و ڕەوانەی کانگەکانی خوێت دەکەم.

دایکی وتی: ئەوان هەست بەناوی ئومێدی دەکەن، چونکە نەیانتوانی بچنە سەیری لەسێدارەدانەکان.

کیژۆڵەکە گوتی: دەمەوێ لەسێدارەدان ببینم. دەمەوێ لەسێدارەدان ببینم.

کاتێک ونستۆن لەماڵەکەی دانیشتبوو، خەونێکی بیرهاتەوە، کە چەند ساڵێک پێشتر بینیبووی، ڕەنگە حەوت ساڵێک پێشتر بووبێ، لەخەوندا لەژوورێکی زۆر تاریک دەڕۆیشت، گوێی لەکەسێک بوو کە لەوێ دانیشتبوو، کاتێک بەتەنیشتی تێپەڕی ئەو کەسە دەیگوت: لەو شوێنە بەیەک دەگەین کە تاریکی تێدا نییە. ڕۆیشت بێ ئەوەی بوەستێت، دواتر بۆی دەرکەوت، ئەو دەنگەی کە لەخەون بیستویەتی دەنگی ئۆبرینە. دواتر لەتەلسکرینەکەوە بیستی کە لەهەفتەی داهاتوو بەشە چوکلێتی هەر تاکێک لە ٣٠ گرامەوە بۆ ٢٠ گرام کەم دەبێتەوە.

دەستی بۆ دەفتەرەکە برد بۆ ئەوەی بنوسێ. لەخۆی پرسی: بۆ کێ بنوسێ؟ بۆ ئایندە، یان بۆ ڕابردوو، بۆ سەردەمێک کە هیچ شتێکی تێدا نییە خەیاڵ نەبێ. لەسەر نووسینی ئەو بیرەوەرییانەش سزا دەدرێت. ڕەنگە مردن نەبێت بەڵکو لەناوبردن بێت، ئەو کاتە ناوی لەهەموو تۆمارەکان دەسڕێتەوەو هەموو شوێنەوارەکانیشی دەسڕێتەوە، وەک ئەوەی نەژیابێت. جا لەدەفتەرەکەی نووسی: بۆ

ئاینده یان رابردوو. بۆ زەمەنێک کە فیکر ئازادە. بۆ زەمەنێک کە کەسێک لەکەسێکی دیکە جیاوازە، نەوەک کەسێک بێت یەکخراو بێت لەزەمەنی ئاکاری فەرمیدا، لەزەمەنی تاکڕەهەندی، لەزەمەنی براگەورە، لەزەمەنی بیرکردنەوەی دووفاقی دەژیت.

بەر لەوەی بەردەوام بم لەسەر باسکردنی هێڵە گشتییەکانی رۆمانە نایابەکەی ١٩٨٤، کە جۆرج ئۆرویل بەو رۆمانە توانی لەشیوعییەکان و مادییەتی میکانیزمی ئەوان بدات، نەوەک مادییەتی فیورباخن, کە ئەویش بەتەنها مادییەتی میکانیزمی نییە, سەرەڕای ئەوەش ئوورویل بەشێوەیەکی تایبەت لەڕقبوونەوەی ئەوانی دا, کە بۆ تاک هەیانەو دواتریش ئەو کۆیەی لەو ملیۆن تاکە پێک دێت. من دەمەوێ بەر لەوە ئاماژە بۆ دیاردەیەکی ترسناک بکەم, کە پێم وایە خەڵکێکی زۆر تێبینیان نەکردووە .

شیوعییەکانی عێراق بێ هوودە تێدەکۆشن ئەو هەڵمەتە فیکریە توندە رابگرن، کە لەڕۆژنامەکان و مینبەری مزگەوتەکان لەڕۆژانی هەینی, یان لەمینبەری ئیمام خالصی ئاراستەیان دەکرێت، ئەوان دەیانەوێت ئەو هەڵمەتانە لەهەر شوێنێک بێت بیوەستێنن بەوشێوەیەی کە دەتوانرێت. پەنایان بۆ دادگا برد، ئەمە کەڵکی بۆ ئەوان نەبوو، دواتر هاوڕێ ئەبو سەعید یان ئەبو نادیە بەڕاست و چەپ تانەی لەخەڵک دەدا بەقەڵەمە تیژکراوەکەی هێرشی کردە سەر هەموو رۆژنامەکان- حوریە، ئەهالی، سەورە، فەجر جەدید... ئەوانی دیکەیش, جگە لەڕۆژنامەی هاوڕێیان، هەموو دوژمنێکی شیوعی بە بەکرێگیراو و بەکارخراوی ئیمپرالیزم لەقەڵەم دا، شیوعییەکان نموونەی ئەوەیان دەهێنایەوە, کە نەیارانی شیوعی ئەنجامیان دەدا، ئەمەش بەوە لێکدەدایەوە, کە ئەوانەی دروشمی دژایەتی شیوعیان بەرزکردۆتەوەو دەوری ئیمپریالیزمیان داوە، لەگەڵ مەکارسی و نوری سەعیدن. بەڵێ

ئێمە لەدژایەتی شیوعیدا لەگەڵ ئیمپریالیزم یەک دەگرینەوە، ئایا ئەمە چی تێدایە؟ ئەرێ راستە کوفر بەخوا بکەین و نکۆڵی بە بوونی بکەین, چونکە ئیمپریالیستی هاوشێوەی مەکارسی و ماک ئارسەر و چەرچل باوەڕیان پێیەتی. ئەرێ وەڵاممان دەدەنەوە ئەی هاوڕێیان، روسیای سۆڤیەتی خوانەناسە، باوەڕی بەخوا نییە، کەچی ئینگلیزی ئیمپریالیزم باوەڕی پێیەتی. لەوانەیە روسیای شیوعی لەهەندێک مەسەلەدا پاڵپشتی ئێمەی کردبێت, بەڵام ئەمە لەبەر چاوی رەشی ئێمە نەبووە، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی بوو، کە سودێکی زیاتر وەردەگرێت, کاتێک زیانێک بەر ئیمپریالیزمی بکەوێت. ئایا پێویستە لەسەرمان نکوڵی لەخوا بکەین, لەبەرئەوەی هاوڕێیانمان و گەورە هاوڕێیان نکۆڵی لێدەکەن و تەنها بەفێڵێکی بۆرژوازی یان دەرەبەگی گەورەی دەزانن و یان لەبەرئەوەی دوژمنانیشمان لەئیمپریالیزم بڕوایان پێیەتی.

با هاوڕێیانی شایەد بن و هەرچیەک دەڵێن بابیڵێن: من بەڵێنم بەخۆمداوە کە بە دژایەتیکردنی شیوعیەت نەوەستم تا دوا هەناسەم ، جا چی دەڵێن بابیڵێن، با بڵێن ئەمە بیرۆکەی مەکارسیە، مەکارسی هەزار جار شەرەفمەندترە لەوانەی کە شیوعییەکان بەسەرکردەی گەورە و بیرمەندی مەزن و شەرەفمەندی دەزانن, نمونەی هاوڕێ عەدس و هاوڕێ یەهوا سدیق و ساسۆن دەلال و یوسف هارون زولەیخە و یوسف زولف، تا کۆتایی لیستی ناوی هاوڕێیانی جولەکە کە ئەگەر هەموویان بژمێرم، چەندی لاپەڕەیەکی رۆژنامە پڕدەبێتەوە.

جارێکی دیکە دەنگم بەرزدەکەمەوەو بانگ دەکەم: ئەی دوژمنانی شیوعی یەککگرن. شیوعییەکان خزمەتێکی ئەو وڵاتەیان کرد, کە هەستی پێناکەن و دەرکی پێدەکەن. دژایەتی زۆرینەی گەل بۆ ئەوان دڵی خەڵکی لەیەکتر نزیک کردۆتەوە, وای لێکردوون کە وشەیان یەک بێت، واشیکردووە کە ئەو گەلە جیاوازییەکانی نێوانیان لەبیر بکەن،

ئێستا مەسیحیەکی باوەڕدار بە خوا هەست بەوە دەکات کە موسڵمانی باوەڕ بەخوا بەپێویستیشی دەزانێ کە هەردوو وشەی خۆیان یەکبخەن رووبەڕووی کوفری شیوعی و خوانەناسی مارکسی بوەستنەوە.

دوای ئەو پێشەکییە دەگەڕێینەوە سەر رۆمانەکەمان، لەو شوێنە بەجێمانهێشت کە پاڵەوانەکەمان ونستون سمس، کە دەیویست لەپەڕاوی بیرەوەریەکانیدا ئەو نامە ناوەڕۆک تاڵ و ئازاربەخشە بۆ نەوەکانی داهاتوو بنوسێ.

ونستون ئێستا خەون بەدایکیەوە دەبینی. دەبێ ئەو لەتەمەنی دە یان یانزە ساڵی دابێ کاتێک دایکی ون دەبێ، زۆریش بەناڕۆشنیی باوکی بیردێتەوە، دەبێ ئەوان هەردووکیان لەپەنجاکاندا لەکاتی هەڵمەتە مەزنەکانی پاککردنەوە لەسێدارە درابن.

لەخەونیدا خەوی بەوە دەبینی کە نازانی چۆن ژیانی دایکی و ژیانی خوشکەکەی کە کیژۆلەیەک بووە, بوونەتە قوربانی, یانی ئەو (ونستون)، ئەو شتەی کە ئێستا ویستۆنی تووشی شۆک کردووەو سیسی کردووە ئەوەیە, کە مردنی دایکی نزیکەی بەر لەسی ساڵ خەمناک و تراژیدی بووە, بەو شێوەی کە ناکرێت، چونکە تراژیدیا بۆ سەردەمی کۆن دەگەڕێتەوە، بۆ سەردەمێک کە هێشتا بۆ مرۆڤ ژیانێکی تایبەت ماوەو لەگەڵ تایبەتمەندێتی و خۆشەویستی و برادەرایەتی، ئەو کاتە ئەندامانی خێزان پشتگیری یەکتریان دەکردو شانبەشانی یەکتر دەبوون بێ ئەوەی هۆکارەکە بزانن.

لەیەکێک لەو ماڵانەی کە شیوعیەکان هێرشیان کردبووە سەری، دوو هاوسەری تێدابووە لەگەڵ ٥ منداڵیان، بەکرێگیراوەکان دایک و باوک و چوار منداڵیان دەکوژن, ماڵەکەش تاڵان دەکەن و لەو خێزانە

گەورەیەی کە سەردەمێک ئارام بوو, شتێک نەبووە منداڵێکی شیرەخۆرە نەبێت, کە لەسەر چوارپاکەی نووستووەو نازانرێت هەتیو ماوەتەوە، ئەو دایکەی کە دیقدیقەی دەدا و لەسەرما دەپپاراست و مەمکی لەزار دەنا, سەردولکەی بۆ دەگوت, لەمەودوا بۆی ناچێت، ئەو منداڵە بەستەزمانە کە مەسەلەیەک لەمەسەلەکانی ئەو دونیا فراوانەو ئاڵۆزەی نەدەزانی و نهێنیەک لەنهێنیەکانی نەدەزانی. ئەو مارکس و لینین و شیوعیەت و ململانێی چینایەتی و پاکتاوی نەژادی نەدەزانی, کە سەردەمێک ئاژاوەگێڕەکان کردبوویانە دروشمی خۆیان و چەندین توێژیان لەڕۆڵەکانی گەلیان پێ تەفرە دەدا, لەوانەی کە بەگۆتەگۆتی رەگەزپەرستی و تایفەگەری دەوروژان، ئەو منداڵە بەستەزمانە بەر لەدایکبوونی کەس پێی نەگوتبوو، ئایا تۆ تورکمان یان عەرەب یان کورد دەبیت؟ ئایا دەتەوێت لەچینی زەحمەتکێشی خەباتگێڕ بیت, یان لەچینی دەرەبەگی تاوانبار؟ ئەو کۆرپە هێمنە کە لەناخیدا تۆی هەزاران ئەگەر و پێشبینی هەژمارنەکراو هەبوو، لەشەڕانگێزی شیوعییەکان نەجاتی نەبوو، دیارە ئەویش پیلانگێڕ و سیخوڕێکە لەسیخوڕەکانی ئیمپریالیزم، یەکێک لەدەستەکانیان بڕی و دواتر مەمکی دایکیان بڕی و بەزەر زراریانەوە نا، ئای لەو شیرەی کە لەدونیای مردوانەوە بۆ دونیای زیندوان هەڵدەقوڵێ، ئای لەو مردنەی دەرخواردی زیندوان دەدرێت، ئای لەو تۆڵەیەی کە دەستە شەڕانگێزە تاوانبارەکان لەدەروونی ئەو شیرەخۆرەی پەروەردە دەکەن, کاتێک کە گەورە دەبێت دەبینێ منداڵان یاری دەکەن و یارییەکانیان بەهەردوو دەست دەگرن تەنها ئەو نەبێت. کێ یاری بۆ ئەو دەکڕێ؟ باوکی یان دایکی؟ یان کاتێک بەدەستیەوە دەگرێ تەنها یەک دەستی هەیە. ئایا شیوعییەکان تەسەوری ئەوە دەکەن, کە ئەو منداڵە کاتێک گەورە دەبێت ئەوانی خۆشدەوێت, لەپاداشی ئەو چاکەیەی لەگەڵیان کردووەو هاوسۆز دەبیت و لایەنگری حزبی سیخوڕ و داوا مەزنەکەیان دەبێ؟

ئەو حزبە شەرم لەوە نەکات, کە رۆژنامەی زمانحاڵی لەسەردەمی جەنگی فەلەستینی بانگەشەی بۆ زایۆنیزم دەکرد، زایۆنیزم نەوەک جولەکە, یان ئەو پەردانەی کە شیوعیەکان بۆ زایۆنیزمیان دروست دەکرد، بانگەشەکەش ئەوەبوو, کە ئەو زایۆنیزمە بزووتنەوەیەکی پێشکەوتووخوازە، بەدووریش نازانرێت, کە پیاوکوژ و تاوانباران بکاتە پاڵەوانی گەل. حزبی شیوعی بەمدواییە گەڕاوەتەوە سەر یەکێک لەنەریتە کۆنەکانی، کە ئەو نەریتەی لەهاوڕێی نەمرەوە بەمیرات بۆ ماوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە چەندین شەقاوە و پیاوکوژ و دز و رێگر لەخۆیەوە دەگرێت و گوایە بەپەروەردەیەکی مارکسی پەروەردەیان دەکات, بۆ ئەوەی ببنە پاسەوانی دڵسۆز بۆ زەعیمێک لەزەعیمەکانی حزب, یان ببنە جێبەجێکاری تاوانەکانی شیوعی لەکوشتن و سوتاندن و لاشەکێشان.

ونستونمان لەو شوێنە بەجێهێشت, کە لەسەر جێگاکەی راکشابوو، بێ ئەوەی بخەوێت خەونی دەبینی، فیکەیەکی تیژ کە لەتێلسکرینەکەوە دەهات لەخەونەکانی پچڕاند و ئاگاداری کردەوە کە کاتی کارکردن هاتووە، ئەو بەڕووتی لەجێگاکەی خۆی هاتە دەرەوە، ناتوانێت بێجامەیەک بکڕێ، چونکە ئەندامی حزب لەساڵێکدا سێ هەزار کۆبۆنی بۆ جلوبەرگ دەست دەکەوێت، کەچی نرخی بێجامەیەک شەش سەد کۆبۆنە.

ونستۆن جلەکانی لەبەرکرد و بیری لەو ژیانە دۆزەخئاسایە دەکردەوە, کە تێیدا لەناو چۆڵەوانی بیرکردنەوەیەکی دووفاقیدا دەژی، تۆ دەزانی یان نازانی. یان تۆ درک بەتەواوی هەقیقەت دەکەیت کەچی درۆی رێکوپێک دەگێڕیتەوە.

تۆ لەیەک کاتدا دوو بیرۆکەی دژ بەیەکتر هەڵدەگریت، دەشزانی هەردووکیان دژبەیەکترن، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕ بەهەردووکیان دەکەیت و لۆژیکی دژ بەلۆژیک بەکاردەهێنیت. تۆ سەرپێچی هەموو پێوەرە ئەخلاقییەکان دەکەیت, کەچی خۆشت بەهەڵگری چرای ئەخلاق دەزانی. باوەڕت وایە کە دیموکراسی مەحاڵە، کەچی حزب پارێزگار و سەرپەرشتیاری دیموکراسییە. ئەوە لەبیر دەکەیت کە

پێویسته لەبیر بکرێت. دواتریش سەرلەنوێ ئەوە دێنیتەوە یاد ئەگەر پێویست بوو، دواتر خێرا جارێکی دیکە لەبیری دەکەیت. هەمان پلەبەندی لەسەر پلەبەندییەکە جێبەجێی دەکەیت. هەموو ئەمانەش مەحالە. تەنانەت ئەگەر ویستت لەچەمکی بیرکردنەوەی دووفاقە بگەیت، پێویستە بیرکردنەوەیەکی دووفاقی بەکاربهێنیت.

ئەی خوێنەری خۆشەویست. ئایا هەموو ئەو شتانەمان لەعێراقی ئازیز نەدیت لەڕۆژگاری مۆتەکەی سوردا؟ ئایا لایەنگرانی ئاشتی نەبوون بۆ داکۆکیکردن لەئاشتی منداڵانیان سەردەبڕی؟ ئایا شیوعییەکان نەبوون کە خۆیان بە دیموکراسیخواز ناو دەبەن, کەچی ئەو کەسانیان دەکوشت کە شیوعی نەبوون و تەرمەکانیان لەشەقام رادەکێشا. ئەمەش بەمەزەندەی ئەوان پارێزگاریکردن بوو لەدیموکراسی؟ ئازادی یەکێک بوو لەگرنگترین دەستکەوتەکانی شۆرشی مەزن کە بە گەل درابوو، کەچی شیوعیەکان گەلیان بێبەش کرد لەو ئازادیە بەناوی پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆرشی ١٤ی تەمموز، ئایا ئەمە بیرکردنەوەیەکی دووفاقی نییە؟ تۆ قسە لەسەر خۆشەویستی و برایەتی دەکەیت لەنێوان هەموو خەڵک لەجیهاندا، کەچی لەبەرامبەر کەسوکار و دراوسێ و رۆلەکانی خۆت قین لەدڵی چونکە لەگەڵ بۆچوونی تۆ نین. بۆیە دەستدرێژی دەکەیتە سەرماڵ و روحیان؟ ئەمە لەعێراق روویدا لەبەغدا و بەسرا و موسڵ و کەرکوک و هیندیە و شوێنەکانی دیکە لەساڵانی ١٩٥٨ و١٩٥٩ ، نەوەک لە لەندەنی ١٩٨٤دا.

ونستون بیری لەوە کردوە، رابردوو تەنها نەگۆڕاوە، بەڵکو بە تەواوی وردوخاش کراوە. کەواتە چۆن دەتوانی دروستی هەقیقەتێک بسەلمێنی کاتێک تۆ بەڵگە و تۆمارێکت لەدەرەوەی یادەوەریتان نییە؟ ونستۆن هەوڵی دا بیری بکەویتەوە کە یەکەم جار کەی بوو گوێی لەبراگەورە بوو، دەبێ ئەمە نزیکەی ١٩٦٠ بێت، بەڵام مەحاڵە لەوە دڵنیا بێتەوە.

شیوعییەکانی عێراق بەتەواوی هەر ئەمەیان کرد، تەنانەت بەر لەوەی ببنە سەردارمان و بەر لەوەی کە داوایە مەزنەکەیان بێتەدی لەوەی کە حزبی شیوعی بەشداری لەدەسەڵات بکات، نەتبینیوە کە ئەوان باسی شۆرشی ١٩٢٠ دەکەن, وەک ئەوەی ئەوان ئەنجامیان دابێت؟ یان راپەرینەکە؟ وا تێدەگەن ئەوان ئەنجامیان داوە.

لەگەڵ ئەوەی کە حزبی شیوعی عێراقی، تاکە حزب بووە کە پەیوەندی بەشۆرشی تەممووزەوە نەبووە و بەر لەڕوودانی ئاگادار نەبووە، بەڵام دواتر شۆرشی کرد بەهی خۆی وەک ئەوەی حوسێن رەزی بەهبەهانی ئەنجامی دابێت, نەوەک زەعیم عەبدولکەریم. ئایا لەو چەند رۆژە ئەوەت نەخوێندۆتەوە, کە مەجلیسی عورفی بڕیاری دەستگیرکردنی هاوڕێیەکی زۆر بەشەرەفی داوە، چونکە گوتویەتی: ئەگەر فەهد نەبوایە شۆرشی ١٤ی تەمموز ئەنجام نەدەدرا.

دوور نییە ئەگەر دەسەڵات بەدەستەوە بگرن (خوا نەخواستە) بڵێن فەهد یان بەلایەنی کەمەوە باوکی جەماوەری ئامادەکردووە، ئاراستەی کردوون، بۆ شۆرشی ١٩٢٠، فەهد مردووە ئەگینا

دەیانگوت ئەو سەرکردایەتی جەماوەری کردووە، بۆ شۆرشی ١٤ی تەمموز.

ئەی رۆژنامەی دەیلی ورکەری بەریتانی کە زمانحاڵی حزبی شیوعی بەریتانییە, وتارێکی بڵاونەکردبۆوە، کە تێیدا هێرشکرابووە سەر شکسپیر, چونکە ئەو گوزارشتنی لەبۆچوونەکانی چینی دەرەبەگ کردووەو پابەند نەبووە بەوەی لەگەڵ چینی زەحمەتکێش و چینی کارکەر بوەستێت؟ دواتر، ئەی یەکێک لەئەدیبەکانی ئەوان لەعێراق وتارێکی لەساڵی ١٩٥١ نوسیبوو وەک بیرم بێ هێرشی کردبووە سەر شاعیری گەورەی عەرەب موتەنەبی, چونکە ئەو بانگەشە بۆ جەنگ دەکات و سیخوری ئیمپریالیزم، ئەو واژووی لەسەر بانگەوازی ستۆکهۆلم نەکردبوو، کەچی وایەکێک لەشیوعیەکانی عێراقم بینی, کە شتێکی مێژوویی گرنگی هەبوو نیشانی داین، ئەو شتە مەزنە چی بوو؟ بلیتێک بوو لەیەکێک لەڕووەکانی وێنەیەکی هاوڕێی نەمر فەهد بوو کە جلوبەرگی دیدەوانی لەبەردابوو لەبەرزییەکانی بەعلەبەگەوە وەستابوو. لەدیوەکەی دیکەیش ئەو وشانە نووسرابوون:

یوسف سەلمان یوسف، ئەو کاتەی دەیەوێت جەولەیەک بکات لەوڵاتانی کەنداوی فارس و وڵاتانی عەرەبی، سڵاوتان بۆ دەنێری و هیوای وایە هاوکاری ئێوە وەربگرێت.

شیوعییەکان وایان لێهاتووە شانازی بەهەموو قۆناغەکانی ژیانی سەرۆکەکەیان دەکەن، هەر لەو کاتەوە کە منداڵبوونە لەتلکێف، دواتر گەنج بووە لەناسریە، دواتر گەشتیار بووە و قوتابیەکی دەرکراوی حزبی نادینی بووە، دواتر کرێکاری سەهۆڵ بووە لەناسریە، یان

قاوەفرۆش بووە لەدوکانی براکەی لەبەسرا، دواجاریش سکرتێری حزبی شیوعی بووە.. دوور نییە ئەو رۆژە بێت کە شیوعیەکان مێژووی سەرۆکەکەیان تۆمار بکەن، دوای ئەوەی کە دەسەڵات دەگرنە دەست و ئەرکی خەباتیان تەواو دەبێت، ئەوکات وایدادەنێن کە سەرۆک لەبیرکردنەوە مارکسی بووە لەوەتەی لێرەو لەوێ گەشتیار بووە، بۆ ئەوە نەبووە بەدوای شت بگەڕێت، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە توێژینەوەی بواری کۆمەڵایەتی بکات، وتارەکانیشی بە نموونە دەهێننەوە, کە چۆن سەرنجەکانی خۆی تێدا تۆمار کردووە لەبارەی ئەو وڵاتانەی کە سەردانی کردووەو دواتریش وتارەکانی لەگۆڤاری الناس بەغدا بڵاوکردۆتەوە.

کەواتە منیش لەئێستاوە بەدوای ئەو بەڵگانە دەگەڕێم, کە دەیسەلمێنی یەکێک لەو ئەندامانەی ئێستای کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراق سەر بە تەحقیقاتی جینائی بووە لەسەردەمی رژێمی پێشوودا، خوانەخواستە ئەو خەونەی شیوعییەکان دیتەدی, کە مێشکی داگیرکردوون, بەوەی دەسەڵاتی رەهایان دەکەوێتە دەست. دەبینین چۆن ئەو هاورێیە بەرەو فەرمانگەی تەحقیقاتی جینائی یان وەک ئێستا بەدائیرەی ئەمن ناو دەبرێت دەچێت و بەدەوریەوە ئەو پاسەوانە تایبەتانە دەبن, کە حزبی بەکرێگیراو بەمارکسیەت رۆشنبیری کردوون، دەچن بۆ ئەوەی ئەو بەڵگانە لەناوببات کە دەیسەلمێنن ئەو سەر بە تەحقیقاتی جینائی بووەو مووچەیەکی پروپوچی وەرگرتووە, کە شەش دینارو ئەمەش موچە بنەڕەتییەکەیەتی, چەندیشی بەناوی گرانی بژێوی وەک دەرماڵە بۆ زیاتر کراوە کە کەمترە لە ٢٠ دینار.

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو رۆمانەی کە بۆمان باسمانکردن:

تیلسکرینەکە فەرمانی وەرزشی دەدا: یەک.. دوو.. یەک.. دوو.. بچەمێوە.. هەستاوە. دواتر تێلسکرینەکە هاواری کرد: سمیس -٧٩-٦- سمیس: بەڵێ تۆ زیاتر بچەمێوە بەیارمەتیت.. ئەگەر بتوانیت وابکەیت باشتر هێشتا بەرەو خوارتر هەوڵدەدەی.. ئەی هاوڕێ ئەمە چاکترە.

جەستەی ونستون سمیس لەئارەقدا شەلاڵ بوو. بەڵام سیمای هەر بەهێمنی مایەوە بێ هیچ گوزارشتێک نە توڕەبوونێکی دەرخست. نە پەسپتوون، چونکە تەنها چاوتروکانێک ئابڕووت دەبات.

خەڵک لەولاتانی شیوعی بەو شێوەیە دەژین، لەژێر سایەی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ئەوەی کە هەموو حزبە شیوعییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ترسێکی بەردەوام، گومانێکی بەردەوام باوک متمانەی بەکوڕ نییە، خۆزگە شیوعیەت ئەو بەهەشتەی دەهێنایە دی بۆ خەڵک: خواردن بۆ برسیان، پۆشاک بۆ روت و رەجاڵەکان وەک ئەوەی جیاوازی لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵ نەبێت، ئەگەر خواردن بۆ مرۆڤ هەبێت و ئاو بخواتەوە و پارچە پەرۆیەک هەبێت بیپۆشێ، ئەگەر هەموو پێداویستیەکانت پێ دا. مرۆڤ زیاتر لەمە چی دەوێ .

بەڵام تاک لەکۆمەڵگای شیوعی ئەوە بەدەست ناهێنێ، راستە هەندێک کەس لەولاتانی شیوعی خواپێداون، بەڵام خواپێداوان لەولاتانی سەرمایەداریش هەیە، تەنانەت ئەوان لەسەردەمی تاوانبار نوری سەعیدیش هەبوون، بەڵام کەمینە بوون لەژێر سایەی تیرۆری

شیوعیدا لەبری ستەمی بەگ و شێخ و ستەمی هاوڕێ و خاتوی هاوڕێیمان هەڵبژارد.

لەدوایین وتارم چەند بەشێکی رۆمانە نایابەکەی ئۆرویلم بۆ دەرخستی کە (١٩٨٤)ە، لەگەڵ منیش ئەو لێکچوونە زۆرەت بینی کە لەنێوان ئەوەی نووسەر خەیاڵی بۆ دەکات لەژێر سێبەری رژێمی شیوعیەت لە ١٩٨٤ رووبدات، لەگەڵ ئەوەی کە بەراستی لەرۆژگاری مۆتەکەی سووردا لەعێراق روویداوە، مرۆ لەو لێکچوونە سەیرەدا تووشی شۆک دەبێت, کە چۆن ئۆروێل توانیویتی خەیاڵی ئەو شتانە بکات؟

مەسەلەکە زۆر سادەیە. دەتوانی خەیاڵی لەمەش سەیرتر بکەیت, کاتێک هەموو بەها و پێوەر و ویژدان و متمانە و ئاکار تێکدەشکێنرێن، یان کاتێک هەقیقەت دەمرێت و درۆ سەردەکەوێت، یان لەوەی سیخوری بڵاودەبێتەوەو وا گوزراشتی لێدەکرێت کە گوایە ئەرکێکی نیشتمانیە، یان ئەوکاتەی کە رق شوێنی خۆشەویستی دەگرێتەوە، ئەوکاتەی کە نکۆڵی لەرابردوو دەکرێت و بەهەموو جوانییەکانەوە، تەواو هاوشێوەی ئەوەی شیوعیەکان لای ئێمە ئەنجامیان دا، گوایە رابردوومان تەنها رژێمی پێشووە شۆرشی بیست نییە، رۆژگارەکەی مەئمون و رەشید نییە، ئازادکردنی عێراق نییە لەدەسەلاتی فارسەکان، گوایە رابردووی ئێمە هەڵسانەوەی پێغەمبەری عەرەب نییە، ئەو منداڵە هەتیو و هەژارە، کە ناوی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلایە، ئەوەی کە پەیامە مەزنەکەی هەموو زوڵم و ستەمکاری و ئیمپراتۆرە مەزنەکانی ریشەکێش کرد. لەگەڵ

ئەوەشدا خەیاڵی نووسەر هەرچەندە وێنای خراپترین شتی کردووە، کە دەمرێت روودەدات، بەڵام نەگەیشتۆتە ئەوەی درک بەمە بکات کە هاوڕێیە زۆر بەشەرەفەکان لەعێراقدا ئەنجامیان داوە. سەرەڕای ئەوەی ئۆرویل لەیەکێک لەبەشەکانی کتێبەکەیدا وێنەی ئەشکەنجەدانی زیندانییەکان و دەستگیرکراوەکانمان نیشان دەدا, بەڵام ئەو تۆقاندنەی کە دکتۆر شاکر مستەفا سەلیم لەکتێبە گرنگەکەی دەیگێڕێتەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ئۆرویل، دەبێت بڵێین ئەوەی ئۆرویل لەچاو ئەوەی شاکر وەک میوە و شرینیە کاتێک بەخواردنێکی چەور و قورس بەراورد بکرێت.

ئۆرویل چۆن دەتوانێ وێنای ئەوە بکات, کە مرۆڤێک یان نیمچە مرۆڤێک تەنانەت ئاژەڵێک رێگەبەخۆی دەدات دایک یان باوکی منداڵێک بکوژێت، دواتر دەستی منداڵە خەوتووەکە ببڕێت کە لەبێشکەدایە, ئینجا مەمکی بڕاوی دایکی بخاتە دەمیەوە؟ هاوڕێیانی بەشەرەف و لایەنگرانی ئاشتی و دیموکراسی لەشاری کەرکووکی زامداردا ئەمەیان ئەنجام دا. یان چۆن دەتوانرێت پیاوێک کە خۆی لەژن لەدایکبووە، یان برای ژنێکە ژنێک لەدارێکدا لەخاچ بدات و بزماری لەجەستە بدات؟ کەچی رۆڵەکانی حزبی فەهد ئەمەیان لەموسڵ ئەنجام دا، بۆ ئەو نووسەرە باشتر لەڕۆژگاری مۆتەکەی سووردا ماوەیەک لەعێراق بژی، بۆ ئەوە بەچاوانی خۆی کە کوشتن و سوکایەتیکردن بەتەرم و رەنگەکانی دیکەی تاوانی شیوعی ببینێ، ئینجا بگەڕێتەوە وڵاتەکەی و رۆمانەکە سەرلەنوێ بنوسێتەوە.

ویسنتۆن لەنوسینگەکەی خەریکی کارەکەی بوو لەساختەکردنی مێژوو و خنکاندنی هەقیقەت و دروستکردنی درۆ. کاتێک نامەیەکی لە

لقە دەسەڵاتدارەکەی فەرمانگەکەی پێگەیشت کە دەڵێ "پەیامی ڕۆژانەی براگەورە کە لەتایمزی ڕۆژی ٣ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٣ بڵاوکراوەتەوە، زۆر نابەدڵە, چونکە ئاماژەی بۆ کەسانێک تێدایە نەماون، بەتەواوی جارێکی دیکە بینوسەوەو بەر لەبڵاوکردنەوەش، ڕەشنووسەکەی بەدەسەڵاتی باڵا بدە.

ونیستون ئەو پایەمە ناوبراوەی خوێندەوە, بەڵام ئەو پەیامە بەشێوەیەکی سەرەکی تایبەتە بەستایشکردنی کارەکانی ئەو ڕێکخراوەی کە بە(ئێف، ئێف، ئێس، ئێس) ناسراوە، کاری ئەو ڕێکخراوە ئەوەیە کە کۆمەکی درباوە ڕێنشاندەرەکان دەکات بەجگەرە و کەلوپەلی دیکە، بەتایبەتیش براگەورە ستایشی هاوڕێیەک دەکات کە بەویزرس ناودەبرێت، ئەوەیان ئەندامێکی دیاری لیژنەی مەرکەزی حزب بوو، لەلایەن براگەورەوە میدیالیاشی پێدرابوو.

کەچی دوای سێ مانگ ئەو ڕێکخراوە لەناکاو هەڵوەشایەوە، بێ ئەوە هۆکارێک دیار بێت، مرۆ دەتوانێ گریمانەی ئەوە بکات کە ویزرس و هاوڕێیەکانی ئێستا کەسانێکی بێزراون، بەڵام شتێک سەبارەت بەمە لەڕۆژنامەکان و تیلسکرین باسنەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا مرۆ دەتوانێ پێشبینی ئەوەش بکات, چونکە تاوانبارە سیاسیەکان لێرەدا نادرێنە دادگا و لەبەرامبەر گەل لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت. پرسەی پاکردنەوەی گەورە کە هەزاران بەئاشکرا هەزاران کەس دەگرێتەوانە لەوانەی تاوانباری فیکر و ناپاکن و دانیش بە تاوانەکەیان دەنێن لە دووساڵ تەنها جارێک ئەنجام دەدرێت. بەڵام ئەوەی باوە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە حزب نیگەران دەکات،

لەناکاو ون دەبن و کەسێک جارێکی دیکە شتێکیان لەبارەوە نابیستێ، پیاو کلێکی لەدەست نابێت تا سۆراخیان بکات، تەنانەت لەهەندێک حاڵەتدا لەوانەیە نەمردبن، وینستون نزیکەی سی کەس دەناسێ کە یەک بەدوای یەک ون بوون، ئەمە جگەلە دایک و باوکی.

ونستۆن لەناخی خۆیدا پرسیاری لەو هۆکارە دەکرد کەوایکردووە ویزرس بێزراو بێت، لەوانەیە براگەورە بیەوێت لەهاوڕێکانی نەجاتی بێت. ونستۆن بیری لەوەدەکردەوە کە پەیامەکەی براگەورە چۆن دابڕێژێتەوە، دوای ئەو ئاماژانە دەسرێتەوە کە بۆ ویزرس کراوە؟ لەناکاو بیری بۆ لای وێنەیەک چوو کە هی هاوڕێ ئوگلیڤی بوو، کە بەمدواییە لەجەنگدا لەبارودۆخێکی پاڵەوانێتی مردوووە. راستە کەسێک بەناوی هاوڕێ ئوگلیڤی بوونی نەبوو. بەڵام چەند دێرێک و دووو وێنەی فۆتۆگرافی ساختە بێ ئەوەی بزانرێت بوونی ئەو دەسەلمێنن، جا پەیامەکەی براگەورە تایبەت دەبێت بەسەرفرازکردنی هاوڕێ ئوگلیڤی. وینستون دەستی پێکردو نووسی:

کاتێک ونستون تەمەنی سێ ساڵ بوو، هەموو یارییەکانی رەتدەکردەوە, تەنها دەهۆل و چەکێکی تۆبهاوێژ نەبێت, کە ئەوانەی منداڵان یاری پێ دەکەن لەگەڵ فرۆکەیەکی هیلکۆپتەری نموونەیی، کاتێک تەمەنی بووە شەش ساڵ چووە ریزی رێکخراوی جاسووسان، لەتەمەنی نۆساڵی سەرۆک بەشبوو، لەتەمەنی ١١ ساڵی هەواڵی لەسەر مامی دا لەلای پۆلیسی هزر، کاتێک گوێ لەیەکێک لەگفتوگۆکانی مامی بووە بە رووێک لەرووەکان ئارەزووی تاوانی تێدا بەدیکردووە دژی حزب، لەتەمەنی ١٧ ساڵی دەبێتە رێکخەری

ناوچەیەکی کۆمەڵەی دژە سێکس، لەتەمەنی ١٨ ساڵی پێشنیاری نموونەی نارنجۆکێکی کرد، کە وەزارەتی ئاشتی بەدیهێنا، ئەو نارنجۆکەش ٣١ دیلی ئۆراسی کوشتن لەکاتی تاقیکردنەوەدا.

لەژووری خواردنی سەر بە فەرمانگەکە کاتێک وینستۆن لەگەنێکی سینیەکی بەدەستەوە بوو, شوێنی خۆی لەڕێزی چاوەڕوانکردن دەکردەوە، لەدواوە دەنگێکی بیست کە هاواری دەکرد: ئەوە ئەو پیاوەیە کە بەدوای دەگەڕێم. کە ئاوڕی دایەوە سیمی بینی، سیم یەکێک بوو لەبرادەرەکانی.

نەخێر. وشەی برادەر وشەیەکی گونجاو نییە, تۆ لەڕۆژگارێک دەژیت برادەری بۆ تۆ تێدا نییە، هاوڕێ نەبێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ هەندێک هاوڕێ خۆشترە لەچاو هەندێکی دیکە، جا سیم یەکێک بوو لەوانە. سیم گوتی: دەمویست پرسیاری ئەوەت لێ بکەم کە موسی ریشتاشینت هەیە.

ونستۆن وەڵامی دایەوە:.. لەزۆر شوێن بەدوای گەڕام بەڵام بێ سوود بوو. موس نەماوە، خەڵک هەموویان لەیەکتریان دەپرسی کە ئایا موسیان هەیە، لەدوو مانگی رابردوودا موس قڕان بوو، کۆگاکانی حزب و دوکانەکانی زۆرجار ئەو کەلوپە پێویستانە لای دەبڕا، تا پێت بدات. جارێک قۆپچە و جارێک دەزوو، جارێکی دیکەیش قەیتانی پێڵاو.

ئەی شتێکی لەمجۆرە لەعێراقیش رووی نەدا. بەڵێ لەعێراق، هەرچەندە شیوعییەکانیش لەدەسەڵات نین، هەموومان ئەوەمان لەبیرە کە بازاڕەکان خاڵی بوون لەجگەرەی تورکی، چونکە هاوڕێیان ویستیان کرێکارانی جگەرە لەبری ئەوەی کار بکەن، خەبات بکەن،

بۆیە وام لێهاتبوو کە جگەرە گرانەبەهاکەی ئینگلیزی بکێشم هەرچەندە من بێکاربووم و فەسلکراو بووم.

شیوعییەکان پەنایان بردۆتە بەر فێڵێک وادەزانن بەسەرمانەوە تێدەپەڕێت. ئاستی بەرهەم هێنان لەهەموو کارگە و دامەزراوەکان دابەزیوە، ئەویش لەئەنجامی ئەوەی کە هاوڕێیانی شەرفمەند هاوڕێیان، کرێکارەکان بەرەو خەبات و خۆپیشاندان و گردبوونەوە و فیستڤاڵ و کۆبوونەوە دابەشکردنی بەیاننامە و کۆکردنەوەی کۆمەک و ئیمزا دەبەن، ئەی چی بکەن بۆ ئەوەی گەل هەڵبخەلەتێنن گوایە بەرهەمهێنان زیادی کردووە؟

ئەوان چوونە لای کرێکارانی شالجیە و ئامۆژگاریان کردبوون، کە ماوەی هەفتەیەک بەجددی و دڵسۆزی کار بکەن، کرێکارەکانیش ئەوەیان کردبوو زۆر بەئاگایی و دڵسۆزییەوە ماوەی هەفتەیەک کاریان کردبوو، شیوعییەکان ژمارەکانیان تۆمارکردبوو و ئاماری پێویستیان دروستکردبوو، دەرکەوتبوو کە ئاستی بەرهەمهێنان لەماوەی ئەو هەفتەیە زیادی کردووە.

ڕۆژی دواتر ڕۆژنامەکانی هاورێیان بە پیتی زەق نووسیبویان: زیادبوونی ڕێژەی بەرهەمهێنان لەکارگەکانی شالجی، هەفتەکە تەواو بوو کرێکارانی خەباتگێر هاتنەوە سەربەزمی خۆیان، بەمشێوەیە مێژوو ساختە دەکرێت و گەل تەفرە دەدرێت، ئەمیش بەچاکەی هاورێیانی بەشەرەف، کە درۆ وفێڵ لەناویان بڵاوبۆتەوەو لەخوێنیان سور دەخواتەوەو تەنانەت فێڵ لەخۆشیان دەکەن.

بزووتنەوەی شیوعیەت لەهەموو دونیا ئێستا لە ڕەوتی خۆی کورتی هێناوە، بەڵام هاورێیانی عێراق ئامادە نین دان بەو ڕاستیە بنێن، بۆیە دەبینی ئەوان بەتایبەتی لەوکاتەدا هەڵدەستن کوشتار و دەستدرێژی

ئەنجام دەدەن و بەرپەرچی نەیارەکانیان دەدەنەوە، بەرپەرچدانەوەی قەومییەکان لەوکاتەدا کە رەوتی قەومیەکان لەعێراق لەهەڵکشاندایە، کاریگەری بەسەر قەومییەکانەوە نابێت، کاریگەری بەسەر شیوعیەکانەوە دەبێ ئەگەر بزانن، چونکە بەمە قین دژ بەخۆیان دەخەنە دڵی گەلەوە، ئەم قینەش زیاد دەکات تا دەگاتە ئاستی تەقینەوەو ئەو کاتەش خوا لەئاسەواری شیوعییەکان نەجاتمان دەدات.

لەدەستپێکی ئەو وتارە دەمەوێ موژدەیەک بە هاورێیانی بەشەرەف بدەم ، ئەوان بە موژدەکەم دڵخۆش دەبن، دەسەڵاتدارانی بەرپرس لە بەسرا ٢٠ ئێرانیانٰ لەئەندامانی حزبی تودە دەستگیرکردووە، کاتێک دەیانویت لە نزیک تنومە بێنە خاکی عێراقەوە، من گلەیی لە شیوعییە ئێرانییەکان ناکەم کە دڵخۆش دەبن هاورێیانیان لە حزبی شیوعی عێراق بەدڵی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن و لە خۆپیشاندانی گەورە دەردەکەون و لە هەرشوێنێک بیانەوێت کوشتارگە ئەنجام دەدا، بەپەت تەرمی هەر نەیارێکی شیوعی پەلکێش دەکەن و درۆ و دەلەسە لەدژی هاوڵاتیانی بەستەزمان بڵاودەکەنەوە.

ئێمە وەک حزبی شیوعی عێراقی دڵخۆش بووین کاتێک ئەستێرەی حزبی بەکرێگراو، حزبی تودە لەئێران دەرکەوت، دڵخۆش بووین بەوە کاتێک هاورێ پەیمان تەقەی لەپۆلیسە ئێرانییەکە کرد، دڵخۆش بووین کاتێک قاچی ئەو پۆلیسە بڕایەوە و برین پێچەکە کە هاورێیەکی شەریف بوو قاچەکەی دایە سەگ، سەرەرای ئەمانەش چووینە لایەن بۆ ئەوەی لە خەباتی ئەوان بەشدار بین.

ئەی شیوعیەت نێونەتەوەیی نییە؟

کەواتە لەسەرتە لە هەر شوێنێک دواکەوتوویی هەبێت دژایەتیان بکەیت، لە ئێران و لە عێراق یان لەئیسرائیل، یان هاوکاری هاورێیانی بەشەرەف بیت لەهەر شوێنێک بن لە ئێران و لەعێراق یان

لەئیسرائیل، بەڵام هاورێیانی لەکاتی هاتنیان بۆ عێراق هەڵەیان کرد، پێویست بوو کاتێک دزە بکەن کە رەوتی شیوعی لە لوتکە بوو، نەوەک ئێستا کە رووباری شیوعی لێل بووە، بەڵام نازانین؟ لەوانەیە بۆ هاوکاری هاورێیە عێراقییەکان هاتبن کە لە مەینەتی دان.

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر رۆمانەکەمان بۆ ئەوەی لەو وتارە پوختەکەی تەواو بکەین:

ونستون لەگەڵ سیمی هاوڕێی باسی چاپی یانزەمی فەرهەنگی قسەی نوێ ی دەکرد، کە بڕیارە شوێنی فەرهەنگی زمانی ئینگلزی کۆن بگرێتەوە، زمانی رەجعیەکانی بەر لە ١٩٨٤، شوشر و شکسپیر و ملتۆن و بایرۆن هەموو ئەو شاعیرە مەزنانە وەرگێردرانە سەر قسەی نوێ یان زمانی نوێ، هەموو کۆپیەکانی دووانە چاپکراوەکانیان بە زمانی رەجعی کۆن لەناوبرا.

نیگایەک بە ناخی ونستون رووچوو کە لەلایەن ئەوکچەوە هات لە مێزەکەی تەنیشتیەوە دانیشتبوو، ونتسون ئاوری دایەوە تا ئەوکچە ببینێ، هەمان ئەوکچە بوو کە پشتێنەیەکی پەمەیی بەستبوو، لەوە دەترسا ئەو کچە یەکێک بێت لە پۆلیسەکانی خەیاڵ، لەوانەشە هەو نەبێ،هاورێیەکی تر کە بارسۆن بوو لەسەر مێزەکە پرسیاری لێکرد: پێت بڵێم دایک وباوکم چیان کرد کاتێک ئاگریان لەکراسی ئەو پیرەژنە بەردا کە لەبازار بوو،چونکە بینیبوایە ئەو پیرەژنە کاغەزێک بەدەوری گۆشتێکی سورکراوە لولداوە لەکاغەزەکە وێنەی براگەورە هەیە، بەدوای دەکەون و لەدواوە بەهۆی شخارتەوە ئاگری تێبەردەدەن، ئێستا ئەوان لەگەڵ سیخورەکان مەشقێکی باشیان پێدەکرێت.

ونیستون دەخولایەوە، گیانی پەست ببوو، شەویکیان پییەکانی ئەویان بردە ئەو دوکانەی کە کەلوپەل دەفرۆشێت و ونستونیش دەفتەری یاداشتەکانی لەودوکانە کڕیبوو. تووشی ترسێکی گەورە دەبێ، کارێکی زۆر دەبەنگانە بوو کە دەفتەری یادگاری کڕیبوو، سوێندیشی خواردبوو کە جارێکی تر نزیکی ئەو دووکانە نەبێتەوە، بەو تێگەیشتنەی کە لەو لەناو دوکانەکە بێ زیاتر سەلامەت دەبێت نەوەک لەدەرەوە، بەوشێوەیە چووە ژوورەوە ئەگەر پرسیاریش کرا، دەڵێ بۆ موسی ریشتاشین هاتووە.

خاوەنی دوکانەکە کە تەمەنی نزیک شەست ساڵ دەبوو ناسیوە پرسیاری ئەوەی لێکرد کە چۆن دەتوانێ خزمەتی بکات، بەڵام ونستون پێی گوت بۆ مەبەستێک نەهاتووە، خاوەنی دوکانەکە وتی" بەینی خۆمان بێ بازرگانی بە شوێنەوار و توحفە لەسەر نەمانە، پیاوەکە توحفەیەکی بە ونستۆن نیشان دا، لەشێوەی قەبارەیەکی گەورەی شوشە نزیکەی نیوە تۆپێک دەبێ، لەناوەوەی شتێکی سوور هەیە لەوانە گوڵ یان رووەکێکی دەریا بێ، ونستون وتی" ئەوە جوانە" فرۆشیارەکە وەڵامی دایەوە: جوانە بەڵام کەسێک نییە ئەمڕۆ ئەوە بڵێ.

ئەو دوو پیاوە لەبارەی توحفە کۆنەکان وگەڕانی مرۆڤ بەدوای جوانی و سود بینین لەهەرشتێک قسەیان دەکرد، لەبارەی کتێب و کەلوپەلی ناو ماڵ دواتر بۆ ونستون قسەی لەبارەی ئەو ژوورەی خۆی کرد کە کەلوپەلێکی جوان و کۆنی تێدا، ئەو ژووەرە لەسەربانە، چوون سەیریان کرد، ونستون بە دەنگی بیستراو تێبینی ئەوەی کرد کە ئەوێ تلسکرینی تێدانیە، پیاوەکە وتی" من هەرگێز ئەو شتانەم نەبووە."

رۆژێکیان لەرێڕەوی باڵەخانەی وەزارەت ونستون چاوی بە کچەی پشتێن پەمەیی کەوت کەبەرەو رووی دەهات، کاتێک لێی نزیکبووە تێبینی ئەوەی کرد قۆڵەکانی کچەکە پێچرابوو، چەند هەنگاوێک مابوو کاتێ هاواری کرد و کەوتە سەرزەوی ونستۆنیش کچەکەی هەڵگرتەوە، کاتێک لەهەڵسانەوە هاوکاری کچەکەی دەکرد، کچەکە کاغەزێکی پێچراوی لەناو دەستی دەگوشی، کاتێک کچەکە رۆیشت ، ونستۆن کاغەکەی کردووە لێی نووسرابوو " خۆشم دەوێی" بەڵام چۆن دەگاتە کچە،ژوانێک دادەنێ؟ ئەمە ئەوکێشەیە بوو کە خەیاڵی داگیرکرد بوو.

ئەو هەلەی بۆ رەخسا کاتێک بینی لە پاشخانی فەرمانگەکە لە چێشتخانە لەسەر مێز دانیشتووە، لەتەنیشت ئەوکچە دانیشت. ئەو دیدارە سەرەتای کۆمەڵێک دیداری تر بوو لە دەوەن و دارستان، ئێستا زانیویەتی ناوەکەی جولیلیە، چاودێر و تلسکرینی نییە، لەو کچەی پرسی بۆ خۆشی ویستووە، کچەکەش وتی"من کارەمەم لە ناسینی ئەو کەسانەی ئینتمایان نییە، تۆم بینی زانیم کە دژی ئەوانی."

ونستون قسەی لەگەڵ خاوەن دوکانەکە کرد بۆ ئەوەی ژوورەکەی سەرەوەی بە کرێ پێ بدات، ئەویش رازی بوو ونستون و جولیا بەیەک گەیشتن و لەسەر قەرەویلەی ژوورەکە بەیەکەوە راکشا، قاوەی راستەقینەی بۆ دەهات کە کەسێک ناتوانێ بەدەستی بهێنی ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی حزب نەبێ، لەیەکێک لە خزمەتکارەکانی کرێ، جولیا بەلێنیشی دا کە کراسێکی راستەقینەی ئافرەتان لەبەر بکات، لەبری ئەو پانتۆڵەنە نەفرەت لێکراوە.

رۆژێکیان ئوبرین هاتەلای، قسەی لەبارەی ئەو نوسینەوە کرد کەونستون نوسویەتی، ئەو لەنوسینەکەی دوو وشەی بەکارهێناوە کە ئێستا پوچەڵ بوونەتەوە، پرسیاری ئەوەی لێکرد کە ئایا چاپی

دەیەکەمی فەرهەنگی زمانی نوێی بینیوە، ئوبرین ناونیشانەکەی بە ونستوون دا، داواشی لێکرد لەماڵەکەی سەردانی بکات و دانەیەکی فەرهەنگەکەی پێ بدات، ئەوە پاساوێکە بۆ پەیوەندیکردن بەمنەوە، ونستون وەها بیری کردەوە، ئەو لەگەڵ جولیا سەردانیان کرد، لەماڵی ونستون ئوبرین توانی مەی بخواتەوە، مەی یەکێک بوو لەوشتانەی کە بەتەواوی لەناوچووبوو.

لەبارەی گۆلدشتاینەوە پرسیاری لە ئوبرین کرد، ئایا ئەو بوونی هەیە؟ ئوبرین بە ئەرێ وەڵامی دایەوە، دواتر پرسیاری لەبارەی ئەو رێکخراوەی دژە رژێم کرد کە بە(برایان) ناسراوە،، ئوبرین پرسیارەکانی خۆی ئاراستەی ونستون کرد، ئایا ئێوە ئامادەن قوربانی بەژیانی خۆتان بدەن؟ ئایا ئێوە ئامادەبن کوشتن ئەنجام بدەن؟ ئایا ئێوە ئامادەن کاری تێکدەرانە بکەن ببێتە هۆی مردنی سەدان بێگوناه؟ ئایا ئێوە ئامادەن بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی بێگانە خیانەت لە وڵاتەکەتان بکەن؟ ئایا ئێوە ئامادەن فێڵ بکەن وساختە بکەن و دزی بکەن، ئامادەن مێشکی منداڵان تێک بدەن، یان ماددەی هۆشبەر بڵاو بکەنەوە و هانی لەشفرۆشی بدەن، نەخوشیە بڵاوبکەنەوە، ئایا ئامادەن بەهەر شتێک هەڵسن کە هەیبەتی حزب بشکێنێ و هێزەکەی لاواز بکات، هەردووکیان بە بەڵێ وەڵامیان دایەوە.

دواتر پرسیاری کرد: بۆ نموونە لەوانەیە کارەکە وا پێویست بکات، ترشەلۆکی سلریک بەدەموچاوی منداڵ بپرژێنین ئێوە بۆ ئەمە ئامادەن؟ بەڵێ. دواتر پرسیاری کرد: ئایا ئێوە ئامادەن کە جیانەبنەوە، بەوەشێوەیە نەبێ کە هەرگیز یەکتر نەبیننەوە، جولیا هاواری کرد نەخێر، ونستونیش بەهەمان شێوە.

ڕۆژێکیان هەردوو عاشقەکە لەسەر قەرەویلەکەی ژووره راکشابوون، لەناکاو هەڵسان و لەلای پەنجەرەکە وەستان، لە گۆرەپانێکی نزیک ژنێک جلوبەرگی دەشوشت، گۆرانی دەگوت، ونستون گوێی لەوگۆرانیە دەگرت و بیری لە خۆشەویستی و ئاییندەی خۆی دەکردەوە، ڕۆژێک پولیسی خەیاڵ راویان دەکات، ئەو کاتە کۆتاییان پێدێت، ناشتوانن هەرگیز لە پۆلیسی خەیاڵ نەجاتیان بێ.

لەدڵ خۆی دا وتی، ئێمە مردووین هەرچەندە وەک زیندوو دەردەکەوین، پێشتر مەحکومیین بەمردن، بەدەنگێکی بەرز وتی" ئێمە مردووین" گوێی لەدەنگێک بوو دەیگوت" هەردووکتان مردوون" ئەمە تلسکرینەکە بوو، لە ژوورەکەدا لەپەشتی یەکێک لەوێنەکان حەشار درابوو، دەنگێکی زبر لەتلسکرینەکەوە هات، لەشوێنی خۆتان بمێننەوە، نەجوڵێن تا فرمانتان پێدەکرێـت، هەردووکیان بەچاوەڕوانی وەستان، شووشەی وێنەکە کە تلسکرینەکەی لەپشتەوە بوو شکا، تلسکرینەکە دەرکەوت، دەنگەکە هاواری کرد، ئێمە ئێستا دەتوانین ئێوە ببینین، لەناوەندی ژوورەکە بوەستن و دەستان لەسەر سەرتانەوە لەیەکتر گیر بکەن، پشت لەیەکتر بکەن.

گوێیان لەدەنگی پێیەکان بوو کە لەسەر پەیژەکەوە سەردەکەوت، ژوورەکە پر بوو لە پیاوانێک کە جلە رەشەکەی حزبیان لەبەردابوو، ئێستا هەموو بابەتەکان بۆ ونستون روونبووە، خاوەنی دوکانەکە کە لەبارەی شتە جوانەکانەوە قسەی بۆ دەکرد و دەفتەری یادگاری فرۆشتە ونستون، ژورەکەی بەکرێ پێدا، ئەو سیخورێکە لەسیخورەکانی پۆلیسی خەیاڵ؟.

ونستون بۆ لایەک بردرا، جولیان بۆ لایەکی تر، لەوێ ونستون چەندین جۆر ئەشکەنجەی جەستەیی و دەروونی بینی کە ئەگەر بێت قسەی لەسەر بکەین ناچار دەبین چەند بەشێک لە ڕۆمانەکە

وەربگیرێن، بەڵام کێ ئەشکەنجەی دەدا؟ ئۆبرین؟ بەڵێ خودی ئۆبرین.

ئۆبرینیش یەکێک بوو لە سیخورەکانی پۆلیسی خەیاڵ، توانی فیلێ لێبکات و راوی بکات، رۆمانەکە کۆتایی دێت وونستون نامرێ، بەڵکو گیانی دەمرێ، بەرگری ئەو دژی حزب بەتەواوی وردوخاشکرا، لە کۆتایی دا ئەویش بووە ئامێرێک لە ملیۆنان ئامێری تر کە حزبی بەخاوستی خۆی بەکاریان دەهێنێ، ونستون وایلێهات براگەورەی خۆشدەویست

لەو سەروبەندەدا هاورێ ئەبو سەعید هاتە بەسرا، کە بۆ ئەرکێکی فەرمی لەلایەن فەرمانگەکەی نێردرابوو، بەدوای من گەڕا منی دۆزییەوە، شەوێکیان کە لەسەر خوانێکی پڕ لەبوتڵی عەرەق بووین، ئەبو سەعید کە ئێستا هاوڕێیەکی گەورەیە باسی بزووتنەوەی ئاشتیخوازی بۆ کرد کە پێویستی بەمن و نموونەی کەسانی وەک منە، هانی دام کە بەسرا جێبهێڵم و لەبەغدا جێگیر بم بۆ ئەوەی بەشداری لەو بزووتنەوە مەزنە بکەم.

ئەوکاتە حزبی شیوعی عێراقی بڵاوکراوەیەکی دەرکرد کە تێیدا هانی هاوڵاتیانی دا بەسەرجەم باوەڕ و ئاین و نەتەوە و سیاسەتە جیاوازییەکانیانەوە ئیمزا لەسەر بانگەوزای ئاشتی بکەن کە لەکۆنگرەی ئاشتی لەستۆکهۆلم درابوو، وەک پێویست بوو بزووتنەوەی ئاشتیخوازی بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ بێ، پەیوەندی بەهیچ حزبێکەوە نەبووە، بەتایبەتی حزبە شیوعییەکان، ئەنجومەنی جیهانی ئاشتیش سێ کەسایەتی عێراقی غەیرە شیوعی هەڵبژاردبوو، بۆ ئەوەی لە لیژنەی نیشتمانی بۆ پارێزگاری ئاشتی ئەندام بن، هەرچەندە ئەوان چەپ بوون بەڵام شیوعی نەبوون، یەکێک لەسێ کەسە هێلە سەرەتاکانی بۆ بانگەوازەکە دادەنا و هەوڵی کۆکردنەوەی ئیمزای کەسایەتیە دیارەکانی ناو بواری ئەدەب و سیاسەت دەدا لەسەر بانگەوازێک، کەچی لەوکاتە حزبی شیوعی لەلایەکی تر بەیانە مەزنەکەی دەکرد.

هەر ئەوکەسایەتیەی لیژنەی کاتێک بە سەرزەنشتەوە باسی بڵاوکراوەکەی شیوعی دەکرد وتی: دەچومە لای مامۆستا(ف، ا) قسەم لە بارەی بزووتنەوەی ئاشتیخوازی کرد داوام لێدەکرد بەشداری تێدا بکا و ئیمزا لەسەر ئەو بەیاننامەیە بکات کە ئاراستەی گەلی عێراقمان کردووە، من جەختم لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بزووتنەوەی ئاشتی هیچ پەیوەندییەکی بە حزبی شیوعیەوە نییە، کەچی بەیاننامەکەی شیوعی کەباسی ئاشتی کردووە لەگیرفانم دا بوو، دوعای ئەوە دەکەم بەیاننامەکەی نەدیبێ.

بۆ نموونە ئاشتیخوازان لە سوریا بەسەرکەوتوویی کۆمەڵێک ئیمزای کەسایەتیە دیارەکانیان نموونەی مەعروف دوالیبیان کۆکردبۆوە کە بە تەواوی لە شیوعیەت دوور بوون، کەچی لەعێراق حزبی شیوعی عێراق بە هەڵسۆکەوتە زیرەکەکانی توانی ئەو رێگایە لە لایەنگرانی ئاشتی بری و تەنها بزووتنەوەی ئاشتی لەلای ئەندام و لایەنگرانی حزبی شیوعی مایەوە. من و کۆمەڵێک لە زیندانیانی شیوعی کە هاتبوونە نەخۆشخانەی سنگ، مشتومڕمان لەسەر ئەو بابەتە کرد، من گلەیی خۆم لەسەر ئەو هەڵوێستەیان ئاراستەی حزبی شیوعی کرد کە ئەوکات تێیدا ئەندام بووم. کەچی هاورێیان بەوشێوەیە وەڵامیان دامەوە: دەبوایە ئەوە بکات، دەبێ رولی مێژوویی خۆی تۆمار بکات.

رولی مێژوویی خۆی تۆمار بکات! بەچەند کارێک هەڵدەستێ کە لە ئەنجام دا زیان بەر بزووتنەوەی نیشتیمانی و بەرژوەندییە نیشتمانیەکان دەکەوێت لەپێناو ئەوەی لە کتێبێک لە کتێبەکان کە دوای بیست ساڵ لەبارەی حزبی شیوعیەوە دەردەچێت بنووسرێت، حزبی شیوعی عێراقی بە رۆڵی مێژوویی خۆی هەڵساوە، یەکەم کەس بوو کە دروشمی ئاشتی بەرزکردەوە و ئەوبزوتنەوەی پێکیهێنا، وەک ئەوەی بریار لە مۆسکۆ بۆ حزبە شیوعییەکان دەرنەچووبێ بۆ

ئەوەی دروشمی ئاشتی بەرزبکەنەوە و بزووتنەوەی ئاشتیخوازی دروست بکەن.

شیوعیەکانی عێراق بزووتنەوەی ئاشتیان زیاتر داماڵی، تەنانەت یەکێک لە هاوڕێ گەورەکان جارێک وتی: بزووتنەوەی ئاشتیخوازی هۆکارێکە بۆ بڵاوکردنەوەی سۆسیالیز لە جیهان.

هاوڕێ ئەبو سەعید گەڕایەوە بەغدا، چەند ڕۆژێکی دواتر من لە بەسرا مامەوە، دواتر مۆڵەتێکم لە کۆمپانیای نەوتی بەسرا وەرگرت و چوومە بەغدا، لەمەسەلەی مانەوە لە بەغدا دوودڵ بووم، ئایا کارەکەم لەبەسرا جێبهێڵم بۆ ئەوەی لە بەغدا بێکار بژیم و منیش نە فلیس ونەدینارێکم هەیە؟ ئەبوسەعید پێداگری دەکرد کە لە بەغدا بمێنمەوە، مۆڵەتەکەم تەواو بوو منیش هەر لەبەغدا ماومەتەوە، دوای دوو ڕۆژ ئەبو سەعید هات، کەلوپەلەکانی هەڵگرت و منی بردەوە ماڵ، بەوشێوەیە من لەو شەوە لەسەر جێگایەکی نامۆ خەوتم نانی خەڵکی بێگانەم خوارد.

کارکردنم لە بزووتنەوەی ئاشتی کارێکی ئازاربەخش و بەشەکەت بوو، چەندین کاتژمێر لەو ڕۆژانە گەرم لە چایخانەکەی حەسەن عەجمی دادەنیشتم بە کاربۆن هەزاران ناوم لەوناوانەی ئیمزایان کردووە کۆپی دەکرد کە لەسەر بانگەوازی ئاشتی کرابوو، دواتر کە تەواو دەبووم بە ڕاکردن بۆ نووسینگەی ڕۆژنامەکان دەچووم بۆ ئەوەی کۆپیەکیان پێ بدەم و ئەوانیش بڵاوی بکەنەوە.

دوای ئەمەش وەک وەرگێر لە ڕۆژنامەی ئیتحاد کە هی مامۆستا ناجی عوبەیدی بوو کارم دەکرد، ئەو پیاوە مرۆڤێکی نیازپاک و باش بوو، ئێمەی شیوعی بەمەبەستی خۆمان بەکارمان دەهێنا، لەوانە هەواڵساز هەواڵەکانی لە ئێزگەی مۆسکووە دەگواستەوە، منیش ئەو

وتارانەم وەردەگێرا، کە لە گۆڤارە سۆڤیەتیەکانم وەردەگێرا، یان لە گۆڤارە ئەمریکی وئینگلیزییەکانم وەردەگرت و دەستکارییم دەکرد، وەک ئەوەی لێدەهات لە رۆژنامەیەکی شیوعی وەرگیرابێ.

تەنها بەوەندە وازم نەدەهێنا، هەندێک جاریش لە گۆڤاری تەریقی شیوعی لە لوبنان ئەو وتارانەم وەردەگرت کە لە نووسینەکانی ئیلیا هرنبۆرگ و کوستەنتیم سیمولۆف و نووسەرانی تری سۆڤیەت وەرگیرابووە، منیش دووبارە بڵاوم دەکردەوە، کەچی ویژادن لەسەر ئەو فێڵکردنە ئازاری نەدەدام، چونکە خەباتێک بوو لە پێناو ئاشتی و دیموکراسی و چینی زەحمەتکێشان.

کەسی شیوعی کاتێک باوەڕ بە دروشمێک دەهێنێ، بۆ خەڵک وا دەردەکەوێت کە باوەری بەو دروشمە، کەچی لەراستی دا شیوعی جێبەجێکاری ئەو دروشمە میکافیلییە کە دەڵێ˝ هەموو هۆکارەکان لەپێناو ئامانجەکەدایە˝ کەچی دوژمنانی شیوعیە بەجۆرێکی تر لێکدانەوە بۆ ئەو دروشمە دەکەن بە مانای ئەوەی ئەگەر شەرم ناکەی هەموو شتێک بکە، شیوعیش شەرم ناکات.

زۆر سەرم سوڕما کاتێک شیوعیەکان دروشمی ئاشتیان بۆ یەکەمجار بەرزکردەوە، چون بانگەشەی ئاشی دەکەن ودەشزانن کە ئامانجەکانیان بەخوێن ئاودەدرێت؟ تەنانەت حزبی شیوعی عێراقی ئێستاشی لەگەڵ دابێ دوای ئەوەی نسکۆی هێنا و بێ ئومێد بوو، خەون بەوە دەبینی کە جەماوەری عێراق بە شۆرشێکی پرۆلیتاری هەڵسێ دژی حوکمەتێکی بۆرژواری نیشتمانی. خەون بەوە دەبینی ئەو لە رێگای هەڵگیرسانی جەنگێکی جیهانییەوە دەگات بەدەسەلات ئەوکاتە سوپای سوور تورکیا وئێران دەبرێت و دەگاتە دۆڵی رافیدەین بۆ رزگارکردنی و ئەو رۆژەش سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی دەبێتە سەرۆک کۆماری عێراقی میللی یان بەلایەنی کەمەوە

دەبێتە سەرۆک وەزیران، ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی دەبن بەوەزیر لەوانیش ئەو هاوڕێ زۆر شەریفەی کە پیاوێک بوو لەپیاوەکانی تەحقیقاتی جینائی لەسەردەمی ڕژێمی پێشوو لەساڵی ١٩٥٠، ڕاپۆرتەکانی بۆ ئەوەی دەنارد و مووچەی شەش دیناری زیاتر وەرنەدەگرت، ئەمەش لە ڕێگای شیوعیەکە کە دواتر ناوی خۆی کردە(ف، ب) ئەندامی سێیەم لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی عێراقی، لە یەکێک لەباڵەخانەکان پارەکەی وەردەگرت کە دیارە نووسینگەکەی لەوێ هەبووە.

چۆن شیوعیەکان (بەلایەنی کەمەوە لە ئاسیا) دروشمی ئاشتی بەرزدەکەنەوە، هەر ئەوان بوون کە زۆر چەپڵەیان بۆ هاوڕێ ماوتسی تۆنگ لێدا، کاتێک لە وتارێکی دوای سەرکەوتنی بەسەر شیان کای شک و ملکەچکردنی چین بۆ حوکمی شیوعی وتی: سوپای چین چەک دانانێت تا ئەوکاتەی هەموو گەلانی ئاسیا ڕزگاردەکات؟ یان ئەوەی بچین دەلوێ بۆ وڵاتانی تر نالوێ، چونکە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان نییە؟ ئایا مافی ئەوەی هەیە کە هانی کوریای باکوور بدات کە هێرش بکاتە سەر کۆریای باشوور بە هەزاران خۆبەخش پشتگیری بکات؟

ئایا مافی ئەوەی هەیە کە لە خاکی هیند هێرش بکاتە سەرخەڵک، دواتر ئەو خاکانە داگیر بکات و دواتر هاواری بەرزبێتەوە گوایە هیند دەستدرێژی دەکاتەسەر؟

گوێ لە ڕێبەران و پەیامبەرانی شیوعی بگرە، تا بەباشی درک بەوە بکەیت ئایا دەتوانرێت شیوعیەت لەگەڵ ئاشتی کۆبکرێتەوە. کارل مارکسی جولەکە لەوتارێکی کە لە لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی لەساڵی ١٨٥٣ خوێندیەوە دەڵێ: لەسەرتان پێویستە پانزە یان بیست یان پەنجا ساڵ بچنە ناو جەنگی ئەهلی و جەنگی نێونەتەوەکان بۆ

ئەوەنا بارودۆخەکە بگۆڕن بەڵکو بۆ ئەوەیە خۆتان ئامادەبکەن حوکمڕانی جیهانیش بکەن.

لینینی جولەکەش دەڵێ" دەنگ و هەرا کەم بکەنەوە، هێزەکانتان ئامادە بکەن، جەنگی شۆرشگێری داهاتوو لەنێوان ئێمەی شیوعی دا هیچ ناکۆکیەک لەسەر ئەو بابەتە نییە", هەروەها وتی" پێویستە کۆششمان بۆ کارکردن بێت لە پێناو چەکدارکردنی پرۆلیتاریا و چەک داماڵین لە بۆرژوازییەکان و لاوازکردنیان، بۆ ئەوەی دەرفەتی ئەوامان هەبێ تەفروتونایان بکەین" هەروەها وتی" دەبێ خۆمان ئامادە بکەین بۆچوونە جەنگەی کە ناتوانین خۆمان لێ بپارێزین، ئەو جەنگە هاتووە، یان دێ" دەشڵێ" کاتێک چۆک بە بۆرژوازیەت دادەین، بەتەواوی لەناویان دەبەین ئەوکاتە تەنها لە ولاتێک نا بەڵکو لە جیهان دەست بەسەر تەواوی پاشماوەکانیان دەگرین، ئەوکاتە مەحاڵە جەنگەکان روویدەن."

لە راسپاردەکانی کۆنگرەی شەشەمی جیهانی سۆسیالیزمی نێودەولەتی لەساڵی ١٩٢٨ هاتووە" بێ بەکارهێنانی هێز و بێ راپەرینی چەکدارانە و جەنگ دژی بۆرژوازی مەحاڵە بەسەر سەرمایەداری زاڵ بین".ستالین دەڵێ" دکتاتۆری جیهانی لەرێگای گەشەکردنی ئاشتیانەی کۆمەڵگای بۆرژوازی و دیموکراسی بۆرژوازی و سوپای بۆرژوازی و کارگێری مەدەنی بۆرژوازی و پۆلیس سەرهەڵنادات."

لینین کاتێک جەخت لەسەر پێکەوەژیانی ئاشتیانە دەکاتەوە دەڵێ" ئێمە تەنها لەولاتێک ناژین، بەڵکو لە کۆمەڵێک دەوڵەت دەژین و بوونی یەکێتی سۆڤیەت لەتەک دەوڵەتانی سەرمایەداری بابەتێکە باوەڕ ناکرێت، دەبێت یەکێکیان لە کۆتایی دا سەرکەوێت، بەرلەوەی ئەو

کۆتاییە بێت، چارێک نییە، هەندێک بەریەکەوتن نهێنی لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتانی بۆرژوازی روودەدا.

ئاشتی شیوعیانە ئەوەیە کە لینین پاساوی بۆ دەدۆزێتەوە دەڵێ لە گیانی شۆرشگێڕانەوە نییە، بەڵکو لەدەبەنگییە کە شەڕ لەدژی دوژمنامان بکەین لەکاتێکدا کە لەوان لاوازتر بین، ئەوە تاوانە بە جەنگێکی دژی دوژمنانمان رازی بین کە جەنگەکە لەبەرژوەندی ئەو دابێ،نەوەک لەبەرژوەندی ئێمە. هەر ئەویش دەڵێ پێویستە هەر فرو فێڵێک بەکاربهێنین یان هەڵخەلتاندن و هەر هۆکارێکی نارەوا و پەردەپۆشی هەقیقەت بەکاربهێنین. کەواتە ئامانجی شیوعیەکان لە بزووتنەوەی ئاشتی چییە؟ ئەوە لە ئەلقەی داهاتوو روون دەکەینەوە.

## ئەڵقەی سی

## ئاشتی لە لای ئەوان

ژمارە ١٤٩٩

ڕێکەوتی ٢٣ی تشرینی یەکەم ١٩٥٩

شیوعییەکان وایێ دەردەخەن کە بانگەشەی ئەوان بۆ ئاشتی لەگەڵ ئەو قسانەی مارکس و لینین و ستالین دژ نییە کە لە ئەڵقەی رابردوو باسمان کرد، گوایە ئەمە بانگەشەیە بۆ ئاشی جیهانی، نەوەک ئاشتی بەشێوەیەکی رەها، شەڕی چینایەتیش لە ژێر سایەی ئەو ئاشتیە ناوەستێ، بەڵکو ئەو جەنگە سیمایەکە لەسیماکانی ئەو ئاشتیە جیهانییە. تەنانەت پێیانوایە کە ئەو ئاشتیە بەرقەرار نابێ، ئەگەر بۆ بەردەوامی شەڕی چینایەتی نەبێ و هاندەری نەبێت، بۆ ئەوەی جەنگی جیهانی سێیەم بەرپانەبێت.

خەباتی لایەنگرانی ئاشتی لەولاتانی سەرمایەداری، بەو حاڵەتە دەبێ کە ئەو ولاتانە چەکدار نەبن و ناچار بکرێن بنکە سەربازییەکانیان لەو زەویانەی دوای زەریایەوە بکێشنەوە، خەباتیشیان لەو ولاتانی کە تووشی داگیرکردن هاتوون و یان حکومەتی دژە شیوعیەت حکومڕانی دەکات بەو جۆرە دەبێت رێگە بەو دەوڵەتانە نەدرێت بچنە ناو هیچ هاوپەیمانی و رێکەتنێکی سەربازی لەگەڵ ولاتانی سەرمایەداریی وهەوڵیش بدرێت ئیمپریالییست و ئەو بنکە سەربازیانە دەربکرێن کە ولاتانی خۆرئاوا دایدەنێن.

بانگەشەکردن بۆ ئاشتی مانای ئەوە نییە کە کۆریای شیوعی لەباکور مافی ئەوەی هەبێت هێرش بکاتە سەر کۆریای باشوور و هەوڵی داگیرکردنی بدات، مانای ئەوەش نییە چینی شیوعی هێرش بکاتە سەر

فورمۆزا و هەوڵی ئەوەبدات ملکەچی حوکمی شیوعی بکات، مافی ئەوەش نادرێت هێرش بکرێتە سەرهیند و بەشێک لە خاکەکەی داگیر بکرێت .

ئامانجی شیوعییەکان لەبزووتنەوەی ئاشتیخوازی ئەوەیە کە بلۆکی رۆژئاوا بەرەبەرە قوت بدەن، وەک ئەوەی یەکەمجار کوریای باشوور لە بلۆکی غەیرە شیوعی بێتە دەرەوە و بچێتە بلۆکی شیوعیەکانەوە، دواتریش گواتیمالا و کوبا و سیلان و ئێران و بەرلین و لەوانەیە عێراقیش بچێ، ئەوکاتەش نەیارەکە کە دونیای رۆژئاوایە لاواز دەبێ و رێگرێک لەوە نابێت هێرشی بکرێتەسەر و نغرۆ بکرێت.

لەنووسراوە نهێنییەکەی کۆمنترنی شیوعیش هاتووە کە پرۆپاگەندەکردن بۆ ئاشتی و چەکدارنەکردن، چاکترین خۆئامادەکردنە بۆ هاریکاریەکی چەکدارانە. لە نێو بریارەکانی کۆنگرەی شەشەمی شیوعیەتی نێودەوڵەتیش هاتووە: کارکردن بۆ چەکدارنەکردنی دەوڵەتانی غیرە شیوعی بەتەواوی لەکارکردن بۆ ئاشتی جیاوازە، کارکردن بۆ چەکدارنەکردن (عدم التسلح) بەشێکی تەواوکەری خەباتی گشتییە لەدژی سەرمایەداری هەروەک چۆن بەتەواوی ئەو کارە پێوەستە بەبەرگریکردن لە دوڵەتانی سۆسیالیزم.

وەک دەردەکەوێت ئەو قسەیە یەکتر ناگرێتەوە. چۆن بانگەشەکردن بۆ چەکدارنەکردن لە دەوڵەتانی غەیرە شیوعی، لە بانگەشەکردن بۆ ئاشتی جیاوازە؟ لەکاتێکدا خەباتی لایەنگرانی ئاشتی لەوڵاتانی غەیرە شیوعی بەتایبەتیش لەوڵاتانی سەرمایەداری شێوەی بانگەشەکردن بۆ چەکدار نەکردن وەردەگرێت؟

خوێنەر دەبێ ئەوەی لەیادبێ کە ئەو قسەیە ئاراستەی شیوعیەکان دەکرێت نەوەک جەماوەر، شیوعی نابێ باوەڕی بەئاشتی بێ ئەگەرچی لەبانگەشەکردنیش بۆی هاواری لێهەڵساوە.

ئایا ستالین لەنامەکەی دا کە ١٩٣٠ بۆ مەکسیم گۆرکیی ناردووە، نەینوسیوە: دژی هەموو جەنگێک نیین، ئێمە دژی جەنگەکانی ئیمپریالیزمین، دژی جەنگەکانی دژە شۆرشیش. ئێمە لەگەڵ هەموو جەنگێکی رزگاریخواز داین کە دژی ئیمپریالیزم بێ، جەنگی شۆرشی میللی بێ، جەنگێکی لەمجۆرەش خاڵی نابێت لە مەترسی و خوێنرشتن، بەڵکو بەوە دەکرێت و لەسەر ئەمە دەکرێت؟

رۆڵەکانی گەلی ئێمە سەریان سوڕما کاتێک بینیان ئاشتیخوازان لەکەرکوک و شوێنەکانی تر منداڵانی بچووک دەکوژن لەپێناو ئاشتی! خەڵکی بێگوناە پەلکێش دەکەن لە پێناو ئاشتی! دەدزن و سەردەبڕن و دەسوتێنن و سیخوری دەکەن و درۆ و دەڵەسە لەدژی هاوڵانیان دەکەن لەپێناو ئاشتی!

بۆیە دەپرسن: چۆن بانگەشەکردن بۆ ئاشتی لەگەڵ تەرم راکێشان بە پەت یەکدەگرێتەوە؟ چۆن بانگەشەکردن بۆ ئاشتی لەگەڵ کوشتنی منداڵان یەکدەگرێتەوە؟ بەڵام ئەم کارانە بەشێکە لەپێداویستیەکانی خەبات لە پێناو ئاشتیەکی شیوعیانە!

رژێمە خائینەکەی پێشوو دژایەتی هەموو نیشتمیانپەروەرەکانی بەناوی شیوعی دەکرد، ئەمەش دەرفەتی دایە حزبی شیوعی عێراقی (نهێنی) بە ئاشکرا و نیمچە ئاشکرا کار بکات، بزووتنەوەی ئاشتیخوازیش هەر بەو شێوەی عێراق بوو، هاورێیانی گەورە لە مامۆستایان و رێنیشاندەرنا لە کرملین یەکەم کەس بوو کە درکیان بەمەکرد هاورێ سوسلۆڤ کە سکرتێری تایبەتی ستالین بوو و

سکرتێری لیژنەی مەرکەزی شیوعیش بوو لە وتارێکی دا لە کۆبوونەوەی کۆمنفۆرم لەساڵی ١٩٥٠ دەڵێ: پێویستە لەسەر شیوعیەکانی ئەوروپای خۆر ئاوا ئەو قازانجە گەورەیە بقۆزنەوە، کە لە ئەنجامی ئیمزای ملیۆنان کەس دەستیان دەکەوێت کە بۆ بانگەوازی ئاشتی ستۆکهولم کراوە، سەدا بیست یان سەدا بیست و پێنجی ئەوانەی ئیمزایان لەسەر بانگەوازەکە کردووە، ئەگەر کەمترین هەوڵ بدەین بەدەوری حزب دەبن،ئەگەر ئەوان لەدەوری بزووتنەوەکەمان دابن سوودبەخش دەبن، ئەگەر راستەوخۆش نەچنە ناو ریزەکانمانەوە ئەوا بەلایەنی کەمەوە دەبێ دەنگەکانی ئەوان بەکاربهێنین کە بەو کەسانە دەدەن کە سەلامەتی و بژێوەیان دەپارێزی کە ئەوانیش شیوعییەکانن.

کاتێک ئەوان ئەندامانیان لە ئەنجومەنەکانیان لە ژیانی گشتی دا هەڵدەبژێنن، ئێمە ئەندامانی حزبە شیوعییەکان هاندەدەنین کە هەوڵ بدەن دەنگدانەکان بەرەو قەدەغەکردنی چەکی ئەتۆم ببەن، و سوود لەوکەسانە وەربگرن، دەبێت بزووتنەوەی ئاشتیخوازی بچێتە ئەنجومەنەکانی کرێکاران و جووتیاران کەهێشتا پەیوەندیان پێوەنەکراوە، هەوڵ بدەن پەککەوتە و قوربانیانی جەنگ بە گرنگی ئاشتی رازی بکەن، بەدڵنیایەوە ئەوان ئاشتیخواز و بانگخوازی ئاشتین، بۆ هەموو ئەمانە دەبێت چەندین حزب و لیژنەی ناوخۆ بەردەست بکرێت بە شێوەیەک ریگەنەدەین بەتەنیا کار بکەن بەڵکو لەژێر چاودێری و رێنمایی حزبی شیوعی دابێت.

شتێکی ئاساییە کە ئەو ئامۆژگارییانەی هاورێ سوسلوف تەنها ئاراستەی حزبە شیوعیەکانی ئەوروپای خۆرئاوا نەکراوە، بەڵکو ئاراستەی هەموو شیوعیەکانی دەرەوەی دونیای شیوعی کراوە، هاورێیانی بەشەرەف سوودیان لەو ئامۆژگاریانە بنیوە و پەیرەویان کردووە، سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، هەرچەندە سەرکەوتنەکان

هیچیش بوە ئەمەش لەبەر ئەوەی حزب سەرکردایەتیەکی موکڕ و دانای نییە.

**ئەڵقەی سی و یەك**

ژمارە: ١٥٠٠

ڕێکەوتی: ٢٥/ تشرینی یەکەم ١٩٥٩/

دروشمە جەماوەرییەکانیان

هەندێک لە برادەران و دۆستان پرسیار لە هۆکاری ئەوە دەکەن کە ماوەیەکی درێژە لە نووسین دابڕاوم و دواتر لە ناکاو ئەم دوو ڕۆژە گەڕاومەتەوە سەری. ئەوان مافی خۆیانە پرسیار بکەن و ئەرکی منیشە وەڵامیان بدەمەوە. دوای ئەم تاوانە ناپاکە، تاوانی هێرشکردنە سەر ژیانی زەعیمی گەل، من و بەرپرسانی ڕۆژنامەی حوریە وامانزانی ئەرکێکی نیشتیمانی وا دەخوازێ خۆمان لە وروژاندنی گرژی و ناکۆکی نێوان ریزەکانی گەل بەدوور بگرین، بەپێی تواناش کۆشش بکەین بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان تەواوی کوتلە و توێژەکان هێمن بێت و دوور بێت لە تاوانبارکردنی یەکتر و جنێودان و هێرشکردنە سەر یەکتر. بەڵام هاوڕێیانی بەشەرەف لەوەی روویدا و لە بێدەنگی حوریە هەلیان وەرگرت، وەک نەریتی خۆیان دەستیان کرد بە بوخت و درۆ و دەسەلە... تەنانەت تۆمەت هەڵدەبەستن و هەڕەشەش دەکەن.

ئەو هاوڕێیانە کە دەروونێکیان هەیە، دڕەندەش نییەتی، باوەڕیان بە پرەنسیپێک هەیە بنەما و جەوهەرەکەی لەسەر رق و ئیرەیی دامەزراوە "فلان هەیەتی من نییمە، با هی ئەو ببەین"، لەبەر ئەوە لێکدانەوەیەکی باشیان بۆ بێدەنگی من نەکرد لە بەرامبەر یادەوەرییە شیوعیەکەم. تەنانەت خەیاڵیان کە بە ڤۆدگا ژەهراوی بووە، وایکردووە چیرۆکێکی سەیر و سەمەرە هەڵبەستن، گوایە من رامکردووە. جا ئەگەر یەکێکیش لە هۆکاری راکردنی من بپرسێتن ئەوا دەڵێن "ئەوان رادەکەن، چونکە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکرێت."

لەبەرامبەر ئەو درۆ و بوختانە چەپەڵانە، ناتوانم شتێک بکەم تەنها بەردەوام بوون نەبێت لە نووسینەکان، چونکە ئەوەیان دەوێ. لەراستیشدا نووسینەکانم خزمەتی شیوعیەت دەکات. وەک فەرمانبەرێکی گەورە پێیگوتم، کەسێکی دیموکراسی، رۆژگارێک ئەو کەسە شیوعی بوو، تەواو ئاکاری شیوعیەکانی بینیوە. نازانم مەبەستی ئەو بەرپرسە چی بوو کاتێک وتی نووسینەکانم خزمەتی شیوعییەکان دەکات. ئایا مەبەستی ئەوەیە من قسەم لەسەر بەزم و رابواردنی خەباتی ئەوان کردووە، کە ئەمەش وا دەکات هەرزەکارەکان برژێنە ریزەکانی ئەوانەوە تا شتێکیان دەستکەوێت؟ ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت، با ئەو هەرزەکارانە روو لەوان بکەن. نیشتیمان و نەتەوەی عەرەب پێویستی بەو گەنجانە نییە نکۆڵی لە نیشتیمانەکەیان و بەرژوەندییەکانی بکەن،. بەرژوەندی کرملین لەلای شیوعیەکان باڵاترە لە نەتەوایەتی و ئایین و هەر شتێکی بەرز و پیرۆز.

هەندێک لە هاورێیان لەلای بەڕێوەبەری گشتی بازرگانی و هاوردەکردن واستەیان بۆ کردم، کە پیاوێکی چەپ بوو. هەڵبەتە بێئەوەی داوای بڕوانامەی رەفتارپاکییم لێ بکات. بەمشێوەیە ئەوماڵە من و براکەم بە کرێمان گرتبوو، بووە لانەیەک لە لانەکانی بزووتنەوەی ئاشتیخوازی شیوعی. لەوێ کۆدەبووینەوە و مشتومڕمان دەکرد و بڵاوکراوەکانمان دەخوێندەوە. کەچی من ئەو کاتە تێبینیم کرد قسەکانی یەکێک لە ئێمە، کە قوتابی یەکێک لە کۆلێژەکان بوو، لەبارەی ئاشتییەوە نەبوو، بەڵکو لەبارەی کەسانی

پێشکەوتوخواز و کەسانی چاکی کولیژەکەیان بوو، کە ریژەیەکیان لە لایەنی قوتابیە قەومییەکان بوو.

لەو سەروبەندەدا، هاورێیان قەسیدەکی درێژی منیان برد، کە لەبارەی ئاشتییەوە بوو، ناوم نابوو" سپێدەی ئاشتی" بڵاویان کردەوە بێئەوەی ناوی من بهێنن. هەڵبەتە ئەمە لەسەر پێشنیاری من بوو، داهاتەکەشی بۆ بزووتنەوەی ئاشتیخوازی بوو. ئەم قەسیدەیە، نموونەیی بوو لە شیعری شیوعی. پڕم کردبوو لە بیرۆکەی ئاشتیخوازیی، باسم لە جۆرەکانی ئاشتیخوازیی کردبوو، لە وڵاتانی سۆسیالیستی و وڵاتانی ئیمپریالیزم و سەرمایەداریی، وڵاتانی داگیرکراو و نیمچە داگیرکراو. لەو دێرانەی کە بیرۆکەی شیوعیەکان لە بارەی ئاشتییەوە دەردەخەن، ئەمانەن:

**والسلم ماحطم المستبعدون علي**

**حديه، أوصال سفاكين أشرار**

بیرم نەچووە، قسە لە سەر دایکی دڵسۆز بکەم( مەبەست یەکێتی سۆڤییەتە)، کە قەڵای ئاشتی و سۆسیالیزم، بۆیە وتوومە:

**هناك يرين السلام**

**كأهداب طفل ينام**

**وحيث التقيت و وهي ترنو**

**عيون الوري في وئام**

## برغم اللغلي و الحديد

## نمت زهرة للسلام

کەشی سیاسی لە بەغدا بەرە بەرە ئالۆز دەبوو. کۆمەڵێک لەخەڵکی حزبەکان، بەتایبەتی لە جەبهەی شەعبی و وتەنی دیموکراتی، یاداشتێکیان بە عەبدولئیلاە لە یاداشتەکان داواکارییەکانی گەلیان خستبووە ڕوو. من جگە لەوەزیفەکەم وەک وەرگێڕێک لە ڕۆژنامەکانی جەبهەی وەتەنی و رەئی عام کارم دەکرد. لە ڕۆژنامەی جەبهەی وەتی قەسیدەیەکی شۆڕشگێڕانەم بڵاوکردەوە، پێشبینی راپەرینی دووەم کردن هێندەی پێنەچوو، راپەڕینەکەی هات کە بە راپەڕینی تشیرین ناسراوە.

بەڵام چۆن هات؟ ئەمە یەکێکە لە گاڵتەجارییەکانی قەدر کە عێراقی بە خراپترین حزبی شیوعی لە مێژوودا کارەساتبار کردووە. لەسەرەتاکانی تشیرین قوتابیانی کۆلیژی دەرمانسازیی مانگرتنێکیان ئەنجامدا، هۆکارەکەی تەواو پەیوەندی بە مامۆستاکانەوە هەبوو، هیچ پەیوەندی بە خراپی بارودۆخی سیاسی، ئازادیی رۆژنامەگەریی و ئازادییەکانی دیکەوە نەبوو، هیچ پەیوەندییەکیشی بەڕابەرایەتیکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و پرۆژەکانی دیکەی ئیمپریالیزمەوە نەبوو. لەکاتی مانگرتنەکە قوتابییەک لە کۆلیژی ماف، بەهۆی هۆکاریی سۆزداریی و ئەخلاقی هێرشی کردە سەر یەکێکی دیکە، ئەو کەسە هێرشی کرابووە سەر قوتابیەکی کۆلیژی دەرمانسازیی بوو، لە شیوعیەکان بوو، ئەوە تەحەروشی بەکچێکی خزمی قوتابیەکەی کۆلیژی ماف کردبوو، بۆیە لەلایەن کوڕەکەی ماف بە چەقۆ لێی

درابوو... لێرەدا قیامەت هەڵسا و خۆپیشاندان ئەنجام درا، دروشمی نیشتیمانی ئەوتۆ بەرزکرایەوە هەرگیز پەیوەندی بە هۆکارە راستەقینەکەوە نەبوو.

حزبی شیوعی کە بێگومان سەرکردەکانی مێژووی بزووتنەوە و حزبە شیوعیەکانیان خوێندۆتەوە. چاک دەزانن هەر حزبێکی شیوعی کاتێک شۆڕش دەکات و هەوڵی شۆڕش دەدات، جەماوەر بەدوای نایەت، تەنها ئەو کاتە نەبێت دروشمێک بەرزبکاتەوە، کە لەلای جەماوەر گەلالە بووە. کاتێک گەلی رووس لە جەنگ بێزاربوون و مەینەتیان بەدەست جەنگەوە چەشت و هیوایان بوو حکومەتەکەیان لە جەنگ بکشێتەوە، ئەوا شیوعیە بەلشەفیکەکان، دروشمی کشانەوە لەجەنگیان بەرز کردەوە، جەماوەر بەدوایان کۆبۆوە، بەم شێوەیە شۆڕشی ئۆکتۆبەر هەڵگیرسا. .. کەچی حزبی شیوعی عێراق.... بە چ دروشمێک خۆپیشاندانەکانی دەست پێکرد؟ دروشمێک کە لەگەڵ هەستی گشتی ناگونجێت.

بۆچوونێک هەیە دەڵێ: حزبی شیوعی عێراقی بەرەبەرە دەهاتە ناو راپەرینی تشرین و دەسەلاتی رژێمی پێشووش دەیزانی کە شیوعییەکانی عێراق دەرفەتی خۆپیشاندان و سوتاندنی بنکەکانی پۆلیس لەدەست خۆیان نادەن، ئەگەر هاتوو بەکرێگراوەکانی نوری سەعید دەرفەتیان بۆ برەخسێنین، مەبەستی ئەوانیش ئەوەیە کە بەکرێگراوەکان چەند شتێک بکەن.. لەوانە وا لە شیوعییەکان و ئەو کەسانەی لەگەڵیانە بگەینن کە لاوازترن ئەگەر هاتوو بە حکومەت و هێزەکەی بەراورد بکرێن، چەند مەفرەزەیەکی کەم لە پۆلیس و سوپا دەتوانێ، زەبری جەماوەری شیوعیەکان تێک بشکێنێ و پەرتەوازەیان بکات و بیانخاتە زیندان و گرتووخانەکانەوە، لەلایەکی تریش ئیمپریالیزم و بەکرێگراوەکانی مەبەستیان مۆرکردنی پەیماننامەی بەغدا بوو، لەوکاتەش دەبێ بەرلەوە بزووتنەوەی نیشتیمانی لەناوببرێت و حزبەکان هەڵبوەشێنرێنەوە و رۆژنامە نیشتیمانیەکان رابگیرێن و دەست بەسەر هەموو ئازادییەکان بگیرێت.

کەسێک هەبوو کە نامەوێت ناوی بهێنم خزمێکی شیوعی هەبووە، مانگێک بەر لە راپەرینی تشرین پەیوەندی بەو خزمیەوە دەکات وپێی رادەگەینێت کە دوای مانگێک راپەرین ئەنجام دەدرێت، گوایە ئەمەی لەسەرچاوەیەکی بەرپرس وەرگرتووە لە فەرمانگەی تەحقیقاتی جنائی ، کاتێک ئەو شیوعیە پەیوەندی بەرێکخەرەی خۆی دەکات کە بەهادین نوری بووە، وەلامی بەو جۆرە داوەتەوە، کە ئاگاداری هیچ شتێک نییە، ئەو پرسیارە بەر لە راپەرینەکانی تشرین تەنها بەیەک رۆژ کراوە. دەبەنگی سەرکردایەتی شیوعی زۆر سەیرە، ئەی چۆن وانییە ئەو سکرتێرەیان کاتی خۆی کە سەید موسا بەرپرسی بووە لەساڵی

١٩٤٨ لەبەر چەند هۆکارێک فەسەڵی کردووە، ناتوانم هۆکارەکان بڵێم چونکە حوریەت رۆژنامەیەکە رێگەی ئەوەم پێ نادات.

ئەوکاتە لە تشرین من فەرمانبەری بەرێوەبەرایەتی هاوردەکردن بوو، من گوێبیستی رووداوەکانی کولیژی دەرمانسازی بووم، بەڵام هەقیقەتەکانیم نەدەزانی، وام بیست کە یەکێک لە سیخورەکان هێرشی کردۆتە سەر خەباتکارێکی دیموکراسیخواز- مەبەستیان شیوعییەکە- بە چەقۆ برینداری کردووە، من گوێبیستی راپەرینەکان بووم کە روویدابوو، بەڵام لەرۆژی یەکەمەوە نەمبینبوو.

لەرۆژی دواتر خۆپیشاندانەکان فراوان بوو، یەکێک لە فەرمانبەری فەرمانگەکەمان داوایکرد بەشدار بین، ئەو خەباتکارێک بوو کە لەبەر گازی فرمێسک رژێن کە لە خۆپیشاندەران گیرابوو چاو و لوتی سوور ببوو. بەرێوەبەری فەرمانگە فرمانی دایە پۆلیس و بەردەستەکان دەرگای فەرمانگە دابخەن و رێگەنەدەن بچنە دەرەوەی فەرمانگە، ئێمەی شیوعی لەفەرمانگە لە هەڵپەی ئەوەدابووین کە لەگەرمەی رووادوەکان دابین، بەڵام تەنها ئەوەندەمان کرد کە لەپەنجەرە و بالەکۆنەکان وەستاین، منیش لەبەرامبەر پەنجەرە وەستابووم کاتێک زمانەکان گریان گرت و هەرەشەی تۆڵەی دەکردەوە، خۆپیشاندەران فەرمانگەی پەیوەندیەکانی ئەمریکایان تێکدا، کە نزیکی فەرمانگەکەمان بوو، مشتومڕمان لەسەر ئەوشتانە دەکرد کە دەمانبینی ، ئەگەر ئاگر بەر تیلەکانی کارەبا بکەوێت بەغدا هەمووی گڕ دەگرێت، ئەوە چ کارەسات و نسکۆیە.

ئەوکاتە ئاگرەکەی قاهیرەمان بیرکەوتەوە کە ئیستعمارو بەکرێگراوەکانی رێکیان خستبوو، ئەو ئاگرەش نموونەی ئاگرەکەی قاهیرە بوو.

من هەڵمکوتایە سەر دەرگای فەرمانگە و گوێم بە هاواری بەردەست و هەوڵی ئەو پۆلیسانە نەدا کە دەیانویست دەستگیرم بکەن، بەرەو فەرمانگەی پەیوەندیەکانی ئەمریکا چووم کە ئاگری لێ بەرزدەبۆیەوە، تێبینی ئەوەم کرد کە هەندێک لەخۆپیشاندەران بەرەو نهۆمی سەرەوەی ئاپارتمانەکە سەرکەوتوون کە فەرمانگەی پەیوەندیەکانی ئەمریکای تێدابوو، لەسەرەوە هەموو ئەو ریکوردەرو رادیۆ، کاسێتی سینەمایی و هەرشتێکیان دەستکەوتبایە، فرێیان دەدایە خوارەوە، خۆپیشاندەرانی تریش لە خوارەوەی فەرمانگە سوتاوەکە وچانیان نەدەدا، لەسەریان بوو کە رووبەرووی ئەو هێزانەی پۆلیس ببنەوە و بەسەریان زاڵ بن و داواکانی خۆیان بەسەر ئەو حکومەتە بێ توانایە فەرز بکەن، نەوەک کتێبی کتێبخانەکان بسوتێنن و کاسێتەکان بشکێنن چونکە ئەو زیانە کار لە خەزێنەی ئەمریکی ناکات، ترسێکی تریش هەیە، ئەوەیە ئاگرەکە فراوان بێت و هەموو بەغدا بگرێتەوە، بەماڵ و کەپر و منداڵ و کچ و دووگیان و پیرەکانیەوە، من بەهاوارکردنەوە قسەم لەگەڵ خۆپیشاندەران دەکرد: برایان ئاگری قاهیرەتان بیر بکەوێتەوە، رێگە مەدەن ئەو ئاگرە هاوشێوەی ئەو بێ، پێویستە لەسەر خۆپیشاندانەکەمان بەردەوام بین، بەردوام بین لە خەبات، هەندێک لە خۆپیشاندەران گوێرایەڵی ئەو هاوارەم بوون، هەندێکی ریش لەسەر کارەکەی خۆیان بەردەوام بوون، لەسەر سووتان و تاڵان و تێکشکاندن، وەک ئەوەی ئیستعمار تێک بشکێنن، نەوەک ریکۆردەری دەنگ، چەوساندنەوە بسوتێنن نەوەک فلمێکی سینەمایی.

لەنزیک ساباتی پۆلیسی هاتوچۆ نزیک لە بازاری شوریجە، بەسەر سەکۆیەک کەوتم و قەسیدەیەکم خوێندەوە کە شەوی رابردوو نووسیبووم، کە تێیدا هاتووە:

جاع الشهيد و مد فاه الي دم

فاعصر فؤادک او فؤاد المجرم

جاع الشهيد و جعت انت واحدقت

بک اعن الجوعي عداد الانجم

لەو قەسیدەیەدا هێرشم کردۆتەسەر چینی دەسەڵاتدار و عەبدولئیلاه . خۆپیشاندەران ئەوانەی کە بە سوتاندن و تێکدان شەکەتبوون کۆبوونەوە وکەوتنە ژێر کاریگەری ئاوازی قەسیدەکە، ریزەکانی خۆپیشاندان رێکەوت پۆلیسیش لێی نزیک دەبنەوە کە ئەوان لە نزیک سینەما رۆکسی بوون، چەندین بۆمبی گازی و فرمێسک رژێن و خنکێنرەیان لابوو، بەشێک لەو خۆپیشاندەرانەی کە ئەندامی حزبی شیوعی نەبوون،- زۆر بەداخەوە- زۆر ئازا و بوێر بوون ئەو بۆمبە گازیانەیان دەگرتەوە کە ئاراستەی ئێمە دەکرا، بەرلەوەی بتەقێتەوە ئاراستەی پۆلیسەکانیان دەکرەوە، لەبەرامبەر ئەوکارانە پۆلیس ناچاربوو رابکات، شەقام بۆ ئێمە چۆڵ بوو، تێیدا رۆیشتین و هوتافمان دەکێشا و سرودمان دەچری، بەرەو شەقامی غازی چووین، کە ئێستا بەشەقامی کیفاح ناودەبرێت، لەرێگادا چەند خۆپیشاندەرێک منیان خستەکۆڵی خۆیان و قەسیدەیەکی تریشم خوێندەوە.

کاتێک خۆپیشاندانەکە گەیشتە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی چەند گوللەیەکمان ئاراستەکراوە، کە لەبنکەی پۆلیسی باب شێخەوە هاتبوو، ترس بەسەر خۆپیشاندەران زاڵ بوو، یەک دوو کەس ویستیان بەرەوپێش بچن، گوللەیان بەرکەوت، بە برینداری بە گالیسکە رەوانەی نەخۆشخانە کران، خۆپیشاندەران پەنایان بردە بەر شەقامێکی لاوەکی کە دەکەوێتە پشت مەرقەدەکەی گەیلانی، یەکێکیان وتی٠ دەتوانین لەرێگای گۆرستانی گەیلانی بگەینە بنکەی پۆلیس ،

کاتێک مرۆ لەگۆرستانەکە تێدەپەڕێ و دواتر بەسەر دیوار دەکەوێت، ئەوکات دەچێتە ناو بنکەکە ، کێ ئەوە ئەنجام دەدا؟ کەسێک لەئێوە هەیە ئەم کارە بکات؟ بەڵام کەسی ئازا لەکوێیە تا بەو کارە هەڵسێ.

هاوڕێیانی زۆر بەشەرەف کە لەبەرامبەر چەند گوللەیەک ترسیان گرت، ئەو گوللەیەی کە لە تفەنگێک یان دوو تفەنگ لەبنکەی پۆلیس دەردەچوو، لەبەرامبەر پیاوێکی هەژاری بەستەزمان لە ڕۆڵەی ئەو گەل بوونە شێر، ئەو پیاوە چامانەیەکی شینی بەسەرەوە بوو گوایە نیشانەی ئەوەیە لەنەوەی پێغیمبەرە، هەردوو لاچانگی کوتربوو، یەکێک لەهاورێبانی بەشەرەف چاوی پێکەوت و وتی" ئەمە پۆلیسی نهێنیە. هەرئەوەندە و ئیتر ئەو پیاوە کەوتە ژێر دەست و پێیان و ئەویش دەموچاوی بەخوێن بوو هاواری دەکرد و دەپارایەوە: بەخوا پۆلیس نیم، پیاوێکی هەژارم. بەڵام ئەوانەی کە گوایە داکۆکی لە هەژار و زەحمەتکێشان دەکەن، نازانن خۆیان سەرسەخترین دوژمنی هەژارو زەحمەتکێشانن، چەند بەخێوکەر هەبووە کە جگە لەمووچە داهاتێکی تری نەبووە، وایان لێکرد لەکارەکەی دەربکرێت. چەند هەژاری تووشبوو بەسیلیان توشی زیندان کرد، چەند نیوەکوێر کە تەنها دەتوانێ ڕێگا بگرێت، کەچی بەیاننامەکانی خۆیان لەشەودا پێ بڵاودەکردەوە.

ئەوانەی ئەمرۆ مەجلیسی عورفی لەسەر تاوانەکانی کەرکوک دادگایان دەکات، کەسانێک نین، جگە لە قوربانییەکانی حزبی بەکرێگراو، ئەو فرمانی دا تا ئەوان هێرش بکەن و بکوژن و تەرمەکان لە شەقام رابکێشن، ئەوان کەوتنە تەڵەی ئەو حزبەوە، کە ئێستا پاشەکشەی کردووە و ئامۆژگاری دەدات و دژی پیلانگیرییەکان دەوستێتەوە و داوای یەکخستنی ڕیزی عەرەب دەکات.

زانیم کاتێک شیوعیە بەشەرەفەکان خۆیان لەپشت مەزارگەی عەبدولقادری گەیلانی حەشاردابوو، سێ چوار پیاو هاتن و یەکێکیان هاواری کرد، من ئەو پۆلیسەتان بۆ دەکوژم، لەسەر مەزرگەکەوە سەرکەو بۆ ناو بنکەی پۆلیس و یەکێک لەوانی سەربری و گری لەبنکەی پۆلیس بەردا و پۆلیسەکەی تریش رایکرد. پارانەوەیەک لەودڵەی وەک بەردە، ئەو دڵەرەقیەی کەوەتەی ژیان دەستی پێکردووە وەک دلۆپە ئاوێک بووە دواتر لەگەڵ چاخەکانی سەهۆڵو بومەلەرزە و گرکان و لافاوەکان بۆتە لوتکەیەکی بەرزی ئەو ژیانە مرۆڤ وەک ئەوەی مرۆڤ هەر لەوەتەی ژیانی دەست پێکردووە، هاوشێوەی درندە بووە دواتر ململانێی لەگەڵ هێزەکانی سروشت و نەخوشی وپەتا و درندەکانی کردووە، هەموو کارەسات و جەنگەکانی بینیووە، وەک ئەوەی هەموو ئەمانە لەچاوی پۆلیسەکەوە ببینرێت، ئەویش داپەرێتەوە و لە تکایە دەسوتێ ، بۆ ئەوەی ژیانی رزگار بکرێت و نەمرێ.

دوای ئەوەی گڕ بەربووە بنکەی پۆلیس و دەنگی فیشەکەکان نەما، ئازایەتی بۆ خەباتگێرەکان گەرایەوە و هاوارایان دەکرد، پێویستە ئەو پۆلیسە هەڵاتووە بگرن و بیکوژن، لەکاتی پشکنین گەیشتنە کەلاوەیەک، کە هەژاری تێیدا زۆر روون بوو، لە هەموو گۆشەیەکی کەلاوەکە دەگەڕان، لە بەرمیلێکی خاڵی لە ئاو پۆلیسە هەڵاتووەکەیان دۆزیەوە یەکێک لە هاورێیان بە چەقۆ کوشتی. لە ساتێکی کورتدا ترس لەچاوی پۆلیسە بەستەزمانەکە دەرکەوت،

جەستەی پۆلیسەکە بەچەقۆ لەت لەت کرا، ژمارەی ئەو خەباتکارانەی کە چەقۆیان لە جەستەی ئەو دەگرت زۆر زیاتر دەبوو، دواتر جەستەکەیان لەشەقام راکێشا و نەوتیان پێداکرد و گڕیان تێبەردا. کە شەوداهات، دوای ئەوەی جەماوەرەکەیان ئەو هەموو سەرکەوتنەی بەدەست هێنا، لە سوتاندنی پۆلیسخانە و کوشتنی پۆلیسەکە،

خۆپیشاندانەکە تەواو بوو، لەو ساتەدا حکومەت بەسەر تەواوی خۆپیشاندان زاڵ بوو، سوپا حوکمڕانی وەرگرت و دەسەڵاتی عورفی ڕاگەیاند، ئەوە ڕوویدا کە هەمووومان دەیزانین.

**ئەلقەی سی وسێ**

ژمارە: ١٥٠٢

رێکەوتی ٢٧ تشرینی یەکەمی ١٩٥٩

شیوعییەکان شعوبییەکانن

فەرمانی دەستگیرکردنم بۆ دەرچوو، پۆلیسش بەدوامەوە بوو لەفەرمانگە و کۆگای تایەی هاوردەکراو کە هی حکومەت بوو, من سەرۆکی بووم. لەخۆپیشاندانەکانی تشرین چەند کەسێکی پۆلیس کوژران، دەشبێ هەندێک لەو تاوانبارانە بڕیاری لەسێدارەدانیان بۆ دەربچێت، پۆلیسی تەحقیقاتی جینایی و سیخورەکانی من باش دەناسن، بۆیە بەلایانەوە ئاسانە, کە دەستنیشانم بکەن ئەگەر بێت و یەکێک شایەتیم لە دژ بدات، ئەوکاتە بڕیاری دەستگیرکردنم بۆ ماوەی ساڵێک یان زیاتر دەدرێت و بێگومان لەکارەکەشم فەسڵ دەکرێم، هەر ئەمەش روویدا، کەواتە مانەوە بۆ؟ با رابکەم.

دوای ئەوەی زۆر بەجوانی خۆم شاردەوە و جلی عەرەبیم لەبەرکرد، بە شەمەندەفەر چوومە بەسرا، لەئەبو خەسیب کەسوکارە نزیکەکانم رادەستی چەند قاچاخچییەکی عێراقیان کردم، ئەوانیش منیان گەیاندە ئێران.

بەرەبەیان بوو، رۆژێکی ساردی زستان بوو، کاتێک قاچاغچییەکە کە لەماڵیان نووستبووم، منی بە ئاگا هێنا لەدوای ئەو دەرِویشتم تا بە

رووبارێکی بچووک گەیشتین، کە عێراق و ئێران لەیەکتر جیادەکاتەوە، یان ئەو دوو پارچە زەویەی عەرەب لەیەکتر جیا دەکاتەوە, کە لەهەموو شتێک لەیەک دەچن. کاتێک بەناو دارخورما و دار توو و هەنار تێپەڕ دەبووم کە گەلاکانیان زەردببوو، وام هەست کرد لەگوندەکەی خۆم دەڕۆم، من سەیری ئەو خاکە عەرەبیەم دەکرد کە داگیریان کردبوو، لەبەر خۆشمەوە ئەو دێرانەی قەسیدە بەناوبانگەکەی موتەنەبیم دەگوتەوە:

**مغاني الشعب طيبا في المغاني**

**بمنزلة الربيع من الزمان**

**ولكن الفتي العربي فيها**

**غريب الوجه و اليد و اللسان**

بەڵێ. منیش لەو خاکە عەرەبیەدا روخسارو دەست و زمان غەریب بووم، بۆیەکەمجار کە لەمێژە مانەبووە، لەدەروونمدا هەستی نەتەوەیی و عروبە و شانازیکردن بەعروبە زیندووبووەوە، لەگەڵ خۆشمدا سوێندم خوارد کە لەیادی نەکەم و خیانەتی لێدەکەم، لەبەر ئەوەی جولەکەیەکی ناچاکی دڵڕەق لەسەدەی نۆزدە بانگەشەی ئەوەی کرد کە هاتۆتە سەر دینی مەسیحی، دواتریش بە رق و ئیرەیی و دەمارگیری بۆ جولەکە و ئەوەی لەتەورات خوێندویەتی کتێبێکی نووسیوەو ناوی ناوە سەرمایە، دوای ئەویش جولەکەیەکی دیکە هاتووە شۆرشی بەسەر ئەو شۆرشەکرد کە بورژوازییەکان ئەنجامیان دابوو، دوای ئەمەش دەسەلاتی دامەزراند، کەمرۆڤ

لەسایەیدا، بیرناکاتەوە و هەست بەشتێک ناکات، تەنها ئەوە نەبێت کە ڕژێم بەسەری دەسەپێنێ. لەبەر ئەوەش چەند خەڵکی قین و ئیرەیان لەدڵە، لەجولەکە و شعوبیەکان لەولاتانی عەرەبی بەدوای ڕێنامییەکانی ئەو دوو جولەکەیە کەوتوون و فێل لەگەڵ دەکەن و بەڵێ ئەوەیان پێدەدەن کە بەهەشتێک دروست دەکەن -خۆزگە بەهەشت لەسەر زەوی دروست دەکرا- کەچی خۆیان پارە کۆدەکەنەوەو باڵەخانە و ئۆتۆمبێل دەکڕن و ئارەزوو و غەریزەکانیان تێر دەکەن.

ئەی عروبیەت، ئەی نەتەوەی موحەمەد و عومەر و عەلی و موتەنەبی و ئەبو تەمام، ئەی نەتەوەی سەیف دەولە و موعتەسەم و سەلاحەدینی ئەیوب، هەرگیز بەچاوبرین بەسەرابەکانی شیوعی و خۆشگوزەرانیەکانی ئێستای شیوعیەت خیانەتت لێناکەم. لەئێران ئەو عەرەبانەم ناسی لەو شوێنەی کە فارس پێیدەڵێن عەرەبستان، ناسیاویمان بەهێز بوو، بینیم هەستە نەتەوەیەکەیان هەڵدەقوڵێ, بەڵام لەترسی ستەم دەیشارنەوە، بینیم چۆن زمانە عەرەبیەکەیان لاواز دەبێت، گوێبیستبووم کە پیاوێکی عەرەب بانگی کوڕەکەی دەکات و دەڵێ: بڕۆ (ئوتاق)، بە(کلید) بیکەوە، لەگەڵ خۆت(چراغ)ەکە ببە، جا(خەربۆزە)مان بۆ بێنە. ئەمە لەبری ئەوەی بڵێ: بڕۆ (ژوورەکە)، بە(کلیل) بیکەوە،( چرا)کە لەگەڵ خۆت ببە، جا (کاڵەک)مان بۆ بێنە.

حزبی تودەی شیوعی دان بەبوونی عەرەب نانێت لەئێران. تودەییەکان دەڵێن لەئێران کەسێک نییە تەنها ئێرانییەکان نەبێت. گوتەی ئەوەی کە ئەوانە عەرەبن و ئەوانە فارسن، ئەوەی گوتەیەکی بەتاڵی ئیمپرالیزمە.

بەلام ئەگەر لەعێراق پێنج هیندۆسی بەعەرەببوو هەبێت, ئەوا حزبی شیوعی بەکرێگراو ناپاکیەکەی بەدیار دەخات بەداوای هاولاتیانی هندوس و عەرەب داوای یەکخستنی خەبات دەکات و ئەو کات رۆژنامەی قاعیدە و بلاوکراوە حزبییەکان بەزمانی هیندی دەردەچن.

کاتێک موسا پەیمان ینا موسا ئەسەدی ئێرانی کە دواتر بووە مولحەقی رۆژنامەوانی بالوێزی عێراق لەولاتانی لوبنانی عەرەبی، داوای کرد کە قەسیدەیەکی شۆرشگێرییان پێ بدەم بۆ ئەوەی لەرۆژنامەی (خلق خوزستان) مەبەست (خەڵکی عەرەبستان) بلاوبکەنەوە، ئەو رۆژنامەیە حزبی تودە بۆ دانیشتوانی ئەو ناوچە عەرەبیە دەریدەکرد بەزمانی فارسی، وامزانی ئەو رۆژنامەیە بەعەرەبی دەردەچن، وەک هاوشێوەی ئەوەی حزبی شیوعی عێراقی بەکرێگیراو دەیکات، کە رۆژنامە بەزمانی پێنج کەس دەردەکات لەعێراق، کەچی ژمارەی عەرەب لەئێران نزیکەی ۳ ملیۆن کەسە. موسا پەیمان پێیگوتم ئەو خۆی قەسیدەکە وەردەگێرێت. منیش گوتم: بۆ وەرگێران؟ گوتی: چونکە رۆژنامەکە بەفارسی دەردەچێت. تکام لێکرد کە قەسیدەکە بەزمانەکەی خۆی بلاوبکاتەوە، کاتێک لەرۆژنامەیەک دەردەچێت کە بۆ عەرەبە، ئەو گوتی: ئەگەر بەعەرەبی بلاوی بکەمەوە, ئەوا هاندانێک دەبێت بۆ ئەو گیانە جیاخوازەی کە لەلایەن هەندێک عەرەبی جێنیشبووی ئێران هەیە.

### ئەی خودایە ئەمەیە شیوعیەت؟

لەگەڵ ئەوەی کە جولەکە دژی عەرەبە، هیندۆس دژی عەرەبە، هەموو خەڵک دژی عەرەب بێت. ئەوا دەتوانرێت پاساوێکی بۆ بدۆزیتەوە

کاتێک لەوڵاتێکی عەرەبی روودەدات. بەڵام کە شیوعیەک لەوڵاتێک دژی عەرەب بێت، کە عەرەبیش کەمینە بێت تێیدا، ئەمە ناتوانرێت شرۆڤەی بۆ بکرێت. تەنها ئەوە نەبێت. کە جوڵانەوەی شیوعیەت لەعێراق بەتایبەتی درێژکراوەی جوڵانەوەی شعوبیەت بووە وەک جوڵانەوەی قەرامیتەکان کە هەرکەسێک مێژووی عەرەبی خوێندبێتەوە دەزانێت ئەوان کێن.

زۆر جوڵانەوەی دیکە هەبووە کە بانگەشەی سۆسیالیزم و داوای ئەوەیان کردووە حەرام نەبێت هەموو شتێک رێگەپێدراو بێت, ئافرەت بۆهەمووان شیاو بێت. بەڵام ئامانجی راستەقینەیان دژایەتیکردنی عەرەب و نەتەوە و ئایینەکەی بووە. ئێستایش جوڵانەوەی شیوعییەت بەتایبەتی لەعێراق لەلایەن کەسانێکەوە بەڕێوە دەبرێت بەتایبەتی کەسانی کە بوونەتە عەرەب و شعوبین بەپەردەی شیوعیەت خۆیان داپۆشتووە. بەڕاستی جوڵانەوەی شیوعی لەعێراق درێژبوونەوەی جوڵانەوەی شعوبیەتە، ئەوکەسە هەڵە ناکات کە شیوعییەکانی عێراق بەقەرامیتەکان دەشوبهێنێ.

عەرەبەکان لەئێران تەنها کە دەیانزانی من عەرەبی عێراقم بەگیان و دڵ دەهاتنە لام. شەوێکیان، من و هاورێیەکم کە عەرەبێکی عەرەبستان بوو، لەیەکێک لەمەیخانەکان دانیشتبووین، دوو گەنجی عەرەب هاتنە ژوورەوە, کە زانیان ئێمە بە زمانی عەرەبی قسە دەکەین هاتنە لامان کاتێک زانیان من عەرەبی خەڵکی عێراقم یەکێک لەوان بەحەسرەتەوە گوتی: ئێوە برای ئێمەن، چەند خۆزگەمان دەخواست لەگەڵ ئێوە لەیەک وڵات و لەیەک دەوڵەت بەیەکەوە بین.

دەستی کرد بەوتنی ئەبوزیەیەک لەستایشی فەیسەڵی قەرەقۆز (بوکەڵە) وایدەزانی من فەیسەڵم خۆشدەویَ تەنها لەبەرئەوەی عێراقیم.

سەرخۆشێکی فارس کە عەرەبیەکی شڕی دەزانی دەنگی کردو هاواری لەگۆرانبیژەکە کرد بێدەنگ بێ و گوتی: مەلیک فەیسەڵ.. مەلیک بەهرێن.. مەلیک کویت شنو هازا( ئەمەچییە) گۆرانی بەسەر مەلیکی ئێران بڵێ.. شاهنیشاه.

خەریک بوو لەمەیخانەکە شەڕ لەنێوان فارس و عەرەب روویدەدا، ئێمە بارودۆخەکەمان هێمن کردەوەو برادەرە گۆرانبێژەکەمان لەوە گەیاند کە ئێمە فەیسەڵ و خاڵەکەی ئەومان خۆشناوێت، ئەی فەیسەڵ و خاڵەکەی نییە منیان دەربەدەر کرد، کە ئێستا بەهەژاری و زەلیلی و ترس دەژیم. بینیم مانەوەم لەئێران وەک مەحاڵ وایە، ئەو پارەیەی لام بوو خەریک بوو تەواو دەبوو، من و برادەرێکی عەرەبم لەئێران لەسەر ئەوەی رێکەوتین بچینە کویت و لەوێ کار بکەین ئەمە چاکترین شتە.

لەگوندی (عقبە) لەباشووری عەرەبستان کاتێک چاوەڕوانی هەڵکردنی بامان دەکرد بۆ ئەوەی کەشتیەکە بۆ کویتمان ببت، لەدانیشتنێک ئامادەبووم کە مەلایەک بەفارسی قسەی دەکردو وەک ئەوەی ژەهر و قین بەبەرگی دینەوە برێژێت، بەفارسی هاواری دەکرد. کە قسەکەی وەردەگێڕیت ئەوەیە ئەو سەگە نەفرەتلێکراوە کە سەعد بن ئەبی وەقاسە. گوتم سەعد عێراقی لەدەست فارسەکان رزگار کرد لێدانێکی وەهای لەفارسدا بەکیسر و رۆستمەوە، هەرگیز لەبیر ناکرێت تا

لەدونیادا مێژوو بخوێنرێت، ئەو هیچ وپوچە فارسە جنێو بەئیمامی عەرەب دەدات. دوعام دەکرد خوا سەبرم پێبدات نەعلێک لەو دەمە قێزەوەنە نەدەم, کە جوێن بەنەتەوەو سەرفرازەکانی دەدات.

ئەو شەش مانگەی لە کویت بەسەرم برد زۆر سوودم بینی. رەوشتی شیوعییەکانم لەماڵەوە ئاشکراکرد، لەوکاتەی دوور بن لە رێنماییەکانی مارکس و لینین و ترسی چاودێری نەیارانی حزبیان نەبێت.

من و محەمەد حسێن برادەرە عەرەبە ئێرانییەکەم لەماڵێک لەگەڵ شەش کەسی شیوعی عێراقی دەژیاین کە دوای ئەوەی ئەنجومەنە عورفییەکان ئەحکامی غیابیان بە زیندانیکردن بۆ دەرچوو بوو، بۆیە رایان کردبووە کویت. یەکێک لەوانە عەباس سەرخۆش بوو، کە شوفێر بوو، ئەویتر لەفتە محەمەد بوو کە ئەویش هەر شوفێربوو ئەو لەبەر بریاری دادگا رایکردبوو، دوای ئەوەی لەگەڵ هاورێ شەریفەکانی بەشداری لە راکێشانی تەرمی خوالێخۆشبوو ئەنس تەها کردبوو لەبەسرا، لەگەڵ عەبدولەتیف سەمیر کا کارەباچی بوو لەگەڵ عەبدولصاحب کە نیمچە ئەفەندی بوو، کە دڵی لە هەموویان باشتر بوو، رەوشتیشی بەرزتر بوو، جگە لەمەش عەبدولکەریم سوینی بوو کە دەرچووی خانەی مامۆستایانی لادێ بوو، تووشی نەخۆشی سیل ببوو. ئەو نەخۆشە سەختەی دەروونی ئەوی پرکردبوو لە رق و کینە، ئەوەی تریش عەبدولحەسەن جەبار بوو کە کارمەندی سەندیکای کرێکارانی مینا بوو لەبەسرا. سێ لەو هارێیانەی کە لەگەڵیان دەژیاین تووشی نەخۆشی سیل بوون. ئەوان رەتیان دەکردەوە کە لە نەخۆشخانە بخەون، تەنها عەبدولدایم نەبێ کە دواتر چووە نەخۆشخانە.

کارەکانی ناوماڵ بەسەر ئەو کەسانە دابەشکرابوو، بەسەر ئێمە کە تووشی نەخۆشی سیل نەبووبوین، ئەوکارانە درابووە، گلەیی شیوعیەکان زۆر ڕاشکاوانە بوو، ئەو کارانە درابوو بەمن کە سەنگینی چیانیەتیم وەک ئەفەندییەک تێکدەشکێنێ. وەک گەسکدان و شوشتنی قاپ و قاچاغی پیس و ڕاخستنی جێگەی خەو، لەگەڵ ئامادەکردنی خواردن و چای کە لە ڕۆژێکدا جارێک من ئامادەم دەکرد.

ئەو ماڵەی تێیدا دەژیاین، لانەیەک بوو لە لانەی شیوعیەکان لە کوێت، ئەوەمان لێ قەدەغەکرابوو لەماڵەوە دەربچین، تەنها بۆ کار نەبێ، نەوەک سیخورێک لە سیخورەکانی نوری سەعید چاودێریمان بکات و بەوە بزانێت لەکوێ نیشتەجێین. هاورێ جەنجون کە لەگەڕەکە دوورەکانی کوێت دەژیا، سەرپەرشتیارمان بوو، کاتێک چەند ژمارەیەک ڕۆژنامەی حزب و بڵاوکراوەکانی دەگەیشتە دەست، بە پەلە بۆلای ئێمەی دەهێنا و بۆ ئەوەی توێژینەوە دیراسەی بڵاوکراوەی حزب بکەین و مشتومڕی لەسەر بکەین.

هاوڕێیان مامەڵەیەکی ڕەق و چەپەڵیان لەگەڵ من و محەمەد حوسێنی برادەرم دەکرد، چونکە ئێمە ئەفەندیین و لە چینی بۆرژوازیین ، شەڕ لەنێوان من وئەوان بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی چی دەخوێنمەوە؟ ئەگەر دەتەوێ چیرۆک بخوینیتەوە، شتێک مەخوێنەوە جگە لە چیرۆکەکانی مەکسیم گورکی و چیخرف ئیلیل هربورگ و یان چیرۆکی نووسەرە شیوعییەکان لەسوریا و لوبنان نموونەی دکروب و حەنا مینە و کەسانی تر. ئەگەر شیعریش دەخوێنیتەوە ئەوا دەبێت شیعرەکانی نازم حیکمەت و بابلۆ نیرودا و ئەو شاعیرە شیوعییانە بخوینیتەوە، لە ڕۆژنامەکانیش دەبێت سەقافەی وەتەنیەی لوبناوی و گۆڤارەکەی ئێمەش تەریق ی شیوعی بخوینیتەوە.

رۆژێک لەیەکێک لە کتێبخانەکانی کوێت چیرۆکێکی نووسەری گەورەی ئینگلیز  د. ه. لورانس دۆزیەوە بەناوی – عاشق لیدی چارلی- هاوڕێیان لەدژی من هەلچوون کاتێک ئەوەیان لەدەستم بینی و خوێندنەوەی ئەو رۆمانەیان لێ قەدەغەکردبوو و دواتریش دەستیان بەسەر داگرت.

سەبارەت بەرادیۆش ئەوا میلەکەی لەسەر ئیزگەی مۆسکۆ لامەدە. بەوشێوەیە لە تەواوی جیهان دابراین تەنها جیهانی سۆسیالیزم نەبی ،وەک ئەوەی ئێمە لەودویی پەردەی ئاسنین بژین، هەرکاتێک مشتومڕمان لەسەر بابەتێک بکردایە و ئەو بۆچوونەم بگوتایە کە باوەڕم بەدروستیەکەی هەیە، تووشی هەرای هاوڕێیان دەبووین، گوایە من بیرکردنەوەی نامۆم لەناو شیوعیەت هەیە. بێگومان هۆکارەکەی پاشماوەی چینایەتیەو ، چونکە من سەر بەچینی بۆرژوازم.

رۆژێک کاتێک جامم پڕ بوو لەسەری رژا، مشتومڕم لەگەڵ لەفتە محەمەد دەکرد کە بەو رستەیە هێرشەکەی دەست پێکرد: ئێوەی ئەفەندی، منداڵی چینی بۆرژوازن، ئێمەی زەحمەتکێشین لە چینی زەحمەتکێشانین. من خۆم بۆ نەگیرا، و هاوارم کرد: وەرە لێپرسینەوەم لەگەڵ بکە. بزانە کاممان ئەفەندی، کاممان زەحمەتکێش. کاممان سەر بەچینی بۆرژوازی و کاممان هەژاریین؟ تۆ مووچەیەک وەردەگری لەمووچەی من زیاترە، جلوبەرگێک دەپۆشی کە لەهی من چاکترە، لەسەر جێگەیەک دەخەوی لە هی من چاکترە، چەند کارێک ئەنجام دەدەی لەکاری من ئاسانترە، تۆ گەسک نادەی و قاپو قاچاغی چڵکن ناشۆی، کاممان بۆرژوازی و کاممان هەژار، ئەگەر لەبەر ئەوە بە بۆرژوازم دەزانی چونکە لە چینێکی هەژار نییم، تۆش سەربە چینی دەسەڵاتداری چونکە باوکت پۆلیس بووە.

هەرکاتێکیش بۆنە نیشتمانییەکان بهاتایە، وەک یادی راپەڕین و لەسێدارەدانی فەهد و مردنی ستالین، ئەوا لەماڵەوە ئاهەنگەکمان ساز دەکرد بەشێکی زۆر لە هاوڕێیانی شیوعی عێراقی ئەوانەی لە کوێت بوون ئامادەدەبوون.

یادی راپەڕین هات هاوڕێیان کۆمەڵێک وتاریان ئامادەکردبوو، لەنێو وتارەکاندا وتاری کەسێکی ئێرانی هەبوو کە ڕەگەزنامەی کوێتی وەرگرتبوو ناوی پیرزاد بوو، وتارەکەی بەزمانی فارسی ئامادەکردبوو،وتارەکەی خوێندەوە ئێمەش گوێبیستی بووین وتی" فەیسەڵ و نوری سەعید و عەبدولئیلاه لە دژی گەلی عێراق ڕێکەوتوون و کۆبوونەوەیەکیان لە کۆشکی زهور ئەنجام داوە."

وام وێناکرد کە پاشای منداڵ چڵمی لە لووت هاتۆتە خوار و جلی سەبازی پۆشیوە و کۆبوونەوەیەک لەگەڵ نوری سەعید و عەبدولئیلاه ئەنجام دەدا، بۆ ئەوەی ڕێوشوێنی دژایەتی گەل بدۆزنەوە، نەمتوانی خۆم بگرم دەستم کرد بەپێکەنین.

هاوڕێیان تووڕەبوون و دژم وەستان و هێرشیانکردە سەر چینە بۆرژوازییەکەم و هەموو ئەفەندییەکانی دونیا، بڕیاریان دا لە ئاهەنگەکە دەرم بکەن و لە نانی ئێوەر بێبەشم بکەن.

لە ئاهەنگێکی تر کە بە بۆنەی مردنی ستالین بوو هاوڕێ عەبدولەتیف سەمیر وتارێکی دا وبانگەشەی بەرووخانی ئیستعماری ئینگلو- ئەمریکی-فەرەنسی کرد هەموومان لەبەر ئەو گوزارشتە دووبارەیە پێکەنین، دواتر شیوعیەکی تر هات وتارەکەی بەوشێوەیە کۆتایی پێهێنا ووتی" بژی مارکسیزم و لینینزم و ستالینزم و مالنکوفیزم، دامە قاقای پێکەنین، سزاکەم ئەوجارە قسەی زۆر ڕەق و بێبەشکردن بوو لە خوان و ئاهەنگەکە.

شەوێکیان هاوڕێ لەفتە محەمەد ئەو قەسیدانەی نازم حیکمەتی دەخوێندەوە، کە دکتۆر عەلی سەعید کردبووەیە عەرەبی، لەفتە لەژێرچر سمێڵە پڕەکەی پێکەنین و بە زمانی زانا و فەیلەسوفێک وتی: دەبینی مامۆستا نازم حیکمەت لە شکسپیر گەورەترە. سەرەرای ئەوەی دەمویست بەسەر سۆزم زاڵ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا رقەکەم دەربرینی بۆ رووبەرووبوونەوەی ئەو چەپڵەیە و رووبەرووبوونەوەی قسەکردن لەسەر مەسەلەی ئەدەب کە هاوڕێ لەفتە هیچی لێ نازانێ .

**ئەلقەی سی وپێنج**

ژمارە: ١٥٠٤

ڕێکەوتی: ٢٩ی تشرینی یەکەم ١٩٥٩

جوێنی هاوڕێیان بۆ هاوڕێیان

نەمدەتوانی دانبەخۆم بگرم لەکوێت بمێنمەوە, دوای ئەوەی هاورێیانی بەشەرەف ژیانیان لێکردم بەدۆزەخ، هاورێیە عەرەبەکەم لەئێران محەمەد حوسێن توانی خۆی لەو مۆتەکەیە نەجات بدات, ئەو ماڵەی بەجێهیشت کە تێیدا لەگەڵمان دەژیا و چوو لەگەڵ چەند عەرەبێکی ئێرانی نیشتەجێ بوو، منیش هەموو ئەو هاورێیانەی دەیانناسم قەومین، دەشتوانم لەگەڵ شیوعییەکان نەبێت.

هەندێک لەو تەنگەتاوکردنەی هاورێیانم لەبیرە کە بۆمەیان دەهێنا، لەوانە لێیان حەرام کردبووین کتێب و دیوانی شیعری لەبارەی دڵداری و سێکس بخوێنینەوە، تەنانەت رۆژێکیان من تووشی سەرزەنشت بووم، چونکە ئەوان بینیان من تەماشای پشیلەیەک و گوربەیەگ دەکەم، گوربەکە دەستی لەپشیلەکە دەداو هاواریشی دەکرد، دیمەنەکە سەیر بوو، بەڵام هاورێیان بەجۆرێکی دیکە لێکیاندایەوە گوایە ئەو کارە.... نەفەسدانێکە بەغەریزەکەم.

من لەناکاو زانیم محەمەد لەو گرژیەی هاورێیان یاخی دەبێت و شەوان ماڵ جێدەهێڵێت و بەدوای کچانەوە دەبێت، کاتێک پرسیارم لەبارەی هۆکارەکەوە کرد، وەڵامی دایەوە کە ئەو یەکێک لەو هاورێیانی بینیوە کە بەسەر جوانی کچێکدا هەڵدەڵێ، کەچی رێگری ئەوەمان لێدەکەن کە خۆیان ئەنجامی دەدەن، ئەوان خوێندنەوەی قەسیدەیەکی سۆزداریمان لێ قەدەغە دەکەن، کەچی خۆیان کارە نەخوازراوەکان ئەنجام دەدەن. کاتێک محەمەد حوسێن ئەوە بەچاوی هاورێی شەرەفمەند دادایەوە، ئەو پاساوێکی لاوازی هێنایەوە کە جێگەی باوەرپێکردن نییە.

گەڕامەوە عێراق بینیم حوکمی عورفی هێشتا کاری پێدەکرێت و پۆلیسیش هاتۆتە ماڵی باوک و بەدوای من و براکەم گەڕاوە کە ئەو کات لەبەغدا بوو، منیش بڕیارم دا بۆ ئێران رابکەم و دواتریش بۆ بۆخارست سەفەر بکەم کە فیستڤاڵی لاوانی تێدا ئەنجام دەدرا.

لەو سەروبەندەدا حزبی شیوعی بوو بە دوو لەت، هەریەکەیان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دڵسۆز بۆ پەیڕەوی مارکسی و لینینی و هەریەکەیان خۆی بەمیراتگری شەرعی هاوڕێی نەمر فەهد دەزانی، یەکێک لەو کوتلانە رۆژنامەیەکی دەردەکرد کە ناوی قاعیدەبوو، ئەویتریشیان رۆژنامەکەی ناوی رایە شەغیلە بوو.

ئەو ئینشقاقە پێشبینی کرابوو، کاتێک دوو هاوڕێ (ع.ج) و (ج.ح) لەگەڵ زیندانییە شویعیەکان لەزیندانی کوت رایانکردبوو، ئەو دوانە خۆیان بەڕێبەر و شێخی مارکسیەت دەزانی. ئەوەی ئەو بڵاوکراوە و رۆژنامەی ئەو دوو کوتلەیە بخوێنێتەوە, ناتوانێت بگاتە بۆچوونێکی یەکلاکەرەوە کە جودابوونەوە و ململانێی ئەوان لەسەر چییە. قاعیدە نامەیەکی بڵاوکردەوە کە چەند رەخنەیەکی لەخۆیەوە گرتبوو کە ئاراستەی حزب و دروشمەکانی کرابوو، بەڕاستی ئەو رەخنانە ماقوڵ بوون، زۆرمان وەک ئەندامانی شیوعی لەگەڵ ئەو رەخنانە دابووین، ئەگەر راشکاو بووینایە.

قاعیدەش لەسەرەتادا بەشێوەیەکی زانستی وەڵامی ئەو رەخنانەی دایەوە، بەڵام بەر لەهیچ ئاماژەیەک و لەناکاو رۆژنامەی هاوڕێیان گوتی: بەمشێوەیە ئەو هەڵپەرستانە بەرەو گۆماوی سیخوری دەخزێن. وەک دەردەکەوێت جەنگەکە لەنێوان قەسابەکان نەبوو وەک پەندەکە دەڵێ، لەوانەیە لەتوانادا هەبێت (ج.ح) و زۆرڕەوەکەی (ح س) کە ئەوکات قاعیدە وای وەسف کردبوو بگەڕێنەوە لەلایەن (ع ج) و جەماعەتەکەی دابنشین لەلیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی

بەکرێگیراو. قاعیدە کە زمانحاڵی حزبی شیوعی بوو لەکاتی ململانێیەکە نووسیی بووی: لەسەرمانە ئەوانە-مەبەست جەماعەتی رایە شەغیلە بوو- بخەینە گۆماوی سیخورییەوە. جەماعەتی رایە شەغیلەش بەگاڵتەوە وەڵامی ئەوانیان دایەوەو بەو مانایە کە گوتبوویان: بژی حزبی شیوعی کە خەبات دەکات لەپێناوی ئەوەی خەڵکی بەشەرەف و تەنانەت شیوعییەکانیش بکات بەسیخوڕ. قاعیدە ئەوکات لەزنجیرە ژمارەکانی خۆیدا چەند لیستێکی لەناوی ئەو هاوڕێیانە بڵاوکردەوە کە لەهاوڕێیانی رایە شەغیلە بوون و کە ناوەکانیان هەڵبەتە خوازراو بوون سوکایەتی بەوان کردبوو، رایە شەغیلەش وەڵامی دایەوە لەزنجیرەیەک ژمارەی خۆیدا بەوەی کە بەدڕەوشتی لەرێزەکانی ئێمەدا نییە بەڵکو لەریزەکانی قاعیدەکان هەیە، ئەویش لیستی خەباتگێرە ژنەکانی قاعیدە و ئاکاری ئەوانی بڵاوکردەوە.

دەمەوێت لەسەر زۆر کاری ئەوان بدوێم کە بەچاوی خۆم بینیومە، بەڵام ئەو پلانەی کە رۆژنامەی حوریە جێبەجێی دەکات رێگرم لێدەکات وردەکاری ئەوانە بگێڕمەوە کە بینیومە.

کاتێک گەڕامەوە گوندەکەم لەعێراق بینیم لەتیفینۆف تێیدا بەرپرسی حزبە، ئەو لەقاعیدە بوو ئێستایش وەک زەرورەتێک قاعیدەیە، لەرێگای لەتیفینۆف نامەیەکم بۆ لیژنەی مەحەلی حزبی شیوعی عێراقی لەبەسرا رەوانەکردو لەنامەکەدا ئارەزووی خۆم نیشان دابوو کە سەفەری ئێران بکەم و لەوێشەوە بۆ بۆخارست، حزب نامەیەکی راسپاردەی بۆ حزبی تودە پێدام لەوێوە زانیم کە هێمایەکی تایبەت هەیە لەلایەن حزبە شیوعییەکانەوە, ئەگینا چۆن نامە بۆ یەکتر دەنێرن، چۆن حزبی تودەی فارسی لەو نامەیە دەگات کە زمانەکەی

عەرەبییە؟ تەنانەت ئەگەر بەزمانی فارسیش بێت چ زامنێک هەیە کە ئەو نامەیە هی حزبی شیوعی عێراقییە.

لەئێران لەموحەمەرە یان وەک ئەوەی ئێرانییەکان بەخورەمشەهر ناوی دەبەن, نامەکەم دا بەهاوڕێ موسا پەیمان یان بەموسا ئەسەد کە لەعێراق وا ناودەبرێت, کە بەقودرەتی قادر دواتر بوو بەمولحەقی رۆژنامەوانی باڵوێزخانەی عێراقی لەبەیروت، ئەو عێراقەی کە بەشێکی دانەبڕاوە لەنەتەوەی عەرەب وەک ئەوەی لەدەستووری کاتی هاتووە، موسا پەیمانیش ئەو نامەیەی گەیاندە حزبی تودە لەتاران و منیش چاوەڕوانی ئاماژەیەکم دەکرد بۆ ئەوەی بچمە تاران.

ئەوەی لەو سەروبەندە خەڵکی بەخۆیەوە خەریک کردبوو، ئەو رووداوە بوو کە لەکاتی گردبوونەوەیەکی حزبی تودە روویدا، کە بەبۆنەی یەکی ئایاری جەژنی کرێکارانەوە ئەنجامیان دابوو، کە دوای ماوەیەکی کەم پۆلیس هێرشی کردبووە سەریان و پێکدادان لە نێوان ئەوان و پۆلیس روویدا، یەکێک لە پۆلیسەکان گوللەیەکی بەر قاچی کەوتبوو، شیوعیەکان وا نیشان دەدەن کە گوایە ئەو پۆلیسە خۆی تفەنگەکەی لەدەست دابەزیوەو گوللەکەی خۆی بەرکەوتووە، بەڵام ئەوانەی شیوعی نین و لایەنگری تودە بەوە تۆمەتبار دەکەن کە تەقەیان لەو پۆلیسە کردبێ و تەنانەت ئەوان کەسێکی دیاریکراو بەتەقەکردن تۆمەتبار دەکەن.

بەڵام ئەمە لەچیرۆکەکە گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەو پۆلیسە برایە نەخۆشخانەو لەوێ قاچێکی بڕایەوە، ئەو قاچە بڕاوەشی درایە یەکێک لەکارگوزارەکانی نەخۆشخانە بۆ ئەوەی بەپێی ئایینی پیرۆز بنێژرێت، ئەو کارگوزارە بەشەرەفەش یەکێک بوو لەخەباتگێڕانی سەر بەحزبی تودە، لەبری ئەوەی ئەو پارچەی لەشی ئەو پیاوە موسڵمانە بنێژێت، دەچێت قاچەکە لەقەسابخانە فرێدەدات،

سەگەکانیش ئەو قاچە هەڵدەقۆزنەوە پارچە پارچەی دەکەن، شیوعییەکان بەمە دڵخۆش بوون و دەیان گوت: قاچی سەگ بۆ سەگە.

ئەوانەی تاوانی شیوعییەکانیان لەلای ئێمە بینیوە لەکوشتن و سەربڕینی منداڵان و دواتریش فرێدانی لاشەکانیان بۆ ناو بەرمیلی زبڵ و چەندین تاوانی نەخوازراوی دیکە، دەپرسن ئایا شیوعییەکان جگە لەعێراق لەوڵاتانی دیکەیش بەو کارە قێزەوەنانە هەڵساون؟ بەڵێ شیوعییەکان لەهەموو شوێنێک تاوانی دڕندانەی ترسناکیان ئەنجام داوە: لەکیرالا و لەئێران و لەعێراق و زۆر وڵاتی دیکە، تەنانەت حزبی تودە لەوەتەی شۆرشی پیرۆز روویداوە تا ئێستا دەیان ئەندامی خۆی ناردۆتە عێراق بۆ ئەوەی هاوڕێیانیان لەشیوعی عێراقی فێری شێوازەکانی کوشتن و ئەشکەنجە و تیرۆرکردن و غافڵکوژی بکەن، کە شیوعیەکانی ئێران تێیدا کارامەن و لەژێر سەرپەرشتی شارەزانیانی کۆماری ئازەربایجانی شیوعی مەشقیان کردووە. بەڵام شیوعییەکانی عێراق دەبەنگن و نازانن بەتاوانەکانیان هەڵسن و دواتریش ئاسەوارەکانیان لەدوای خۆیان بسڕنەوە.

ئەو ساختەکردنەی کە لەوێنەیەک ئەنجامیان داوەو بەناوی دانیشتنێکی نەتەوەیی یەکێک لەڕۆژنامەکانیان بڵاویکردۆتەوە هەندێک لەوێنەکەیان قوتکردووە، کە هەندێک ئەدیب و بەئەدیبکراوی شیوعی تێدا دەرکەوتووە هاوڕێیان روویان سریوەتەوە. زوو ئاشکرابوو، چونکە هەریەکێک لەو کەسانە کۆپیەکی لەهەمان وێنە هەیە، هەر زووش رۆژنامەی حوریە ئەو وێنەیەی بەتەواوی بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی بۆ هەموو کەسێکی دادپەروەر دەربکەوێت، کە شیوعییەکان ساختەکار و درۆزنن لەهەموو ئەو شتانەی دەیڵێن و دەینوسن و ئەنجامی دەدەن.

## ئەلقەی سی وشەش

ئەزمونم لەگەڵ تودە

ژمارە: ١٥٠٦

ڕێکەوتی ٠اتشیرینی دووەم ١٩٥٩

هێمای ئەوە لەلایەن موسا پەیمان یان موسا ئەسەد وەک ئەوەی
لەعێراق ناودەبرێت، بۆ هات, کە دەبێت سەفەری تاران بکەم و لەوێ
پەیوەندی بەحزبی تودە بکەم. ئەو ئەدرەس و نامەی پێناسەی
پێدابووم، شەمەندەفەرەکە قەرەباڵغ بوو بەشێوەیەک نەمتوانی
شوێنێکی پلە دووش بەدەست بهێنم، بەڵێنی ئەوەیان پێدام کە دوای
سیانزە رۆژی دیکە شوێنم بۆ دابین بکەن، نائومێد دەبووم ئەگەر
موسا قسەی لەگەڵ سەرۆکی کانیتینەکەی شەمەندەفەرەکە
نەکردابوایە, ئەو قسەی لەگەڵ کردبوون ئەو کرێیەی پێدا کە بۆ
نەفەرێکی پلە دوو دەدرێت، ئەویش رێگەی پێدام لەکاتنیتەنەکە
دابنیشم و ئەوەشی پێسپێردا کە من بگەینێتە تاران، شەمەندەفەرەکە
تازە جووڵەی کردبوو، کە یەدوڵلا هات, ئەوە ناوی سەرۆکی
کرێکارانی کانتینەکە بوو، پرسیاری ئەوەی لێکردم کەچی دەخۆم یان
دەخۆمەوە، دیار بوو کە نابێت کەسێک دابنیشێت هیچ نەخوات و
نەخواتەوە، هێندەی پێنەچوو کە پشکنەر هات لەبری ئەوەی یەدوڵلا
بەهانامەوە بێت کە ئەو پارەی کرێی نەفەرێکی لەمن وەرگرتبوو،
کەچی ئەو خەبەری لێدام و گوتی ئەوە عەرەبە, پشکنەرەکە
بەدووقات کرێ سزای دام. جا حیسابی ئەو پارەیەم کرد کە بە
یەدوڵلا و پشکنەرەکەم داوە زۆر لەوە زیاتر بوو کە بۆ تاران سواری
فرۆکە بوام، رۆژی دواتر لەبارەگەکەیدا پەیوەندیم بەتودەوە کردن
ئەو بارەگایەک بوو لەمەڵبەندەکانی گەنجانی دیموکراسی. تەواو وەک

ئەوەی لەعێراق هەبوو کە بارەگای لاوان و سەندیکا و یەکێتی قوتابیان ببووە لقیک لەلقەکانی حزبی شیوعی. ئەوان داوایان لێکردم دوو وێنەی فۆتۆگرافیان پێبدەم, بۆ ئەوەی پەساپۆرتێکی ئێرانیم بۆ پەیدا بکەن. لەو بارەگایەی تودە یەکێک لەوان یاوەری کردو پرسیاری ئەوەی لێکردم کە بەستەنیم تام کردووە, منیش بە نەخێر وەلامم دایەوە، منیش نەمدەزانی کە بەستەنی لەگەڵ دۆندرمەی دایە، بۆیە بە دۆندرمە داوەتی کردم و لەکاتی دانیشتن پرسی پایتەختی عێراق چییە؟ منیش لەبەرئەوەی فارسیم نەدەزانی وا تێگەیشتم پرسیار لەبارەی مەلیکی عێراقەوە دەکات. منیش وتم فەیسەڵی دووەم، ئەویش باوەری بەوە کرد. فەیسەڵی دووەم پایتەختی عێراقە, ئەمەیە زانیاری هاورێیانی تودە لەبارەی عێراق و بارودۆخەکەی. هەر لەسەر بنەمای ئەو زانیاریە قولانەش حزبی بەکرێگراوی شیوعی عێراق پەنا دەباتە بەر حزبی تودەو راوێژی پێدەکات لەکاروباری ئێمە کە ئەوان ئاگایان لێ نییە. ئایا ئەمە لەبەر مەسەلەی خوێنە کە لەجەستەی هەندێک فارسی بەعەرەبکراوی عێراقی هەیە, یان ئەرکی شیوعیە گوێڕایەلی فەرمانەکانی مۆسکۆ بێت. کاتێکیش فەرمانی پێ دەگات کە دەبێت رێنامییەکان لەحزبی شیوعی ئێران وەربگرێت ئەوە چارەیەکی نییە جگە لەگوێرایەڵی.

ئەوەی ماوەیەکی کورتیش لەتاران ژیا بێت و لەماوەی ستەمی شیوعیش لەعێراق بوبێت، درک بەوە دەکات, کە حزبی شیوعی چەندە سوودی لەتودە بینیوە. رێپێوانەکانیان هەر ئەو دروشمانە دەڵێنەوە کە هی حزبەو شیعری بۆ هەڵبەستراوە لەگەڵ ئاوازێکی سادە. تەواو وەک ئەو رێپێوانانەی کە حزبی بەکرێگراو لەشەقامەکانی بەغدا و شارەکانی دیکە دەخولایەوەو دەیانگوت "حزبی شیوعی بۆ دەسەلات داوایەکی مەزنە.. پیلانێک ئەنجام نادرێت.. پەت ئامادەیە."

لەتاران بەچەندین شیوعی ئێرانی گەیشتم، لەوانەی کە عەرەبیان چاک دەزانی، چونکە ماوەیەک لەعێراق کاریان کردبوو یان ژیابوون، دواتریش دوای شۆرشی تەمموز لەمن و عەرەبەکانی عێراق و رۆڵەکانی سەدان ساڵە زیاتر ببوونە دڵسۆز و چێژیان لەخێروبێرەکەی وەردەگرت. یەکێک لەوان مامۆستایەک بوو لەقوتابخانەیەکی ئێرانی پێش چەند ساڵێک هاتبووە عێراق و رەگەزنامەی عێراقی وەرگرتبوو.

بێگومان حزبی هاوڕێیانی عێراق لەحزبی برای ئێرانی سوودیان وەرگرتووە لەوەی سەفەر و سەیرانێک نییە کە هاوڕێیانی ژن و پیاو رێک بخەن کە زوو دەبێتە ئاهەنگی حزب و وتار و شیعری تێدا دەخوێنرێتەوەو سرود و گۆرانی تێدا دەگوترێت و ژنانی هاوڕێیانیش سەمای خۆیان دەکەن.

بەیانی رۆژێکی هەینی لەگەڵ تودەییەکان گەشتێکمان کرد، هەرزوو لەگژوگیای بێستانێکی جوانمان راخست. ئیدی گوێمان گرت لەگۆرانیەکانی حزب و وتار و قەسیدە، منیش یەکێک لەقەسیدەکانی خۆم بەزمانی عەرەبی خوێندەوە کەلەسەر ئاشتی بوو، دواتریش بۆ ئامادەبووان کرایە فارسی، یەکێک لەهاوڕێیان کۆپی کردو بەقوتابیەکانی خۆی دا لەیەکێک لەقوتابخانەکانی ناوەندی بۆ وانەی ئەدەبی عەرەبی. لەو گەشتەدا چەند هونەری خۆشەویستی فێر بووم، کە پێشتر نەمدەزانی. ئەویش تەنها لەرێگای روانینم بوو بۆ کەسانی دیکە.

ئێستاش ئەو کیژۆڵە ئێرانیەم لەبیرە، کە لەشێکی تۆزێک گۆشتنی هەبوو، کاتێک بەرەو ئۆتۆمبێلەکانمان دەگەڕاینەوە رایدەکرد و دەیان گەنج تێنوو بەحەسرەتەوە بەدوای ئەودا رایان دەکرد، ئەگەر ئەو تایە

نەبووایە کە لەوکاتە گرتبووم، منیش لەنێو ئەو گەنجان بووم رام دەکرد.

لەوێ بەدکتور جەعفەر رەحمانی گەیشتم کە بەرەچەڵەک عێراقییە و خەڵکی کوردستانە، دەسەڵاتی رژێمی پێشوو رەگەزنامەی عێراقی لێ سەندبووەوە, دواتر وەک دکتۆرێکی سەرکەوتوو لەئێران دەژیا و لەپاڵ کارەکەی تێکەڵ بەکاری سیاسەت ببوو، تا ئەو رۆژەی کۆدەتاکەی زاهیدی کرد دەسەڵاتدارانی ئێران و حوکمی دوو ساڵ زیندانی بۆ درا, چونکە یەکێک لەهاورێیە خەباتگێرەکان خەبەری لێدابوو، وەک دکتۆر رەحمانی خۆی گوتی. دوای شۆرش هەوڵی دا بگەرێتەوە وڵات، کەچی جارێکی دیکە دەستگیر کرایەوە, لەکاتێکدا هەموو خەڵکی موحەمەرە و عەبدان دەزانێت کە موسی ئەسەد شیوعیە لەحزبی تودەیە, کەچی رۆژێک دەسگیر نەکراوە و کاری لەدەست نەداوە و ئازارێکی پێنەگەیشتووە! خوا خۆی کاری بەندەکانی دەزانێ.

بینیم حزبی تودا زۆر بایەخ بەرووداوە پێشکەوتخوازەکان و نیشتمانییەکانی ئێران دەدات، بۆ نموونە شیوعییە ئێرانییەکان ئاهەنگی گەورە بە بۆنەی رۆژی مەشروتیەت دەدەن، وابزانم بەپێی ئەوەی ئەو کات لەرۆژنامەکانی ئێرانم خوێندۆتەوە کە ئەو رۆژە چەند کەسێکی ئێران داوای جێبەجێکردنی روحی دەستورییان لەئێران کردبوو.

کەچی تەنها ئەوانەی بەرەجعی ناودەبرێن ئەوان بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری عەرەب محەمەد دەکەن کە مەزنترین پیاوە لەمێژوودا. ئەو رۆژنامانەی کە زۆرترین خوێنەریان هەیە یادێکی مردن و لەدایکبوونی لینین دەرباز ناکەن, دواتریش ئەو خیانەتەی حزبی تودە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی گەلی ئێران کرا، کاتێک رێگەیان دا بەزاهیدی کۆدەتا بکات و سەرەرای ئەوەی کە ئاگاداری بوون،

لەترسی ئەوەی نەوەک ئازارێک بەیەکێتی شورەوی بگات. وەک هەمووومان دەزانین و پێشتریش لەبارەیەوە نوسیبووم.

ئەو کاتەی کە زاهدی سێ لۆری پڕ لەسەرباز و شەقەوەکانی خۆی کردبوو، کۆدەتایان کرد، شوعییەکان لەکون و قوژبنەکان خۆیان حەشار دابوو، پاساویشسیان ئەوە بوو کە ئەگەر ئەوان دەسەڵات بەدەستەوە بگرن، ئەوا ئەمریکا تەدەخول دەکات و ئەمەش هەڕەشەیەکی ترسناک دەبێت بۆ سەر یەکێتی سۆڤیەت. ئەگەر ئەو بیانووەش قبوڵ بکەین ئەوا دەپرسین: ئەگەر لەتوانایان هەبوو رێگری لەکۆدەتاکەی زاهیدی بکەن و ئینجا موسەدەق و حکومەتەکەی بهێڵنەوە، ئەوکات بیانویەک ودەرفەتێک دەبوو بۆ ئەوەی ئەمریکا تەدەخول بکات. یان شیوعییەکان هەر کەسێک شیوعی نەبێت بەسیخوری ئیمپرالیزمی دەزانێت جا موسەدەق بێت یان زاهیدی؟

## ئەلقەی سی و حەوت

ژمارە: ١٥.٧

ڕێکەوتی: ٢ تشرینی دووەم ١٩٥٩

چەند نموونەیەک لە ئاکاری شیوعیەکان

لەدوایین رۆژەکانی حوکمی دکتۆر موسەدەق نێردراوێکی حزبی شیوعی عێراقی هاتە لام، لەو باڵە بوو کە رایە شەغیلەیان دەردەکردو رۆژنامەکەی زمانحاڵی بوو. ئێمەی شیوعی کە هەر سیانمان بەیەکەوە لەیەک ژووردا بووین و جەماعەتی قاعیدە بووین، ئەو پیاوەمان بە فحل توس ناو دەبرد, ئەو ناوەشمان لەو وتە عەرەبیە وەرگرتبوو کە دەڵێ" فحل التوت بالبستان هیبە". دارێکی گەورەی زرتووە لەبێستان و بێ کەڵکیشە. ناچاربووین رێگەی حەوانەوەی لەژوورەکەمان پێ بدەین، چونکە سەرەڕای هەموو شتێک ئەو شیوعیەکی عێراق بوو. ئەو لەسەر داوای حزب هاتبووە ئێران بۆ ئەوەی بەهاوکاری حزبی تودە ئامێرێکی چاپی بچوک بکڕێت, بۆ ئەوەی حزبی پێشەنگ لەخەباتەکەیدا لەپێناو نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار بەکاری بهێنێ.

رۆژێکیان دوای کۆدەتاکەی زاهیدی دکتور حەکاک هاتەناومان, ئەو پزیشکی ددان بوو ئێرانی بوو, بەڵام ماوەیەک لەعێراق ژیابوو، ئێمە ناومان نابوو حەکاک، دکتۆر بەهەڵچوونەوە هات و هاواری لەئێمە کرد کە فحل توس دەربکەین. هەرچیەک دەبێت بەجەهەنەم و

ڤیروسیا. کاتێک پرسیارمان لەهۆکارەکە کرد، گوتی جەماعەتێک کە ئەو باوەڕیان پێدەکات فحل توسیان بینوە لەدەروازەی قەزوین لەشەودا بەماوەیەکی کەم لەقەدەغەکردنی هاتوچۆ. ئەو دەروازەی قەزوینە مەیدانی تارانە یان گەڕەکێک و چەند شوێنێکی دیکە بەدڕەوشتی تێدا دەکرێت.

ئایا ئەمەیە خەبات؟ کە تۆ جووتیار و کرێکاری هەژار کەوڵ بکەیت بە کۆمەک و ئابوونە بۆ ئەوەی پارەیان بۆ حزبی شیوعی بهێنی. دواتر بەکەسێکی وەک فحل توس بدەیت بۆ ئەوەی سەرخۆش بێت و بەنیازە پیسەکانی بگات لەدەروازەی قەزوین؟ ئەویش تەنها کەسێک نییە، بۆ خوێنەری بەڕێز باسی مانگرتنەکەی کۆمپانیای نەوتی بەسرام کرد کە چۆن نوێنەری حزبی شیوعی و جەماعەتەکەی مریشکیان دەخوارد و سەرخۆش دەبوون و تاوانیان دەکرد.. کەچی ئارەزووی جگەرەیەک یان قونکە جگەرەیەک لەسەری کرێکارەکانی دیکە دەخولایەوە، ڕووداوێکی دیکەی هاوشێوەی ئەوەم بینی، ئەوکاتەی لەهاوینی ١٩٤٨ لەگرتوخانە بووم، ئەو کرێکارە شیوعیانەیان هێنایە گرتووخانەکە کە سەرۆکایەتی مانگرتنی کرێکارانی نەوتیان کردبوو لە(ئێچ پری)، شەوێکیان شەڕ لەنێوانیان ڕوویدا، یەکتریان تۆمەتبار دەکرد یەکێک لەو تۆمەتانەش پەیوەندی بە بڕێک پارەوە هەبوو, کە لەکرێکارانیان وەرگرتبوو بۆ ئەوەی لەمانگرتنەکە خەرج بکرێت، یەکێک لەوان وای نیشان دەدا کە پارەکە تەواو خەرجکراوە، ئەوانیتریش تۆمەتباریان دەکرد و دەیانگوت ئەو شتە و ئەو شتەی کڕیوە، بەشێکی پارەکەش سەرخۆش بووە، هێشتا هەندێکی دیکەیشی گلداوەتەوە، کەچی ئەو هاوڕێیە تۆمەتبارە وەڵامی

ئەو تۆمەتانەی دەدایەوەو گوتی "ئەوانەی بەخەرجکردنی کۆمەکییەکە تۆمەتبارم دەکەن ئەندامانی حزبە هەلپەرستەکەی شەعبن و مەبەستیان ناوزراندنی ئەندامانی حزبی شیوعی یەکێک لەوانەی کە تۆمەتباریشی دەکرد گوتی: تیتۆیی و لادەر.

دوو هاورێی خەباتگێر پێداگریان کرد بۆ ئەوەی بەیەکەوە بچینە دەروازەی قەزوین، لەبەر ئەوە نا کە وەک فحل توس بکەین، بەڵکو بۆ ئەوەی تەنها سەیری شوێنەکە بکەین، پێداگری ئەوان شوێنی خۆی گرت، شەوێکیان چووینە ئەوێ، لەدەرگای زۆر ماڵی بەدکار نووسرابوو: ئەمە ماڵی موسەدەقە.

زۆر لەو ماڵانەی مەیخانەشیان تێدایە، سەرەرای کارەکەی تریان، بیرەی تێدا دەفرۆشێت بۆ هەریەکێک بیەوێت، ئێمەش داوای سێ بوتڵ بیرەمان کردو لەهەیوانی ماڵەکە دانیشتین دەمانخواردەوە، لەیەکێک لەمێزەکانی نزیکمان سێ گەنجی ئێرانی دانیشتبوون، قسەیان دەکرد کە ئێمەیان بینی قسەکانیان بڕی. کاتێک بینیان ئێمە بەعەرەبی قسە دەکەین لەنێوان خۆیاندا دەستیان بەقسەکان کردەوە، تێبینی ئەوەشیان کرد کە زمانە فارسیەکەی ئێمە خواروخلیچە کاتێک کە قسەمان لەگەڵ کەسانێک کرد لەهەیوانەکە تێدەپەڕین، زانیان ئێمە بیانین.

لەقسەکانی ئەو گەنجە ئێرانیانە بۆمان دەرکەوت کە ئەوان ئەندامانی تودەن، ئەوان لەوشوێنەدا کۆبوونەوەی حزبی دەکەن کە چاوی پۆلیسی تەحقیقاتی جینایی نایانبینین، بێگومان بۆ ئەوە هاتوونەتە ئێرە کۆبوونەوە بکەن، حزبی شیوعی عێراقیش شێوازێکی هاوشێوەی ئەو

شێوەیە بەکار دەهێناو کۆبوونەوەکانی لەمەیخانەو قەحپەخانەکان ئەنجام دەدا.

یەکێک لەوانەی لەو رۆژگارە سەختەدا هاتبووە تاران مامۆستا (ج،س) بوو، ئەو شیوعیە ماقوڵە، کە بەڕاستی ئەو دڵسۆزترین کەسە بۆ یادی فەهد و زۆرترین قوربانی داوە. حزبی شیوعی عێراقی کە ئێستا سەرسەخترین دوژمنی فەهد لەسەرۆکەکانی حزبی شەعب دەستیان بەسەر داگرتووە، کە هەر دوژمنایەتی فەهدیان دەکرد، فەهدیش تا دوا رۆژی ژیانی سەرۆکایەتی دەکرد، کەچی حزبی شیوعی نموونەی ئەو ئەندامە پاک و دەستپاکەی لەخۆیەوە نەگرتووە.. ئەگینا حزبی شیوعی رێگای کوشتن و کەوڵکردن و ساختەکردنی نەدەگرتبەر.

ئەو ستایشتەی کە بۆ خەباتگێڕ(س،ج) دەکەم، حزبی شیوعی لەسەری دەکاتە بیانویەک، بەوەی کە ئەو شیوعیەکی جیاوازە، ئەگەر وانەبێت چۆن کەسێکی دواکەوتووی هەڵگراوەی پیلانگێری وەک من ستایشی دەکات. بەڵام ویژدانم داوام لێدەکات کە راستی بڵێم. من رێز لەو پیاوە دەگرم، چونکە شیوعیەکی چاکە، نەهاتۆتە ناو جوڵانەوەکە بۆ ئەوەی پارە کۆبکاتەوەو دواتر باڵاخانە بە ٦٠ هەزار دینار بکڕێت وەک هەندێکیان، یان ژن بهێنێت و ئاهەنگەکەشی لەئاهەنگی کوڕی وەزیرەکان بێت، وەک هەندێکی دیکە کردیان. لەبەر ئەوەش نەبوو کە پۆست وەربگرێت. پارچە زەویەکی دارخورمای هەبوو لەکازمیە وابزانم لەو ساڵانە درودرێژەی کە لەزیندان و راکردن و دەربەدەری و بێکاری ئەو زەویەی فرۆشت.

شیوعیەکی عێراقی-ئێرانی کە دارتاشە کە پێشتر لەکازمیە نیشتەجێ بوو، ٨٠ تومەنی لەمن بەقەرز وەرگرت لەگەڕانەوەشم بۆ وڵات پشتم بەو پارەیە دەبەست. دوای کۆدەتاکەی زاهیدی دوای ئەوەی پارەکەم نەما، چەند تومەنێک نەبێت. داوای ئەو قەرزەم لەو هاوڕێیە کردەوە بینیم خۆی دەدزێتەوە. پێمگوت من ناتوانم بگەڕێمە وڵاتەکەم و تەنانەت ناتوانم لەتارانیش بژیم ئەگەر ئەو پارەیەم بۆ نەگەڕێتەوە یان بەلایەنی کەمەوە نیوەی وەرنەگرمەوە. بەڵام هێشتا خۆی دەدزیەوەو رایدەکرد بەبیانوی ئیش وەستاوە، پێمگوت شتێک لە کەلوپەلەکانی بفرۆشێت. بەڵام گوێی لەهەموو ئەو پاڕانەوەیەی من کەڕ کرد.

هاتنی مامۆستا (ج س) بۆمن وەک رەحمەتێک بوو کە لەئاسمانەوە هاتبێت. ئەو پێویستی بەجێی خەو و قەرەوێلە هەبوو. منیش جێگاو قەرەوێلەی خۆم پێ فرۆشت. بەو پارەیە توانیم سواری شەمەندەفەربم بەپلەی سێ بۆ موحەمەرەو لەوێشەوە بۆ عێراق.

رەنگە پرسیاری ئەوە بکرێت: چۆن زاهیدی توانی بەسەر حزبی تودە و ملیۆنەها لایەنگری زاڵ بێ؟ لەوەیاندا حکومەتەکەی رێگایەکی زۆرزان و زیرەکانەو بە بەزەییانەی گرتەبەر.. بێگومان پۆلیس ژمارەیەکی زۆر تودەییەکان دەناسی. کاتێک یەکێکی دەستگیر دەکرد، چەند رۆژێک دوای گرتنی بەوشێوەیە قسەی لەگەڵ دەکرد: شوعییەت لەئێران کەوت. ئومێدێک بۆ هەڵسانەوەی نییە. تۆ ساڵانێکی زۆر دەستگیر دەکرێی و چەندەها جۆر زەحمەتی دەکێشی بۆچی؟ بزووتنەوەی شیوعیەت زیندوونابێتەوە. ئومێدی ئەوەش نییە کە سوپای سور ئێران داگیر بکات بۆ ئەوەی شیوعیەت لەدەست

حکومەتە نیشتیمانییەکەی نەجات بدات، کەواتە تۆ لەپێناو هیچ و بەبێمانایی قوربانی دەدەیت، جا وەرە پاکانەکەت بنووسە لەحزبی تودە لەگەڵ مێژووی چوونە ناو حزب و لەگەڵ ناوی ئەوکەسانەی کە تۆیان پاڵاوتووە یان کۆبوونەوەت لەگەڵ کردوون، بەمەش لەگرتووخانەکە دەردەچیت و دەبیتە هاوڵاتییەکی چاک کە کار و بژێویی و ئایندەت لەپێشدایە.

هاورێی خەباتگێر پاکانەی دەکردو بەلایەنی کەم ناوی پێنج کەسی لەئەندانی حزب دەدات و ئەو پێنج کەسەش دەستگیر دەکران و هەر یەکێکیش لەوان ناوی پێنج هاورێی دەدات. بەمشێوەیە بەسەر حزبی بەکرێگیراو زاڵ بوون. تەنها کەمێک نەبێت کە کاتی ستەمی شیوعی لەعێراق گەیشتە لوتکە ئومێدێک لەدڵیان زیندووەو جا دەستیان کرد بەوەی کە بۆ وڵاتی ئێمە دزە بکەن و بۆ ئەوەی بەشداری خەبات بکەن، چونکە شیوعی دان بەنیشتمان دانانێ، کاتێک خەبات لەپێناو بورژوازیەت و رەجعیەت و نەتەوەیی بێت لەهەر شوێنێکدا. ئەوە پەیامێکە شیوعی دڵسۆز لەپێناو ئوممەیەتی شیوعی دەیگەیەنێ.

لەیەکێک لەخۆپیشاندانەکانی هاورێیانی عێراق گەنجێکم بینی کە رووخساری لەنێرەمووک دەچوو، سەمای دەکردو چەقەنەی لێدەدا و ئەو گۆرانییەی دەگوت:

**لو نزلوني للقبر يبا**

**اهتفت تعيش الاممية**

**ئەلقەی سی و هەشت**

ژمارە: ١٥٠٩

رێکەوتی ٤ ی تشرینی دووەم ١٩٥٩

کۆتایی وەرچەرخانەکە

گەڕامەوە عێراق دوای ئەوەی ئەزمونە تاڵەکەی ئێرانم بینی، بینینم کە چۆن پێشەنگە وشیارەکەی ئێران لەحزبی تودە بەرژوەندەی ملیۆنان کەس لەئێران دەکەنە قوربانی بۆ پاراستنی بەرژوەندی کەعبەی شیوعییەکان و دایکی دڵسۆز، کە بە راشکاوی ئاماژەیەکی بۆ نادرێت تەنها لەبەر ترسان لەبەرژەوەندی ئەو وڵاتە نەوەک زیانی پێبگات، ئەگەر ئەو وڵاتە زیان و شەڕی پێبگات، ئەوا بەهای خەباتی شیوعییەکانی ئێران و ئاسودەیی گەلی ئێران و باشبوونی بارودۆخی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەچی دایە. لەبەرامبەر ئەو نسکۆیەی کە تووشی مرۆڤایەتی دەبێت کاتێک قەیسەری سوور شەوێک یان دوو شەوان، شەونخونی بکات و لەوە بترسێت کە ئەمریکای دوژمنایەتی لەئێرانەوە بۆ وڵاتەکەی ئەو بگوازێتەوە.

بەهۆی مامۆستا عەبدولڕەزاق شێخەلی برادەرم توانیم کارێک لەبەڕێوەبەرایەتی هاوردەکردن لەبەغدا بدۆزمەوە، بۆ خوێنەر باسی ئەو دوو قەسیدەیەشم کرد کە دەمویست بڵاویان بکەمەوە، کە چۆن

هاوڕێیان فەرمانیان دەکرد کە "چەکەکان و منداڵەکان" بەر لە "سۆزانی کوێر" بڵاوبکەمەوە. باسی ئەو توڕەبوونەشم کرد کە سۆزانی کوێر لەناو شیوعییەکانی دروستکرد کاتێک ئەو قەسیدەیە لەشیوعیەکان و شعوبیەت و دوژمانی عەرەبی دەدا. وەک لەو کتابە باسم کرد .

هێشتا شیوعییەکان لەگەڵم دادەنیشتن و داوایان لێدەکردم شتێک لەشیعرەکان بخوێنمەوە، دانیشتنەکانی خوردانەوە لەگەڵ ئەوانی کۆدەکردمەوە, لەو کاتەدا مامۆستا محێدین ئیسماعیل کەتەنها لەناسیاوێکەوە بووە یەکێک لەبرادەرە نزیکەکانم، محێدین وەک من شیوعیەکی هەڵگەڕاوە بوو، هەر کاتێک لەو دانیشتنانە بووینایە ئەوا دەستمان بەمشتومڕ دەکرد لە بارەی فەلسەفەی شیوعیەت و رژێمی شیوعی و کەموکوڕیەکانمان دەردەخست. بیرم دێ شەوێکیان ئەو هەقیقەتەمان دەرخست. کە دەرخستنی پێویستی بەزیرەکییەکی زۆر نییە: بەگوێرەی مارکسیەت دەبێت شۆرشی پرۆلیتاری لەوڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی لەئینگلترا و ئەمریکا و ئەلمانیا و یابان رووبدات, کە ژمارەی کرێکاران یان چینی کارکەر وەک یەکێک لەهاوڕێیان ناوی دەبات دەگاتە ملیۆنان یان هەندێک جار دەگاتە دەیان ملیۆن، بەڵام مەسەلەکە بەپێچەوانەوە روویدا، شۆرشی پرۆلیتاریا لەڕوسیای قەیسەری و چین روویدا کە ئەو دووانە لەڕووی پیشەسازی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە دواکەوتوون.

کەواتە شۆرشی پرۆلیتاری یان رژێمی شیوعی لەراستیدا وەک میکرۆبێکە تەنها لەو کۆمەڵگایە دواکەوتوو و نەخۆشانە گەشە دەکات

و دواتر رژێمی شیوعی دێته کایەوە، بەبۆچوونی فەلسەفەی مارکسیەت رێرەوە سروشتی و حەتمیەکەی مێژوو بەرەو سۆسیالیزم و شیوعیەتە، ئەوەی شۆرشی پرۆلیتاری و دواتریش که حوکمرانی حزبی شیوعی بەدواوە دێت تەنها کاریان ئەوەیە ئەو بەربەست و کۆستپانە لابدەن که سەرمایەداری و رژێمی ئیمپریالیزمی لەبەردەم مێژوویان داناوە.

باشە، ئەگەر رێرەوی حەتمی مێژوو بەرەو سۆسیالیزم و شیوعیەتە. دواتریش حزبی شیوعی دێته دەسەڵات هەموو ئەو بەربەستانە لا دەدات که لەسەر رێگای مێژوو دانراوە، ئەگەر ئەو رژێمە نوێیەی که شیوعیەکان دایانناوە نوێنەری زۆرینەیە و خزمەتیان دەکات، ئەوکاتە زۆرینەش لایەنگری ئەو رژێمەیە و بەبێ گومان پاڵپشتی دەکات، ئەی ئەو تەنگەتاویە چییە و بۆچی ئازادی تاکەکان کۆتوبەند دەکرێت، ئەو چەوساندنەوەیە دژی هەر شاعیرێکیشە که قەسیدەیەک بەپێی ویژدانی خۆی بنووسێت نەوەک ئەوەی که زدانۆڤ دەیەوێت موسیقارێک پارچە مۆسیقایەک دادەنێت گوێگر نازانێ که فیکەیەکی بەدەمەوە کاتێک لەهۆڵەکە دەردەکەوێت وەک ستالین کاتێک گوتی که بۆچوونی خۆی لەبارەی پارچەیەک مۆسیقا دەربڕی که موسیقارێکی سۆڤیەتی لەیەکێک لەهۆڵەکان ژەنی بووی. ئەی بۆ؟ ئەی بۆ؟

کاتێک ئەو قسانەمان دەکرد هاورێیان بەوە وەڵامیان دەدایەوە: یەکێتی سۆڤیەت بەچەندین وڵاتی ئیمپریالیزم و دوژمن دەورە دراوە، جا بۆیە ناتوانێ لەگەڵ گەلەکەی لێبوردە بێت و زۆر ئازادیان پێ بدات. بەڵام ئەی کاتێک چەندین حکومەتی شیوعی لەئەوروپای

ڕۆژهەڵات و چین دروست بوو بەمەش یەکێتی سۆڤیەت لەهەزاران میل لەدوژمنە ئیمپرالیستەکانی دوورکەوتەوە, بۆچی دەبینین توندڕەویی و تەنگ پێهەڵچنین هێشتا ماوە؟

مانای ئەوەیە کە شیوعیەت وەک نەخۆشیەکی سەخت دروست نابێت لەکۆمەڵگایەکی نەخۆش و دواکەوتوو نەبێت، ناشتوانێت داکۆکی لەشیوعیەت بکرێت بەشێوازەکانی تیرۆر وتۆقاندن نەبێت. زادانۆڤ کاتێک ڕەخنە لەژنە شاعیرێکی سۆڤیەتی دەگرێت کە خۆی وەک گۆمێکی پەنگخوارد داناوە کە بە مێش و مەگەز بەسەروەیە، زادانۆڤ دەڵێ "هیچ گۆماوێک لەوڵاتەکەمان نەماوە دوای ئەو هەڵمەتە تەندروستیەی کە ڕژێمی کۆمۆنیزمی پێی هەڵساوە. ئەی ئەو شاعیرە ژنە ئەو وێنەیەی لەکوێ هێناوە؟"

ئەوان وەها بیردەکەنەوە، وا حسێب بۆ مرۆڤ دەکەن کە ناتوانێ بێزار و دڵتەنگ بێت تەنها لەوکاتەی کە برسی و ڕووت بێ. ئەی چی لەبارەی ئەو چیرۆکەوە دەڵێن کە یەکێک لەچیرۆکەکانی ئەفریقیای عەرەبی:

سوڵتانێک هەبوو، موڵک و سامان و دەسەڵاتی زۆر بوو کە چی بویستایە بۆی دەکرا، سەرەڕای ئەمانە دڵتەنگ بوون, حەکیم و لوقمانەکانی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکردن، ئەوانیش پێشنیاریان بۆ کرد کە نامەیەک بۆ والییەکانی بنوسێ لە هەموو وڵات داوایان لێبکات کە بەدوای ئاسوودەترین مرۆڤ. کاتێک دۆزیانەوە سوڵتان جلوبەرگە سولتانییەکەی دەکەنێ و جلی ئەو پیاوە ئاسوودییە بپۆشێت. یەکێک لەوالییەکان ئاسودەترین مرۆڤی دۆزییەوە و هێنایە کۆشک دواتر

سوڵتان بۆلای چوو بۆ ئەوەی لەباوەشی بگرێت و دواتر جلەکانی دابکەنێ. کەچی بۆی دەرکەوت کە ئاسودەترین مرۆڤ لەدونیا جلی لەبەرنییە.

لەوکاتەدا رووداوی ئاشکراو رووداوی ئابڕۆچوونەکەی بیریای وەزیری ناوخۆی یەکێتی سۆڤیەت روویدا کە جێگری سەرۆک وەزیران و سەرۆکی پۆلیسی سیاسیش بوو، سەرەڕای ئەمەش ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی بەڵشەفی بوو کە ئەو مەکتەبی سیاسیە گەورەترین ئەنجومەنی سەرۆکایەتییە. بیریا بەخیانەت و سیخوریکردن بۆ ئیمپریالیزم تۆمەتبار کرا، بەڵکو شیوعیەکان بەفەرمی گوتیان ئەو سیخورێکی کۆنە، درۆ و دەلەسەی وایان لەبارەوە بڵاوکردەوە گوایە هەر لەتەمەنی شانزە ساڵی لەخزمەتی ئیمپریالیزم دابووە ئەوکاتەی هێزەکانی بەریتانیا بەسەرۆکایەتی چەرچڵ دیلیان کردووە ئەمەش دوای هەڵگیرسانی شۆرشی بەلشەفی بووە.

لەگەڵ برادەرێک دەمانخواردەوە و مشتومرێک لەنێوانمان روویدا، پێم وت من پرسیارێکت لێدەکەم، وەڵام بدەوە و بیر لەوە بکەوە کە دەیڵێم، بیریا وەرگەرەز یان سیخورە وەک گوترا و تۆمەتبار کرا و لەسێدارەدارە، یان بێ تاوانە؟ ئایا دەکرێت لەنێوان سیخور و بێتاوان بێت؟ هەڵبەتە نابێت. ئەگەر بەدرێژایی چڵ ساڵ سیخوڕ بێت وەک دەزانین ئەو سەرۆکی پۆلیسی سیاسیش بوو گیانی خەڵکی بەدەستەوە بوو. ئەوا چەند بێگوناە بوونەتە قوربانی ئەو سیخورە. هەزاران بێگوناە لە بەلشەفیە دڵسۆزەکان کە خەبات و تێکۆشانیان

کردبوو ئەشکەنجەیان بینی، بوونە قوربانی ئەو سیخورە ناپاکە، هیچ شتێک سوودی بۆیان نابێت کە تازە بەهایان بۆ بگێردرێتەوە؟

ئەگەر رژێم رێگە بدات بەهاتنی سیخور و سەرچڵەکان بۆ ناو دەسەلات. ئایا یەکێک لەوان لەتوانای دانییە دیسان بگاتەوە بەرزترین پۆست و بیریایەکی تر بێت، سەرلەنوێ هەزاران بێگوناە لەسێدارە بدات؟

ئەگەر بێتاوانیشە، ئەی ئەوە چ رژێمێکە کە ناتوانێت ئاسایشێک بۆ بیریا بەرقەرار بکات, ئەو بیریایەی کە شیوعیەکی خەباتیگر بوو بۆ ماوەی چل ساڵ. ئایا ئەو رژێمە خۆشی پێدەپارێزرێت؟

ئەو هاورێ شیوعیە رۆژی دواتر هات و بەرووی منەوە بەتورەیی هاواری کرد: بەنەفرەت بی نەتهێشت شەوی رابردوو بنووم, ئەو شەوە هەموو بەوە بەسەربردووە کە بیر لە بیریا بکەمەوە کە ئاخۆ بیریا سیخورە یان بێتاوان، ئەگەر سیخور بێت وەها و ئەگەریش بێتاوان بێت وەها و وەها، بەڵام ئەو هاورێ شیوعیە هەستکردنی بۆ کەرامەتی مرۆڤ و دادپەروەری نەبوو کە بتوانێت لەدژی شیوعیەت هەڵبچێ و یاخی بێت.

داوای ئەو هاورێیە لەژیان لەکچێکی جوان و چارەگە عەرەقێکی مەستەکی زیاتر نییە، شیوعیەتیش ئەم دووانەی بۆ دابین کردووە، جا چی داوە لەدادپەوەروی و مرۆڤایەتی و کەرامەت و ویژدان، بەنەفرەتیان دەکات.

شیوعیەکان لەمن بێئومێد نەبوون تا ئەو زنجیرە وتارەم بڵاونەکردەوە بەناوی "من شیوعی بووم". تەنانەت دوای بڵاوبوونەوەی دوو، سێ وتاریش لەو زنجیرەیە بێئومێد نەببوون، ناوبژیوانێکیان ناردە لام کە ئامۆژگاری دەکردم واز لەبڵاوکردنەوەی ئەو وتارانە بهێنم. هەرچەندە بیروەریەکانم بەو وتارە کۆتایی دێت، بەڵام واز لەدژاییەتی ئەوان ناهێنم. رەخنە لەسەر کتێب و دیوانە شیوعیەت دەگرم، کتێب تایبەت دەکەم بەدژایەتیان، وێنەی هێلکاری هەندێک لەشیوعیەکان بڵاودەکەمەوە، با هاورێیان دڵخۆش نەبن بەوەی یاداشتەکەم کۆتایی هات و ئەوانیش ئاسوودە دەبن. بە نیازی دیدار.

## ئەلقەی سی و نۆ

ژمارە: ١٥١٩

ڕێکەوتی : ١٦ تشرینی دووەم ١٩٥٩

قسەکردن لە بارەی تیتۆ

بەبڕوای من و بڕوای زۆر کەسی دیکەیش تیتۆ چاکترین شیوعی جیهانەو حزبی شیوعی یوگسلاڤیش چاکترین حزبی شیوعییەو لەهەموویان پاکتر و دڵسۆزترە. سەرەڕای ئەمەش ڕێبەری شیوعی یوگسلاڤی ملیۆڤان گیلاس لەتیتۆ و ڕژێمە شیوعیەکەی یاخی بوو، کاتی تێبینی کرد چینێک دروست دەبێت و ناوی نا چینی نوێ, منیش ناوی دەنێم چینی بۆرژوازییەتی شیوعی. ئەو چینە نوێیە یان بۆرژوازیەتی شیوعی لەتوێژێکی دیاریکراوی ئەندامانی حزبی شیوعی پێک دێت لەهەر وڵاتێک کە حزبی شیوعی تێیدا حوکمڕانی بکات, ئەو توێژەش لەئەندامان بەرزترین و گرنگترین پۆستی حکومەت بەدەست دەهێنن، بەهۆکاری ئەو پۆستانەش دەتوانن مەزنترین موچە بەدەست بهێنن لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی ئەو موڵکانەی کە لەخاوەنەکانیان وەرگیراوەتەوەو بۆتە موڵکی دەوڵەت. سەرەڕای ئەمەش لەڤێلای مەزن دەژین و چێژ لە ژنە جوانەکانیان وەردەگرن.

شیوعییەکانی عێراقمان بینی، یان سەرکردەکانی ئەوانمان بینی. لەگەڵ ئەوەی کە عێراق وڵاتێکی شیوعی نییەو حزبی شیوعیش لەدەسەڵات بەشدار نییە.

دەڵێم: سەرکردەکانی حزبی شیوعی عێراقیمان بنی کە باڵاخانەی گەورە دەکڕن، کە نرخی یەک باڵەخانە دەگاتە ٧٠ هەزار دینار،

سەرکردەکانی شیوعیمان بینی کە ژن دەهێنن و هەزاران دینار لەژنەکانیان خەرج دەکەن، هەروەها بینیمان ئەو ئۆتۆمبیلە چاکانەیان هەیە کە لەجۆرە مۆسکۆڤیچی سوڤیەتی نییە، بەڵکو لەجۆری ئیستی بیکەر و کادیلاکی ئەمریکیە. ئەوەشمان بینی کە گەورەترین و چاکترین وەزیفەیان بەدەستهێناوە کە ئەوان شیاوی نین تەنها لەبەر ئەوە کە دڵسۆزی حزبی بەکرێگیراون.

گیلاسیشبینی ئەو بۆرژوازیەتەی شیوعی لەیوگسلاڤیا لەژێر سێبەری مارشال تیتۆ گەشە دەکات، جا خوا بەهانای گەلانی وڵاتانی شیوعییەوە بێت.

لەوانەیە بەسود بێت کە بەو بۆنەیەوە تۆزێک باس لەو ناکۆکیە بکەم کە لەنێوان حزبی شیوعی روسی و لەدوای ئەویشەوە هەموو حزبە شیوعە بەکرێگیراوەکانی لەلایەک و لەلاکەی دیکەش حزبی لەگەڵ تیتۆ و حزبی شیوعی یوگسلاڤی و گەلی یوگسلاڤیاوە دروست بوو.

تیتۆ بەر لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٤٨ یەکێک بوو لەگەورەترین رێبەرەکانی شیوعی لەدونیادا، پاڵەوانێک لەو پاڵەوانانەی کە خەبات دەکەن لەپێناو- نیشتمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیار- ئەو کات شیوعییەکانی عێراق نامیلکەیەکیان وەرگێرابووە سەر زمانی عەرەبی و بڵاویان کردبۆوە کە لەبارەی ژیانی تیتۆ بوو، ئەو کات ئێمەی شیوعی لەدڵمان ئەزبەرمار کردبوو، سەرەڕای تێپەربوونی ١٢ ساڵ پتر بەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە هێشتا ئەو قەسیدەیەم لەبیر ماوە کە لەو نامیلکەیەدا هاتبوو، کە لەلایەن شاعیرێکی یۆنانیەوە لەبارەی تیتۆوە نووسرابوو:

تیتۆ.. تیتۆ کێیە؟

گتسابۆ دەپرسێ: تیتۆ کێیە؟

دوژمن دەپرسیٚ: تیتۆ کێیە؟

وەڵام دەدەینەوە: هەموومان تیتۆین.

تیۆ رووبار و تیتۆ دەشتە و تیتۆ چیایە.

تیتۆ گەل، کریکار و جووتیارە

لە ئاڵاکانتان بپرسن کە بە گوللە کونکراوە

ئەو لیستەی کە ناوی کوژراو و بریندارەکانی ئێوەی تێدایە

بە خەباتی تیتۆ تۆمارکراوە...هتد.

سۆڤیەت بڕیاری هەڵوەشانەوەی کومنترنی دا، کە چالاکی حزبە شیوعییەکانی دونیای ئاراستە دەکرد، هەڵوەشانەوەشی پەیوەندی بەهاوپەیمانێتیە هەبوو لەگەڵ بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا لەجەنگی دژی هیتلەر ئەنجام درابوو، کاتێک ژەنەڕاڵ مارشال وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پرۆژەکەی پێشنیار کرد کە هەر بەناوی ئەویشەوە ناونرا ئەمە لەساڵی ١٩٤٧ بوو، وەک خوێنەر دەزانیٚ پرۆژەکە بۆ بوژاندنەوەی ئەوروپا بوو، روسیاش وەڵامی ئەو هەنگاوەی دایەوە بە دامەزراندنی مەکتەبی ئیعلامی شیوعی یان کۆمنفۆرم، ئەو ناوە بۆ ریٚ ونکردن بوو، چونکە کاری ئەو مەکتەبە تەنها کۆکردنەوە و پێدانی زانیاری نەبوو، بەڵکو مەبەستەکە ئەوەبوو کە خۆی لەبەیاننامەکەی دیاریکردووە کە هاتووە: گۆڕینەوەی زانیاری لەنێوان حزبە شیوعییەکان و لەحاڵەتی پێویستیش هەمەهانگی چالاکییەکان دەبێت. لەو بەیاننامەیەش هاتبوو کە نەبوونی

راهێڵی پەیوەندی لە نێوان حزبە شیوعییەکان ئەمە بەربەستێکی مەترسیدارە بۆ هەڵویست وەرگرتن.

حزبی شیوعی روسی بەهۆی سوپای سورەوە کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەوروپای رزگار کردبوو چەندین حکومەتی لەو وڵاتانە دروست کرد کە ملکەچی خۆی بوو، بەڵگەیەک بۆ ئەو ملکەچییە ژەنەراڵێکی سۆڤیەتی مالینۆفسکی بوو کە بووە وەزیری بەرگری. ئەرێ وەڵڵا بووە وەزیری بەرگری لەحکومەتی پۆلەندی.

تیتۆ یەکێک نەبوو لەوانەی کە بە رمی سوپای سور هاتبێتە سەردەسەڵات. ئەو خەبات و تێکۆشانی کردبوو، جەنگی پارتیزانی کردبوو لەدژی نازییەکان تا سەرکەوتنی بەدەست هێناو حکومەتێکی لەحزبی شیوعیەوە پێکهێنا.

مەبەستی حزبی شیوعی روسی لەدەستبەسەرداگرتنی ئەو وڵاتانەی ئەوروپای رۆژهەڵات ئەوەبوو کە بیانکات بە کارگەیەک بۆ ئەوەی بەهەرزانترین نرخ ئەو کەلوپەلانەیان پێ بدات کە لە ئامادەکاریە گەورەکەیاندا شیوعییەکان پێویستیان پێبوو. ئەو مەبەستەشیان لەپەنای دەمامکی ئاشتی و پێکەوەژیانی ئاشتیانە حەشار دابوو. دەشیویست وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات و یوگسلاڤیا بەپلەی یەکەم بایەخ بە پیشەسازی قورس بدەن. تیتۆ کە دڵسۆزی گەلەکەی بوو بینی کە گەلەکەی ساڵانێکی زۆر برسێتی و هەژاریی و نەداریی بینیوە، ئەو گەلە پێویستی بە کارگەیەکە قوماشێک بەرهەم بێنێت تا بیپۆشێت، پێویستی بە کێکە تا بیخوات، نەوەک پێیوستی بە بەرهەمهێنانی سەدان تەن ئاسن بێت بۆ ئەوەی بەنرخەکەی خۆی بەشیوعییەکانی بفرۆشێتەوە.

ئەو کە کوڕی یوگسلاڤیایە دەبینی و چاکتر دەزانێ لەوە تێدەگاو دەزانێ کە گەلەکەی پێویستی بە چییە. نەوەک ستالین لەکرملین دانیشتووە. شیوعییەکانی روس چەندین جوڵانەوەیان لەناو یوگسلاڤیا ڕێکخست بۆ ئەوەی تیتۆ ناچار بکەن گوێڕایەلی فەرمانەکانی نیشتیمانی دایک بێت، بەڵام ئەو بەرگری کردو بەرەنگاری بووەوە، ئەو مامەڵە ئابووریەی کە شیوعییەکانی روسیا کاریان پێدەکرد، بەلای ئەو پەسەند نەبوو.

ئەوەندە بەسە ئاماژە بەوە بکەین کە ژەنەرال ئوتمار کریگینگ سەرۆکی فەرماندەی سیاسی لەسوپای یوگسلاڤی وتویەتی کە ئەو لۆجیستیکە سەربازیەی کە یوگسلاڤیا لەدوای جەنگ لەروسیای وەرگرتووە، هەموویان کۆن و بەکارهاتوو بوون، بۆیە کراونەتەوە، کەچی یوگسلاڤییەکان پارەیان بۆ کەلوپەلی نوێ داوە. هەروەها ئەو مادده تەقینەوانەی کە لە رووسیا هاوردەکراوە هەموویان بێکەڵک بوون, بۆیە زۆربەیان لەناوبردراون.

شیوعییەکان رقلێبوونەوەیان لەو شیوعیە یاخیبووە گەیشتە ئەوپەڕی کاتێک تیتۆ لەساڵی ١٩٤٨ لەبەیاننامەیەکدا دوو وەزیری گرنگی یوگسلاڤی لەپۆستەکەیان دەرکرد ئەویش وەزیری رووناکی و وەزیری دارایی بوو، هەرچەندە بەتۆمەتی لادان دەریکردبوون, بەڵام تۆمەتی راستەقینە ئەوە بوو کە ئەوان جاسووسیان بۆ حزبی شیوعی رووسی کردبوو.

حزب دەیەوست لەڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازی یوگسلاڤیا بەکاربهێنێت, بەڵام رووبەڕووی ئەو شیوعیە بووەوە, کە بەرژەوەندی گەلەکەی لەسەرووی هەموو بەرژوەندییەکانی دیکەوە دادەنێت. سیمایەکی دیکەی هەڵپەرستی ئابووری لەو پێشنیارەی شیوعییەکانی روسیا دایە کە لەبارەی نەوتەوە بەیوگسلاڤیایان داوە، رێکەوتنێکیان

بەحکومەتی یوگسلاڤی دابوو داواشیان کردبوو ئیمزای بکات, لەو ڕێکەوتنە نووسراوە کە نەوت بەهای نییە, چونکە سەرچاوەیەکی سروشتیە.. ئەرێ بەخوا. ئەمەیان لەرێکەوتنەکە نوسیبوو، لەسەر یوگسلاڤیاش پێویستە لەئەنجامی بەشداربوونی لەسەرمایەی ئەو کۆمپانیا تێکەڵ، کرێکار و مادە و سەرمایە و کەرەستەی دیکەی بونیادنان بدات. لەبەرامبەر ئەمەشدا شیوعیەکانی روسیا تەکنیکار و کارگێڕییەکان دابین دەکات، ئەوانیش مافی ئەوەیان هەیە پێداویستەکانیان لەنەوت بەدەست بهێنن بێ هیچ باج و رسوماتێک لەوانە رسوماتی گواستنەوە و هەناردە کردن، جا ئەو نەوتەی دەمێنێتەوە بۆ یوگسلاڤیایە. ئەوان توانیبوویان دەسەڵاتیان بەسەر تەواوی بوارەکانی ئابووری وڵاتانی رۆژهەلاتی ئەوروپا فەرز بکەن, بەهۆی ئەو کۆمپانیا تێکەڵانەوە لەپشکداری، بەڵام چاوچنۆکی ئەوان لەیوگسلاڤیا بەر نیشتمانپەروەری تیتۆ کەوت, کە رێز لەخۆی و حزب و وڵاتەکەی دەگرێت.

بەمشێوەیە بڕیاری دەرکردنی تیتۆ لە کۆمنفۆرم لە ٢٨/حزیران/١٩٤٨ درا. جا زورنای پروپاگەندەی شیوعی هێرشی دەکردە سەرو بەلادەر تۆمەتبارییان دەکرد .

تیتۆ توانی درەفەتێک بداتە حزبە شیوعییەکان کە خۆیان لەمەترسیترین تۆمەت نەجات بدەن، کە ئەویش تۆمەتێکی راستە کە رووبەڕوویان دەکرێتەوە, کە دەگوترێت ئەوان بەکرێگیراوی شیوعییەکانی روسیان و بەرژەوەندی ئەوان لەسەرووی بەرژەوەندی وڵات و گەلەکەیان دادەنێت و فەرمانی چییان پێ بکرێت ئەنجامی دەدەن. تیتۆ سەلماندی کە تۆ دەتوانی شیوعی بی و لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەڵی ئەو فەرمانانە نەبیت کە لەدەرەوە دێن. بەڵام بەکرێگیراو سروشتەکەی وایە کە هیچ رێزێکیان بۆخۆیان و گەل و

نیشتمیانەکەیان نییە، بۆیەش بەشداری لەهەڵمەتی دژ بەنیشتیمان دەکەن، وەک بۆق دەقۆرێنن کاتێک بۆقە گەورەکە قۆڕاندی.

نەریتی ئەو شانە شیوعیەمان لەو گوندە دوورە دەستەی ئەبو خەسیب لەبەسرا ئەوە بوو, کە هەفتەی جارێک دانیشتنێکی خواردنەوەمان ئەنجام دەدا، ئەو شوێنەی کە لێی دادەنیشتین یەکێک لەبێستانەکان بوو کە حەمەدی ئەندامی حزبمان تێدا وەک جووتیار کاری دەکرد. لەو دانیشتنەی مەینۆشین هەموو کاروبارەکانی حزب و رۆشنبیری مارکسیەت باس دەکرا، هەر یەکەمان بای لەهیوا و حەزەکانی خۆی دەکرد. ئەو جووتیارە هیوای ئەوەی دەخواست کە خاوەنی زەوییەکەی بکوژێت و دەست بەسەر بیستانەکەی دابگرێت و ماڵەکەی بدزێت، کاتێکیش دەستگیرکرا، لەزیندانی ژنان دەستگیر بکرێت و زیندانیە ژنەکان دەوری بدەن. ئەو سەرتاشەش هیوای ئەوەی دەخواست کە ئەگەر فلان و فلان لەگەورە فەرمانبەران و موڵکدارەکان هاتنە لای بۆ سەرتاشین ئەوا بە مووس بێبەزەییانە سەریان ببڕێت. ئەو چاوخێلەش هیوای ئەوەی دەخواست کە ئەگەر بێت و دەسەڵات بەسەر دوژمنەکانی چینایەتی زاڵ بکات, ئەوا چاویان دەردەهێنێت. قوتابیەکی فاشیلیش ئەگەر پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواو بکات هیوای ئەوەی هەیە ببێتە شاعیر و تورە لەشەوقی و عەلی مەحمود تەها و عومەر ئەبو ریشە و شاعیرە رەجعیەکانی دیکە هەڵبدات. ئەو فارسە بەعەرەبکراوەیش هیوای ئەوەی هەیە کە قەدەر بۆی رێکبخات ژنی ئەو کەسانە بهێنێت کە شانازی بە رەچەڵەکی

عەرەبی دەکەن، بۆ ئەوەی رۆڵەی بەرەچەلەک فارسی هەبێت, ئەگەرچی بەعەرەبیش هەژمار بکرێت.

هەرچەندە حزبی شیوعی گوایە لەگەڵ سەرخۆشی و لاتبوون و بەدرەوشتی نییە بەئاشکرا. بەڵام ئێمە کێشەیەکمان لەوە نەدەدۆزیەوە کە بەئاشکرا عەرەق بخۆینەوە لەو گوندەی کە موحافزکار و موسڵمانن و رووبەرووی دابونەریت و ئایین و پیرەکانیان دەبووینەوە، زۆرن ئەوانەی کە پەیوەندیان بەحزبی شیوعیەوە نییە، تەنها وەک لاساریییەک بەدژی کەسێک یان جەماعەتێک یان لەبەر بیرۆکەکەیەک کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە دەبنە شیوعی.

ئەوەیان دەبێتە شیوعی بۆ ئەوەی رووبەرووی دراوسێیەکەی یان کەسێکی نزیک یان دوژمنێکی بێتەوە، ئەویتریان دەبێتە شیوعی لەدژی باوکە نوێژکەر وبەرۆژووەکەی کە باوەڕی بەخودایە، ئەویتری لەدژی دراوسێیە عەرەبەکەی چونکە بە فارسبوون عەیبداری کردووە، ئەوەیان لەدژی ئەو کەسەی کەچاوێکی لەدەست نەداوەو کەچی گاڵتەی بەخێلبوون کردووە، یان بۆتە شیوعی لەبەرئەوەی بێ دەسەلاتە هۆکارێکی نییە تۆڵەی لەو کەسانەی بکاتەوە کە ستەمیان لێکردووە, بۆیە بۆتە شیوعی.

شتە سەرەییەکانی کە فێری هاورێیانی جووتیار و زەحمەتکێشمان دەکرد، ئەوەبوو کە جووتیار برای جووتیارەو زەحمەتکێش برای زەحمەتکێشە، ئەو خێزانە دەوڵەمەندانەش کە خۆیان بە خێزانە شەرفەمەندەکان ناودەبەن, ئەوان بەڕاستی کرۆکی بەدروشەی و دارمان و نەنگین، چونکە شەریف ئەوەیە کە بەدەستی خۆی کار دەکات نەک وەک ئەو بێباکەی کە لەسەر کورسی چایخانە شەو و رۆژ دەکاتەوەو لەسەر رەنج و ماندووبوونی جووتیار دەژی.

ئێوارەیەکیان کاتێک بەدەوری پێکەکانی مەی کۆبووینەوە، یەکێک لەئێمە گوتی بینیویەتی لەڕووبار بەلەمێکی بینیوە کە بەرەو گوندەکەی ئێمە دێ و فلانی تێدا بووە کە لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەندە و ئافرەتێکی جوانی تێدابووە، کە ئەویش فلانە لەماڵی ئەو کوڕە کارەکەرە، یەکێکی دیکەیش گوتی ئەو فلان و فیساری بنیوە کە ئەوانیش لەهەمان خێزانن بەرەو گوند و بەرەو ئەو بێستانە دەچوون کە موڵکی خۆیانە و بۆ ئەوەی لەکەنداوی عەرەب بەو سەرنیشنی بەلەمەکە بگەن، ئەوانیش ئەمەش بەخواردنەوە و رابواردن بەسەر دەبەن، حەمەد گوتی ئەرکی ئێمەیە ئێمەی زەحمەتکێش تۆڵە لەو دەرەبەگ و بۆرژوازانە بکەینەوەو کارەکەرە جوانەکەشیان لێ بستێنین، چاکتر وایە بۆ ئێمەی زەحمەتکێش و شیوعی بێت کە ئێمەی داکۆکی لەچینەکەی ئەو ژنە دەکەین.

بیرۆکەکەمان پەسەند کرد، مەی خواردنەوەش پلانی هێرشەکەی بۆ هەڵدەبەستین کە چۆن هێرش بکەین سەر ئەو بۆرژوازە زۆلانە کە هاتوون هەتکی شەرەفی زەحمەتکێشان بکەن، لەبەر چاوی ئێمەی سەر بەحزبی زەحمەتکێش و حزبی پێشرەوی هۆشیار.

جلەکانمان لەبەر کردەوە، تەنها بەدەرپێی کورت ماینەوە، جۆرەها چەکمان هەڵگرت. ئەویان داسێک ئەویتر بێڵێک و ئەویتر تەورێک یان دارعەسایەک، تەنها حەمەد نەبێت کە تفەنگێکی پێبوو خۆی لەبۆری ئاوی دروست کردبوو، بۆریەکەی پڕدەکرد لەیاروت و لەدواوەشی بەلاستیکێکەوە بەزمارێک بەسترابووە کاتێک بزمارەکە بەر باروتەکە دەکەوت دەتەقی. کردمانە هۆسە وەک ئەو هۆسەیەی کە گوێبست بووین لەرۆژانی مۆتەکەی سووردا، حەمەد جۆش گرتبووی تفەنگەکەی تەقاند بێ ئاگا لەوەی بارودی دیکەی نییە.

بەرەو کەنداوی عەرەب رۆیشتین تا لەوە نزیکبووینەوە کە گوێمان لەقاقای پێکەنینی گەنجەکان بوون, حەمەد بە ئازایەتیەکەوە چووە پێش ئەگەر مەی نەبووایە ئەو ئازایەتیەی نەدەبوو، هاواری کرد: خاوەن بەلەمن سەرنشینەکانی ئەو بەلەمە جوانە بەسراییە وەڵامیان داوە: بەڵێ.. حەمەد بەتوڕەیی وتی: بەڵێ بەڵێ خوایە مەزنایەتی تۆ. ئایا نازانی ئێمە پۆلیسین هەرچەندە جلی مەندەنیشیمان لەبەردایە. هەواڵی ئەوەمان بۆ هاتووە کە بەلەمێکی پڕ لەچەکی قاچاغ لەو کاتەدا بە کەنداوی عەرەب تێدەپەڕێت، هەر ئەمشەو.. کێ ناڵێ ئێوە ئەو قاچاغچییانە نین. گەنجەکان بەترسەوە وەڵامیان دایەوە: نا بەخوا مامە. ئێمە لەخێزانی فلانین و بەلەمەکەشمان لەنزیک بێستانەکەی خۆمان کەنارگیر کردووە.

لەوکاتەدا لەهەقیقەتدا کارەکتەری جووتیار لەدەروونی حەمەد دا بەسەر کارەکتەری شیوعی یان کارەکتەری ئەندامی حزبی شیوعی زاڵ بوو. بۆیە بەشەرمەزارییەوە گوتی: کەوابێ ئێوە رۆڵەی فلانە خێزانن, ئێوە تاجی سەرمانن، ئێمەی پۆلیس لەخزمەتی ئێوەداین. ئێمەش بەفاشیلی گەڕاینەوە.

کاتی خۆی راپۆرتێکمان بۆ لیژنەی مەحەلی حزبی شیوعی نووسیبوو لەبەسرا، موژدەی ئەوەمان دابوو کە ئێمە ژمارەیەکی زۆری جووتیارانمان هێناوەتە ریزەکانی حزبەوە، لەوانیشەوە نامەی سوپاس و هاندانمان پێگەیشت، بەڵام لەڕاستیدا ئێمە هیچ جووتیارێکمان لەوانەی کە ئەندامی حزبی شیوعی بوو بەشیوعیەت رازی نەکردبوو. بۆچی؟ چونکە جووتیار بەبیرکردنەوە و بە دەروون و بەبیروباوەڕەکانیەوە مەحاڵە فەلسەفەی مادی دیالیکتیکی قبوڵ بکات، کەسی شیوعیش نابێتە شیوعی ئەگەر لەو فەلسەفەیە تێنەگات و پێی رازی نەبێت و باوەڕی پێنەبێت.

دەیان یان سەدان کەس لەوانەی لەخۆپیشاندانەکانی شیوعیدا چەپڵە لێدەدەن و سەما دەکەن و گۆرانی دەڵێن و هوتاف دەکێشن، هەرگیز شیوعی نین، تەنانەت زۆربەی ئەندامانی حزبی شیوعی عێراقی شیوعی نین، هەر ئەمەش وادەکات کە حزبی شیوعی عێراقی هانی جەماعەتەکانی بدات تاوانەکانی کوشتن و راکێشانی لاشە و سوتاندن ئەنجام بدەن.. کاتێک بەو کارانەش هەڵدەستن کە حزب هانیان دەدات چارەنووسیان بە چارەنوسی حزب و بزووتنەوەی شیوعیەت دەبەستێریتەوە، بەپەیوەندی تاوان وایان لێدەکات کە چارەنووسی حزبی بەکرێگراو و بزووتنەوەی ئاژاوەگێڕی ببەستریتەوەو پێیەوە بەندبن. ئەگەر بزووتنەوەی شیوعی تووشی نسکۆ بوو ئەوا دەچنە دادگاکان و حوکمەکەشیان لەسەر ئەو کارەیان لەسێدارەدان کەمتر نابێت، ئەگەریش بزووتنەوەی شیوعیەت سەرکەوت و رەوتەکەی بەرەو هەڵکشان چوو ئەوا لەسەر ئەو تاوانانە لێپێچینەوەیان لەگەڵ ناکرێت و تەنانەت رێگایان لەبەردەم والا دەبێت کە تاوانی زیاتر ئەنجام بدەن، زۆرینەی ئەوانەی تاوانەکانی کوشتن و بڕین و دەستدرێژیان ئەنجام دان ئەندامانی حزبی شیوعی نەبوون، بەلام حزبی بەکرێگراو لەئەندامەکانی پڕ سوود لەوانە دەبینێت، ئەوانە لەلایەک فرمان و داخوازییەکانی حزب جێبەجێ دەکەن، لەلایەکی دیکەیش حزب دەتوانێ بێگومانی خۆی لەو تاوانانە بسەلمێنێت، بەوەی کە ئەوانەی تاوانەکانیان ئەنجام داوە ئەندامانی حزبن نین، وەک ئەوەی هیچ نادۆڕێنی ئەگەر ئەوان لەسێدارەش بدرێن یان دەستگیر بکرێن، چونکە ئەندامی حزب نین.

ئەی رۆڵەکانی نیشتیمان ریزەکانی خۆتان یەکبخەن، خوا لەسەرکەوتن پاڵپشتان دەبێت بەوەی رێگری لەحزبی بەکرێگیراو بگرن، کە نەتوانی چارەنووسی سەدان کەس بە تاوان بەچارەنووسی خۆی گرێ بدات، ئەوان بۆ ئەوەی دەڕۆن و بۆ ئەوە خەبات دەکەن

که ڕەوتی شیوعیەت بەهێز بکەن، مەبەستیان بەرگریکردن نییە لێی بەڵکو مەبەستیان بەرگریکردنە لەخۆیان کە چارەنووسیان بەندە بەتاوان و چارەنوسە شوومەکەی.

ناپـاك! بەوشـێوەیە خزمەتـی شـۆرش دەکەیـت. تـۆ دڵـت پـڕ لەبەزەییـە. هەسـت ناسـکیت. بـەڵام مـن وا نیـم، ئەگـەر هـەزاران پاشـەبەرە و منـداڵان لەبەردەمـم ریـز بکەیـت و پێـم بڵێیـت دەبێـت لەپێنـاو شـۆرش هەموویـان بکوژیـت، بـە تفەنگەکـەم هەمویان دەکوژم.